

زنجیرا تێگەهشتنەکا باشتر (108)

مەوسووعەیا ئیعجازا زانستی د قورئانێ و سوننەتێدا 2

# نیشانێن خودێ د مرۆڤیدا





د.محمد راتب النابلسی

وەرگێران: سیف الدین ئیسماعیل

# نیشانێن ( ئایەتێن ) خودێ

# د مرۆڤیدا

مەوسووعەیا ئیعجازا زانستێن د قورئانێ و سوننەتێدا

# نیشانێن ( ئایەتێن ) خودێ
# د مرۆڤیدا

د. محمد راتب النابلسی

وەرگێڕان

سیف الدین ئیسماعیل

**ناڤێ پەرتۆکێ: نیشانێن خودێ د مرۆڤیدا**

**نڤیسەر: د. محمد راتب النابلسی**

**وەرگێران ژ زمانێ عەرەبی: سیف الدین اسماعیل**

**پێداچۆنا زمانی: محەمەد عیسا هرۆری**

**بەرگ: محەمەد حسێن**

**ژمارا سپاردنێ: (٢١/ ٢٦١٤/-D) سالا (٢٠٢١)**

**چاپا ئێکێ: ٢٠٢١ زایینی ١٤٤٢ مشەختی**

**تیراژ: (١٠٠٠) دانە**

# ناڤەرۆك

**بابەت** **بەرپەڕ**

## پشكا ئێكێ: مرۆڤ

## پشکا دووێ: زانستێ دەروونی یێ ئیسلامی



## پشکا سێیێ: نڤستن



## پشکا چارێ: نڤێژ

## پشکا پێنجێ: رۆژی



## پشکا شەشێ: دوگیانی و کۆرپەلە ( الجنین ) و ژدایکبوون

## پشكا حەفتێ: پەیكەرێ هەستی



## پشكا هەشتێ: مێشك

## پشکا نەهێ: هەر پێنج هەست



## پشکا دەهێ: دل و لوولەیێن خوینێ

## پشكا یازدێ: رژێن



## پشكا دوازدێ: كۆئەندامێ هەرسكرنێ ( حەلكرنا خوارنێ )



## پشكا سێزدێ: كۆئەندامێ هەناسێ

## پشکا چاردێ: کۆئەندامێ دەرهاڤێتنێ



## پشکا پازدێ: پیست و موی



## پشکا شازدێ: کۆئەندامێ بەرگرییێ

## پشکا هەڤدێ: نەخۆشی و نوژداری

# پشکا ئێکێ
# مرۆڤ

# ئەرێ ما گەردوون نە موعجیزەیە؟

تشتێن بەرنیاس و نەبەرنیاس، و تشتێن ل سەر هیبوویی و نەهیبوویی، و تشتێن ئەم دزانین کو د بەرئاقلن، و تشتێن وەکی هندەك مرۆڤ هزر دکەن کو نەبەرئاقلن، ئەڤە هەمی هەمبەر شیانێن خودێ وەکی ئێکن، چونکی فەرمانا خودێ: (کن فیکون)ـە، ئانکو هەبە دێ هەبیت، ئەرێ ما تو ئاخفتنا خودێ ناخوینی: (قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ) [الأنبياء:٦٩]، (ئانکو: مە گۆتە ئاگری: ئاگرۆ بۆ ئیبراهیمی سار ببە، و بۆ وی ببە سلامەتی).

ئاگر یێ ب سۆتن نابیت ئەگەر ب حەزکرنا خودێ نەبیت، ئەگەر خودێ حەز کر کو یێ ب سۆتن بیت دێ سۆتنێ کەت، و ئەگەر حەز نەکر یێ ب سۆتن نابیت، و ئاڤ یا شلە ب حەزکرنا خودێ، و ئەگەر خودێ حەز کر هشك و رەق بکەت دێ وەلێ هێت، بەرێ خۆ بدێ کا خودێ چ د گەل مووسا پێغەمبەری کر ﷺ: (قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ (٦١) قَالَ كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ (٦٢) فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانْفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ (٦٣)) [الشعراء]، (ئانکو: (دەمێ فیرعەون و لەشکەرێ خۆ د دویڤدا هاتین) هەڤالێت مووسایی گۆتن: بێ گۆمان ئەڤە گەهشتنە مە. مووسای گۆت: نەخێر.. ئەو ناگەهنە مە (نەترسن)، ب راستی خودایێ من یێ د گەل من، دێ رێکەکێ بۆ مە ڤەکەت و نیشا مە دەت).

گوپالێ خۆ ل دەریای بدە، ل وی دەمی دەریا بوو رێکەکا هشك، بۆچی خودێ بەروڤاژی وی سیستەمێ د سروشتیدا هەی دکەت؟ چونکی ئەگەر تە دیت ئەڤ تشتە ژ ئەنجامێ ئەگەرەکی یێ هاتی، و تە هزر کر ئەڤ ئەگەرە چێکەرێ ڤی تشتییە تو کەڤتییە د هەڤپشکییێدا، و تو نوزانی، ئافرێنەرێ تشتی خودێیە، و ئەڤ ئەگەرە د گەل ئەنجامی

دهێت، ئەڤەیە باوەرییا دورست، بەلێ ئەوێ سۆتن د ئاگریدا چێ کری خودێیە، و ئەوێ ڤەگوهاستنا گەلەك ب لەز ئافراندی ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی خودێیە، دەمێ چێکەرێ (خودایێ) دەمی و جهی ڤیا مەرجێن دەمی و جهی ژ کار بێخیت دێ ئەڤە روی دەت، ژ بەر ڤێ چەندێ ئیسرا و میعراج حوکمێ وێ وەکی حوکمێ هەر موعجیزەیەکا دییە یێن د قورئانا پیرۆزدا هاتین.

تشتەکێ دی، ئەو ژی تشتێن بەرنیاس (دیار) و نەبەرنیاس هەردو موعجیزەنە، ئەرێ ما تو بەرێ خۆ نادەیە چێلێ، ئەو شیری ددەتە تە؟ ئەگەر هەمی زانایێن کیمیایا ئەندامی د جیهانێدا کۆم ببن دا ژ رووەکێ کەسك شیری چێکەن کو بنیاتێ خوارنا مەیە نەشێن چێکەن، ئەرێ ما چێل نەموعجیزەیە؟ ئەرێ ما ئافراندنا مرۆڤی نەموعجیزەیە؟ ئەرێ ما شینبوون و گەشەبوونا رووەکی نەموعجیزەیە؟ ئەرێ ما هاتنا بارانان نەموعجیزەیە؟ و ئەم یێ د ناڤ ملیارەها موعجیزەیاندا و ئەم نوزانین، ئەرێ گەردوون نەموعجیزەیە؟

گەردوون موعجیزەیە، ئەڤ زارۆکێ ساڤا یێ ژ ئاڤەکا لاواز چێ بووی، ژ چپکەکا بچویك، ئەڤ چپکە (سپێرم) ب چاڤ نائێتە دیتن، و چارسەد ملیۆن (سپێرم) ژ زەلامی دەردکەڤن، و هەر ئێکێ ژ ڤان سەر و مایتوکۆندریا و کوری یێن هەین، و ئەڤە دلڤیت و دچیت، و ل سەرێ سپێرمێ کەرستەکێ هەی ب تیڤلەکێ رەق یێ پێچایە، ئەڤە دەمێ ب هێکێ دکەڤیت پەردا وێ ددرینیت، و ئەڤ کەرستە دبیتە هاریکار د حەلکرنا دیوارێ هێکێدا، و دچیتە د ناڤدا، دێ دابەش بیت بۆ گەلەك پشکان، و دێ بەر ب رەحمیڤە چیت، بێی قەبارێ وێ زێدە بیت، ئافراندنا مرۆڤی موعجیزەکە.

پشتی مرۆڤ دبیت سەد و چل ملیار خانەیێن هاریکار یێن د مێشکێ ویدا، و مرۆڤی دەمار و هەستی و دل و خوینبەر و هەردو سیە و مەعیدە و رویڤیك و بهیستن و دیتن و دو لێڤ و ئەزمان و ماسۆلکە و ئەندام و موی و پیست و کون و رژێنێن دوهنی و خوهدانێ یێن هەین، ئەڤ چێکرییێ بچویك موعجیزەیە، ژ بەر کو چێکرنا ڤی زارۆکی ژ ڤێ چپکێ (سپێرم) و هێکێ موعجیزەکە ژ مەزنترین موعجیزەیان.

رووەك، ئەڤ بەلگە، مەزنترین کارگەهـ ل سەر روییێ ئەردی ناگەهیتە ئاستێ ڤی بەلگی، ئەڤ بەلگە کارگەهەکا بێدەنگە، ئاڤێ و کانزای ژ ئاخێ وەردگریت، ڤێ ئاڤێ دبەتە سەرێ دارێ، ئەڤی بەلگی کەرستێ کەسك یێ تێدا، دووەم ئۆکسیدێ کاربوونی ژ هەوای وەردگریت، و فوتونێ ژ رۆژێ وەردگریت، و ژ خوییێن ئاسنی خاسلەتێن ناڤنجی ژێ وەردگریت، و کەرستێن ئەندامی چێ دکەت، ئەڤ کەرستێن ئەندامی ئەوە ڤورم و تا و چەق و رهـ و فێقی چێ دکەت.

کێ ئەڤە نیشادایە؟ چاوا خودێ ئەڤ سالۆخەتە کرینە د تۆڤکیدا؟ رووەك موعجیزەیە، گیانەوەر موعجیزەیە، ملیۆن جۆرێن ماسییان یێن د دەریایاندا هەین، نویترین ژمارە د کێشا نەهنگیدا دگەهیتە سەد و هەشتێ تەنان، و شیردانەکا وی دگەهیتە سێ سەد کیلۆیان، سێ شیردان د رۆژێدا دبنە نێزیکی تەنەکی، ئەڤە هندەك زانیاری بوون ل سەر نەهنگی.

و پێشی ب ڤەبارێ خۆ یێ بچویك، ئەوا خودێ بەحسێ وێ کری، دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا) [البقرة:٢٦]، ئانکو، ب راستی خودێ هەر مەتەلەکا بینیت شەرمێ ژێ ناکت، ڤێجا (ئەو مەتەل) پێشی بت ئان تشتەکێ ماستر و پێهەلتر بت، د پێشییێدا ئامویرێ راداری یێ هەی، و ئامویرێ حەلاندنا خوینێ، و ئامویرێ بێهۆشکرنێ، و ئامویرێ شیکارییێ، و ئەڤ پێشییە د هەر چرکەکێدا سەدان جاران پەرێن خۆ دلڤلڤینیت، و سێ دل یێن هەین، دلەکێ ناڤەندی، و د هەر پەرەکێ وێدا دلەك یێ هەی، و پێیێن وێ کێلبە (محاجم) یێن پێڤە دا بشێت خۆ ب جهێن حولیڤە بگریت، و کێلبە دا بشێت ل سەر پاناتییێن زڤر راوەستیت، (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا).

پێشی موعجیزەیە، پەز موعجیزەیە، چێل و مریشك موعجیزەنە، و ئافراندا مرۆڤی موعجیزەیە، جۆرێن فێقی و بەری موعجیزەنە، چاڤێ رۆژێ موعجیزەیە، سەد و پێنجی و شەش ملیۆن کیلۆمەترا ژ مە دویرە، و د گەل ڤێ دویراتییێ ئەم خۆ ل بەر

گەرم دکەین، و مفایی ژ رۆناهییا وێ وەردگرین، و ئەگەر عەرد بکەڤیتە د ناڤدا دێ د چرکەکێدا حەل بیت.

گەردوون هەمی موعجیزەیە، ئەرێ دێ ل بەر خودایێ مەزن یا ب زەحمەت بیت پێغەمبەری ﷺ ڤەگوهێزیت، و دویراتییا جهی و دەمی نەهێلیت؛ کو ژ مەکەهێ بۆ قودسێ، و ژ وێرێ ببەتە ئەسمانی؟ ئەگەر هوین ب کویراتیییێن گەردوونیدا بچنە خوار دێ بینن تشتێن دیار (بەرچاڤ) و نەدیار (نەبەرچاڤ) و یێن هاتینە زانین و یێن نەهاتینە زانین ل هەمبەر شیانێن خودێ وەکی ئێکن، و دێ بینن تشتێن دیار و نەدیار د بنیاتدا هەمی موعجیزەنە.

# لەشێ مرۆڤی

د ژيانا هەر ئێك ژ مەدا نيشانێن موعجيزە و گازيكەر يێن هەين كو بەلگەنە ل سەر مەزناهييا خودێ، ژ وان ژی لەشێ مەيە كو نێزيكترين تشتە بۆ مرۆڤی، د سەرێ هەر ئێكی ژ مەڕا نێزيكی سێ سەد هزار موی يێن هەين، و هەر موييەكی رها خۆ و خوينبەر و خوينهێنەر و ماسۆلكە و دەمار و رژێنا دوهنی و رژێنا رەنگی.

و د تۆرا چاڤيدا دەه تەخە يێن هەين، سەد و چل مليۆن پێشوازكارێن رۆناهييێ يێن تێدا، د ناڤبەرا خانەيێن چيلكەيی و قۆچەكی، و دەمارەكا ديتنێ ژ چاڤی دچيتە مێشكی كو پێنج سەد هزار رويشالێن دەماری يێن تێدا.

و د گوهيدا وەكی تۆرا چاڤييە، سيه هزار خانەيێن بهيستنێ يێن تێدا ژ بۆ ڤەگوهاستنا هويرترين دەنگان، و د مێشكيدا ئاموێرەكێ پيڤانا زێك ڤاڤێرتنا دەمی يێ هەی، ژ بۆ گەهاندنا دەنگی بۆ هەردو گوهان، و ئەڤ ڤەگوهازتنە كێمتر ژ هزار و شەش سەد پشكان ژ چركەكێ دگەهيت، و ئەڤە جهێ دەنگ ژێ دهێت بۆ مرۆڤی ديار دكەت.

و ل سەر پانكا ئەزمانی نەه هزار گرێكێن تامێ يێن هەين، بۆ زانينا تامێن شرين و ترش و تەعل و سوير، پاشی ڤێ تامێ دێ ڤەگوهێزيتە مێشكی.

و هەر پەيڤەكا زمان دبێژيت هەڤدە ماسۆلكە د پشكدارن د چێكرنا وێ پەيڤێدا.

كی باوەر دكەت كو پەردا ناڤخۆيا دەڤی پێنج سەد خانە يێن تێدا؟ هەر پێنج خۆلەكان نيڤ مليۆن خانە د ديوارێ ناڤا دەڤيدا دمرن، دا نيڤ مليۆن خانەيێن دی يێن نوی جهێ وان بگرن.

ئەگەر ئەم تەپكێن خوينێ يێن سۆر ب سەرێك ڤەكەين دێ درێژاهييا وان پتر بيت ژ هندێ كو شەش جاركی ل دۆر عەردی بزڤرن، و د هەر ملليمەترەكا سێ جايی د

خوینێدا پێنج ملیۆن تەپکێن سۆر یێن خوینێ یێن تێدا، و هەر تەپکەکا سۆرا خوینێ د ئێك رۆژدا هزار و پێنج سەد جاران د ناڤ خوینێدا دهێت و دچیت، کو دبنە هزار و سەد و پێنجی کیلۆمەتر.

و دل د ژییەکێ ناڤنجی یێ مرۆڤیدا هندی تژیکرنا مەزنترین ئاڤاهی ل جیهانێ خوینێ دهاڤێژیت، و د هەر خۆلەکەکێدا شێست هەتا هەشتێ لێدانانە، و د ئێك رۆژدا دبنە سەد هزار لێدان، کو دبنە هەشت هزار لتر، و هەر دوسەد لتر بەرمیلەکە! و هندەك زانایان ژمێریارییەك کر بۆ هاڤێتنا دلی یا خوینێ د ژییێ مرۆڤیدا بۆ وان دەرکەڤت پێنجی و شەش ملیۆن گالونان دهاڤێژیت، و هەر گالونەك پێنج لترە.

و مرۆڤ د هەر چرکەکێدا سەد و بیست ملیۆن خانەیان دمەزێخیت (ژ ناڤ دچن).

و د مێشکێ مرۆڤیدا چاردە ملیار خانەیێن کەڤشکی یێن تێدا، و چل ملیار خانەیێن هاریکار کو هێژ ب دورستی کارێ ڤان خانەیان د مێشکیدا نەهاتییە زانین، مێشکێ مرۆڤی ژ هەمی تشتێن دی یێن د لەشێ مرۆڤیدا ئالۆزترە، ئانکو مێشك ب خۆ یێ بێ شییان و بێ زارە ب خۆڤە.

و د هەردو سیهاندا حەفت سەد ملیۆن سکلدانۆك یێن تێدا، وەکی ئویشییێ تری، و ڤان سکلدانۆکان ئەگەر ئەم بەلاڤ کەین دێ روبەرێ دوسەد مەترێن دوجایی گریت، و ئەڤ هەردو سیهە د ئێك رۆژدا بیست و پێنج هزار جاران دهێتە لێدان (هەلکێشان و بەردانا ئۆکسجینی)، کو دبنە سەد و هەشتێ مەترێن سێ جایی یێن هەلکێشانێ.

و د مێلاکێدا سێ سەد ملیار خانە یێن هەین، و ب هەمیڤە د ماوێ چار هەیڤاندا نوی دبنەڤە، و کارێن مێلاکێ گەلەکن و د مەترسینە و ب حێبەتینە، ژ بەر کو مرۆڤ نەشێت ماوێ سێ دەمژمێران بێی وێ بژیت.

و د دیوارێن مەعیدەیدا ملیار خانەیێن ترشێ کلۆرا ئاڤێ ژێ دەردکەڤن کو د ئێك رۆژدا دگەهیتە چەند لتران، و زانایان گەلەك شیانێن خۆ مەزاختن بۆ شرۆڤەکرنا ڤێ ئالۆزییێ، ئەو ژی بۆچی مەعیدە (ئاشك) ب خۆ خۆ ناحەلکەت؟ ئەرێ مەعیدە نە موعجیزەیە؟!.

و د رویڤیکادا سێ هزار و شەش سەد مەمیلە یێن هەین بۆ مێتنا خوارنێ د هەر سەنتیمەترەکا دوجاییدا، و ئەڤ مەمیلە ب هەمیڤە د هەر چل و هەشت دەمژمێراندا نوی دبنەڤە.

و د هەردو گولچیسکاندا دو ملیۆن یەکە یێن تێدا، بۆ زەلالکرنێ، درێژاهییا وان پێکڤە دبیتە سەد کیلۆمەتر، کو خوین د ئێك رۆژدا پێنج جاران تێدا دچیت.

و د بن پیستیدا نێزیکی پازدە ملیۆن رژێنێن خوهێ یێن هەین کو گەرما لەشێ مرۆڤی د گەل سەرما و گەرمێ دگونجینن.

لەشێ مە یێ کو ئەم د گەلدا دژین نێزیکترین تشتە بۆ مە، ئەڤە راستینە جهێ پشت راستکرنێ و باوەرپێکرینە، ب دەهان سالان ژ لایێ نوژدارانڤە یێن هاتینە زانین، و ب هەمیڤە ناکەڤنە د بن گەنگەشەکرنێدا (ئانکو پێدڤی ناکەت گەنگەشێ ل سەر بکەن)، خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) [الذاريات: ٢١]،

# مرۆڤ ب باشترین شێوە یێ هاتییە ئافراندن

خودێ دبێژیت: (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤) ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ (٥) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ (٦)) [التين]، ئانكو: ب راستی مە مرۆڤ ل سەر باشترین رەنگ و وێنە دورستکرینە و چێکرینە. پشتی هنگی مە ئێخستینە د پەییسکا ژ هەمییان نزمتردا (نزمترین جھ). ئەو تێ نەبن (ژ بلی وان) یێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت باش کرین، ئەوان خەلاتەکێ بێ ڤەبرین یێ هەی.

خودێ هەمی تشت موکوم و بنەجھ یێن چێکرین، و هەمی تشت ب باشترین شێوە یێن چێکرین، و (مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ) [الملك:٣]، ئانکو، دانان و ڕانان و چێکرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێککەڤتنێ تێدا نابینی. ژ لایێ تەکووزیا چێکرنێڤە، و د گەل ڤێ چەندێ خودێ د ڤێ ئایەتێدا مرۆڤ یێ تایبەت کری، و د هندەك ئایەتێن دیدا ب چێکرنەکا باش دورستکرییە، خودێ دبێژیت: (فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ) [الأنفطار:٨]، ئانکو، ئەو خودایێ تو د وێنەکێ لێکدایدا کو وی ڤیایی، چێکری. و رەنگ و وێنێ وی باش چێکرییە: (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ) [التين:٤]، و ب راست و دورستییەکا باش: (الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ) [الانفطار:٧]، ئانکو، ئەو خودایێ بێ کێماسی و راست و دورست تو چێکری.

و ئەڤە ژی ڤەنجییا چاڤدێرییێیە بۆ ڤی چێکرییێ خودان رێز (مرۆڤ)، و ئاماژەکە بۆ هندێ کو ڤی مرۆڤی سەنگ و رومەتەکا ل دەڤ خودێ هەی، و وی کێشەکا د ڤی سیستەمێ گەردوونیدا هەی.

و ئەڤ مرۆڤێ کو ئالۆزترین ئامویرەیە د گەردوونیدا، د خانێن ویدا، و شانێن وی، و د ئەندامێن ویدا، و کۆئەندامێن وی یێن ئالۆز، و هویربین، و دورستکرنەکا ب موکومی کو نە د شیاندایە ب دورستی تێگەهشتنا چێکرن و پێکهاتێن وی، و تێگەهشتنا رێکا کارێن وی ب دورستی ژ لایێ زاناترین زانایانڤە.

و د ڤی مرۆڤیدا نەفسەك یا هەی هەست و دلۆڤانی پێکدادانێ دکەن، و دلچۆن و بها هەڤرکییێ تێدا دکەن، و پێدڤی، و شەنگست، و مەزنترین زانایێ دەروونی ب دورستی تایبەتمەندییێن وێ ب زانینەکا تمام نوزانیت.

و د ڤی مرۆڤیدا عەقل یێ هەی، و د ناڤ ڤی عەقلیدا ژ بیر و باوەران و یێن باوەر پێکری و هێزێن زانینێ، و شیکارییێ، و داهێنانێ ل دویڤ شیانێن وی داکو ببیتە سەروەرێ چێکرییان و باشترینێ وان، (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ) [الإسراء: ٧٠]، (ئانکو، ب راستی مە دویندەها ئادەمی یێت ب رێز و رویمەت ئێخستین).

و تشتێ دیار و رۆن دکەت کو مرۆڤ ب باشترین شێوە یێ هاتییە چێکرن، کۆئەندامێ بەرگرییا وەرگرە، یان هێلا بەرڤانییا سێیێ د لەشێ مرۆڤیدا.

خودێ مرۆڤ یێ تایبەتمەند کری ب کۆئەندامێن بەرگرییێ یێن گەلەك هویر، و ئێکەم ژ ڤان کۆئەنداماں پیستە، کو ئەڤە وەکی مەتالەکێ زریپۆشە بۆ لەشی، میکرۆب و پیساتییان ژ لەشی دویر دئێخیت، و ئەڤە هێلا بەرگرییا ئێکێیە، و خودێ هەر ئەندامەك و هەر کۆئەندامەك و هەر هەستەوەرگرەك د مرۆڤیدا ب کۆئەندامەکێ بەرگرییێ یێ تایبەتمەند کری.

چاڤ، بۆ نموونە یێ تایبەتمەند کری ب مژویلانکان، و پشتا چاڤان، و رۆندکان، و ئەڤ کۆئەندامێن تایبەت هێلا دووێ یا بەرگرییێنە.

و هێلا بەرگرییا سێیێ خوینە ب لەشکەرێن خۆ ژ تەپکێن سپی، و ژمارا ڤان تەپکان کو لەشکەرێ هێلا بەرگرییا سێیێنە بیست و پێنج ملیۆن تەپکن د رۆژێن تەناهی و ئاشتییێدا، و ژمارا وان زێدە دبیت د کاودانێ هوژداییێدا (هەوارکرنێدا)، و دگەهنە سەدان ملیۆنان د کاودانێ شەریدا، د ماوەکێ کو ژ هندەك دەمژمێران، یان رۆژان

نابۆریت، و ڤی لەشکەرێ مەزن ژ تەپکێن سپی چەکەکێ ئاماژەپێکرنێ یێ هەی ژ هندەك کەرستێن کیمیایی پێك دهێت، کو دبیتە رێکا پەیوەندیپێکرنێ و لێك تێگەهشتنێ د ناڤبەرا واندا.

و نەخشێ کۆئەندامێ بەرگرییێ د بەرهڤانیکرنا ژ لەشی یێ هویربین و پێکڤەگرێدایی و چالاك و زیرەکییەکا بلندا گەلەکا جێبەتیدایە، ئەو ژی خانێن سپی یێن خوینێنە، کو زانا مەندەهۆش کرن؛ چ د سیستەمێ کارێ واندا بیت، یان د دابەشکرنا رۆلێن وان یێن شەری، یان د ب جهئینانا وان کارێن ئەو پێ هاتینە گرێدان و ڕاسپاردن، کو پشتی چەند چرکەکا ژ بۆرینا هەر لەشەکێ غەریب بۆ هێلێن بەرهڤانیکرنا ئێکێ و دووێ، دێ تەپکێن سپی یێن خوینێ بەر ب ڤی لەشێ غەریبڤە چن.

و هندەك تەپکێن هەین کارێ وان وەرگرتنا ئاماژێن کیمیایی یێن تایبەتن ب ڤی دژمنیڤە (لەشێ غەریب)، و دێ هەلگرن، پاشی دێ هنێرنە مەلبەندێ لیمفاوی، داکو خانەیێن پاراستنێ هێماییێن ڤی ئاماژەی ژێکڤە بکەن وەك رێکەك بۆ چێکرنا هەڤدژێ وی.

و پشتی چێکرنا هەڤدژی دێ خانەیێن شەرکەر ڤی چەکی هەلگرن و بەر ب ڤی لەشێ غەریبڤە چن داکو هێرش بکەنێ، و پشتی کوشتنا لەشێ غەریب ب ڤی چەکێ کارلێکەر دێ هندەك خانەیێن دی هێن مەیدانا شەری و وان کەلەخێن مایی ژ دژمنان پاقژکەن (لەشێ غەریب)، داکو خوین پاقژ وەکی بەرێ بزڤریت، و ئەڤ تەپکا سپی توخمێ سەرەکییە د کۆئەندامێ بەرگرییێدا؛ کو تیرا وێ ژ پازدە میکرۆنا نابۆریت، (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ) [التين: ٤]،

و تیپەك یا د ڤی لەشکەریدا هەی، کو ژ نوی یا هاتییە ئاشکەراکرن، ئەو ژی تیپا کۆماندۆیانە، کو دشێن خانا پەنجەشێرێ ئاشکەرا بکەن د دەمەکێ گەلەك زویدا، پاشی داعویرن (ناهێلن).

و گۆتنا خودێ: (ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ) [التين: ٥]، ئەڤە چەندە دئێتە ب جهئینان دبیت دەمێ مرۆڤ ژ رێبازا خودایێ خۆ دەردکەڤیت، و ل دویف گازییا دلچۆنا خۆ

دچيت بێى رێكەكا شەرعى (دورست)، يان پاشڤەلێدەرەك بۆ (فطرة)يەكێ بيت، يان دانەپاشييەكا ژ عەقلى بيت، و ل ڤێرە كارێ ڤى كۆئەندامى دێ ژ كار كەڤيت، و مرۆڤ خۆ ل بەر نەخۆشييەكا بچويك ناگريت و دێ مريت، و نەخۆشيا ئايدزێ؛ كو مەترسى يا ل جيهانێ دورستكرى؛ ب تنێ دوپاتكرنەكە بۆ ڤێ راستييێ: (ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ).

چێ دبيت ئەڤ ئايەتە ل سەر لايەنێ روحى يێ مرۆڤى بن؛ ژ بەر كو دێ يێ ب سەروبەر بيت (بەرهەڤ بيت) دەمێ خودايێ خۆ نياسى، و ل سەر رێبازا وى چۆى، و خۆ ب كارێ چاك نێزيكى وى كر، چونكى ئەڤ مرۆڤە دێ گەهيتە وێ بلندييێ يا كو ملياكەتێن نێزيك نەگەهشتينێ، (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ)، بەلێ ئەگەر خۆ ژ خودايێ خۆ دا پاش، و ژ رێبازا وى دەركەڤت، و خرابى گەهاندە چێكرييێن خودێ دێ رێزا وى گەهيتە هندەك پەييسكان كو چو چێكرى نەگەهشتبنێ، (ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ)، دێ گيانەوەر ژ وى بلندتر بن، و باشتر بن، چ ژ بەر مانا وان (گيانەوەران) ل سەر (فطرة)ـا وان، و تەسبيحا وان بۆ خودايێ وان، و باشيا كرنا كارێن خۆ.

# هەڤسەنگی د ناڤبەرا نێر و مێیاندا

پشتی جەنگا جیهانی یا دووێ رێژا ژنان هەمبەر یا زەلامان بوو چار ب ئێك، ئانكو هەر چار ژن هەمبەری زەلامەكی، بەلێ ب تنێ هندەك سالێن كێم بوون هەتا رێژە زڤرییەڤە بۆ یا خودێ دانای، سەد و پێنج ژ سەدێ نێرن، و نۆت و پێنج ژ سەدێ مێنە، ئەڤ رێژە یا جهگرە ل هەمی وەلاتان، و ل هەمی دەڤەران، و ل هەمی كیشوەران، و د هەمی دەماندا، و تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادكێشیت ئەوە زێدەباری هەر ژن و مێرەكێ ژمارەكا جودا ژ نێر و مێیان یا هەی، بۆ نموونە ڤی زەلامی هەشت كچ یێن هەین، و ئێكێ دی چار، و چار كور، و فلان زەلام یێ خرشە (عقیم)، ئەڤ رێژێن لێك جۆدا، د هەر وەلاتەكی و هەر دەڤەرەكێ، و هەر دەمەكی، و هەر جهەكیدا، دێ دویماهییێ زڤریت بۆ رێژێن رێكخستی كو زانایێن جوگرافیا مرۆڤی دزانن، وەزارەتا دارایی بۆ نموونە دێ چ كەت كو مەزاختن ل دویڤ وێ بریارا پێدڤی بیت؟ هەر بریارەكا مەزاختنێ پێدڤییە بچیت بۆ هەلوەشاندنێ، چونكی دەمێ پشت بەستن ب دویماهی هات دێ ژ مەزاختنێ ڕاوەستن، ل ڤێرە پێدڤییە تۆمارەك هەبیت، و ئەڤ چەندە ل ڤێرە ژی هۆسایە، ڤی كەسی حەفت كوڕ یێن هەین، و كەسەكێ دی حەفت كچ، و ل دەڤ خودێ تۆمارەكا هویربین یا هەی، چونكی ل دویماهییێ دێ رێژە ل دویڤ وێ بیت یا خودێ حەز كری و بریار ل سەر دایی.

ئەڤە بابەتەكە پێدڤی هزركرنێیە، د گەل هندێ كو رێژا ٢٥٪ نێر بوون، و ٧٥٪ مێ بوون پشتی جەنگا جیهانی یا دووێ ب دویماهی هاتی، پشتی چەند سالەكان بوونا نێران زۆر بوو، هەتا رێژە هەڤسەنگ و راستڤە بووی، و وەلێ هات وەكی نوكە هەی،

ئەرێ ما دەستەکێ خودایی نینە کار دکەت د نهێنیدا؟ ئەرێ هندەك تۆمارێن هویربین نینن کۆنترۆلێ ل ڤان رێژا دکەن؟ ئەرێ هندەك رێکخستییێن هویربین نینە؟ ئەڤ ئایەتە یا ل بەر دەستان، یا دیارە ل بەر چاڤان، خودێ دبێژیت: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنْثَى وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ [الرعد:٨]، (ئانكو: ب ڕاستی خودێ دزانیت كا هەر مێیەك ب چ ئاڤس و ئاڤا دبیت و كا مالبچویك ب چ كێم دبیت (ب بوونا بچویكی) و كا ب چ زێدە دبیت (ب چێبوونا بچویكی)، و هەر تشتەكێ هەبیت ل دەڤ وی (ل دەڤ خودێ)، وەختێ خۆ یێ دەستنیشانكری یێ هەی، نە دچیتە پاش و نە دئێتە پێش).

# وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنْثَى

خودایێ مه د چیرۆکا مەریەمێدا دبێژیت: (فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنْثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنْثَى) [آل عمران:٣٦]، (ئانکو: ڤێجا دەمێ بوویی، گۆت: خودێوۆ، ب ڕاستی من کچا بوویی (ئانکو: یێ من ب خۆ دڤیا کورِ بوو) و خودێ چێتر دزانیت کا چ بوویە، و کورِ نەوەکی کچێیە (و وەکی وی ب کێر خزمەتا من ڤیایی نائێت).

زانایێن موسلمانان د ڕێککەڤتینە ل سەر هندێ کو ژن وەکی زەلامییە د ڕاسپاردن و ڕێزلێنان و بەرپسیارییێدا، بەلێ ژن نەوەکی زەلامییە د هندەك تشتێن دیدا، ژ بەر کو وێ تایبەتمەندی د سروشتێ لەشیدا یێن هەین، و تایبەتمەندییێن وێ یێن دەروونی، و یێن جڤاکی، و تایبەتمەندییێن وێ یێن هێزا زانینێ، و د سروشتێ زانینا وێدا، و ئەوێ زارۆکێن کور یان کچ هەین، ئەگەر دویڤچۆنا بزاڤێن وان بکەن، و یارییێن وان، و شێوێن گرێدانێن وان دێ بینن وان جوداییان، و کچا بچویك، کو ئەو یا د ژیێەکێ دەستپێکیدا، وێ کار و گرنگییێن خۆ یێن هەین، و حەزێن خۆ، و بەرێخۆدانێن خۆ نەوەکی وانە ئەوێن ل دەڤ برایێ وێ یێ بچویك، د گەل هندێ کو هێژ نیشانێن نێراتی و مێیاتییێ ل دەڤ وان ئاشکەرا نەبووینە.

زانایێن دەروونی، و نەخاسمە زانایێن دەروونی یێن زارۆکینی و سنێلەییێ دبێژن: ڕەگەزێ مێ تایبەتمەندییێن خۆ یێن بایۆلۆجی یێن ماددی یێن هەین، زێدەباری کو لەشێ ڕەگەزێ مێ و لەشێ یێ نێر ژێك جیاوازن ب جیاوازییەکا دیار.

دێ بۆ هەوە بۆچۆنێن هندەك زانایان د جوداکرنەکا هویربینی یا ماددی و لەشی د ناڤبەرا ژنێ و زەلامیدا ڤەگوهێزم، ئێك ژ زانایێن نوژداری دبێژیت: پشتی ڤەکۆلینەکا درێژ کری یا سەلماندی د پەرتۆکێن پشت پێ دهێتە بەستن: ((بەژنا ژنێ د هەمی توخماندا کورتترە ژ بەژنا زەلامی، و ڕێژەیا جوداییێ دەمێ گەشەکرن تمام دبیت دەه

سەنتیمەترن، و دیسا کێشە، ژ بەر کو پەیکەرێ هەستییێ ژنێ سڤکترە ژ پەیکەرێ هەستییێ زەلامی، و پێکهاتێ پەیکەرێ وێ وەدکەت کێمتر شیانا بزاڤ و ڤەگوهاستنێ هەبیت، و ماسۆلکێن وێ لاوازترن ژ ماسۆلکێن زەلامی ب رێژا سێکی، بەلێ باشترە ژ وی ژ لایێ شانێن خانەیی کو گەلەك مولولەیێن (أوعية) خوینێ یێن تێدا، و دەمارێن هەستیاری، و شانا وێ یا خانەیی دبنە هاریکار بۆ عومبارکرنا تەخەکا دوهنی، و ب ڤێ تەخا دوهنی دێ شێوێ گوروڤرییێ دورست بیت)).

مەژییێ زەلامی سەد گرامان پترە ژ مەژییێ ژنێ، و رێژا مەژییێ زەلامی سەبارەت لەشێ وی ئێکە ژ چلێ، و یێ رێژا مەژییێ ژنێ ئێکە ژ چل و چارێ ژ لەشێ وێ، و مەژییێ وێ کێمتر چەمێن هەین، و لێکبادانێن مەژییێ وێ کێمتر سیستەمییە، و پشکا زانیارییێ د مەژیدا کێمتر روبەرە، بەلێ ناڤەندێن هەست وەرگرییێ، و ئاراندنێ، و ئازراندنێ، پتر کاریگەری یا هەی ژ ناڤەندێن زەلامی، و سینگێ ژنێ و هەردو سیهێن وێ بەرفرەهییا وان کێمترە ژ سینگ و هەردو سیهێن زەلامی، بەلێ هەناسا وێ لەزترە ژ یا زەلامی، و دلێ وێ بچویکترە ژ یێ زەلامی، بەلێ لێدانێن دلێ وێ ب لەزترن ژ یێن زەلامی.

ئەڤ جوداهییێن هویربین ژ لایێ دلی و هەناسێ و ناڤەندێن هەست وەرگرییێ و مێشکی، و دیسا ژ لایێ پەیکەرێ هەستیڤە، و ژ لایێ بەژنێڤە، و کێشێ، دیار دبیت کو چێکرنەکا موکوم و ب رێك و پێك یا هەی ژ لایێ خودایێ پر زاناڤە، ئەڤ دورستکرن و شێوەیە وەل ژنێ دکەت یا خۆشتڤی بیت بۆ زەلامی، و خودێ یا کرییە جهێ ئارامی و خۆجهییێ، خودێ دبێژیت: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) [الروم:٢١]، (ئانکو، ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتدارییا وی، ئەوە وی هەر ژ هەوە (ژ گیانێ هەوە) بۆ هەوە هەڤسەر چێکرن، دا سەبر و هەدارا هەوە پێ بێت، و ل دەڤ ڤەهەسن و ڤیان و دلۆڤانی ئێخستە د ناڤبەرا هەوەدا، ب راستی ئەڤە (دان و چێکرنا هەڤسەران هۆسا) نیشانێت ئاشکەرانە (ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتدارییا خودێ) بۆ وان ئەوێت هزرا خۆ (تێدا) دکەن.

# هەڤسەنگی د هەمی تشتێن خودێ چێکریدا

خودێ دبێژیت: ﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾ [الحجر:١٩]، (ئانكو، مە ئەرد یێ دەشت کری، و مە چیاییێت بنەجھ یێت ئێخستینە تێدا (دا بۆ ببنە سنگ و نەلڤلڤیت)، و مە هەمی تشت ب پیڤان و کێشان تێدا یێت شینکرین).

ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ: ئەوە خودێ هەمی تشت یێن ئافراندین و هەڤسەنگی یا کرییە د ناڤدا، دا چو تشت ل سەر تشتەکێ دی ژ تخوییێ خۆ دەرباز نەبیت، ژ سەیرترین وان تشتێن رویدایی ل هندەك وەلاتان: ل کیشوەرێ ئوسترالیا جۆرەکێ دارا (صبار) چاند، کو ژ دارێن دەشتێیە، قورمێ وێ یێ ستویرە و یێ ب سترییە و تژی ئاڤە، دا ببیتە دیوارەکێ پاراستنێ، پشتی دەمەکی ل سەر چاندنا ڤێ دارێ، وەلێ هاتن رویبەرەکێ مەزن گرت پتر بوو ژ رویبەرێ بریتانیا، و ئەڤ رووەکە بوو نەخۆشییەکا تەڤایی، و زەڤییێن چاندنێ پویچکرن. هەتا زانایان ئاشکرا کری جۆرەکێ مێشێ ل سەر ڤێ دارێ دژیت، و ئەڤ مێشە دشێت سنورەکی بۆ بەربەلاڤبوونا ڤێ دارێ دانیت، هەر وەکی هەمی تشتێن خودێ ئافراندی سروشتەکێ گەشەکرنا رۆتینی یێ تێدا، و تشتەکێ دژی وێ ئافراند کو د ناڤبەرا وێ و ڤێ گەشەبوونێدا، ئەڤەیە هەڤسەنگی.

و ل دویف ڤی شەنگستی گەلەك تشتێن وەکی ڤێ یێن هەین، خودایێ مە رژێنا ژێرمەژی وەسا یا چێ کری هۆشدارییێ ددەتە رژێنا پەریزادێ، بەلێ هۆرموونێ رژێنا

پەریزادێ دەردانا تایبەتا ژێرمەژی گیرۆ دکەت، و ب ڤێ چەندێ هەڤسەنگی د ناڤبەرا رژێنا ژێرمەژی و رژێنا پەریزادێدا دورست دبیت.
دیسا د لەشێ مرۆڤیدا ئامویرەك یێ هەی بۆ گرتن و پاراستنا شلەیان، خودێ ب هەڤسەنگی یێ ئافراندی.
و ئامویرەکێ دی یێ هەی بۆ گرتن و پاراستنا شەکرێ د لەشیدا، و ئامویرەکێ دی یێ هەی ب گرتن و پاراستنا خوێیان د لەشیدا رادبیت، رێژا خوێیان و شەکرێ و ئاڤێ یا جێگیرە، و رێژا هۆرموونان ژی یا جێگیرە.
هندەك ڤیتامینێن هەین ئەگەر مرۆڤ نەخۆت دێ گەلەك نەخۆشی هێنە مرۆڤی، زانا دبێژنێ: نەخۆشییێن کێم خوارنێ، و هندەك دەریاڤان د ماوێ گەشتییێن خۆ یێن درێژدا دمرین بێی ئەگەر، حەتا زانی کو خوارنا وان یا کێم ڤیتامین بوو.
ئەڤ هەڤسەنگییا خودێ ئێخستییە د ڤی گەردوونیدا، تشتەکە دیتن و هزرکرنا مرۆڤی دکێشیت، و حێبەتی دکەت، بۆ نموونە ماسی، ئەگەر ماسییێ مەزن یێ بچویك نەخواربان، دا هژمارا وان ژ تخویبان دەرکەڤیت هەمبەر ئاڤا دەریای، و دا دەریا بیتە دەریایەکا ماسییان نە دەریایەکا ئاڤێ، و دیسا مێش ژی خودێ هەناسا وان یا وەلێ کری ب رێکا بۆرییا بیت نە ب رێکا سیهان، چونکی هەناسا وان ب رێکا بۆرییان ژ قەبارێ نوکە ئەم دبینین مەزنتر لێ ناهێت، و ئەگەر سیهە هەبان، دا ب قەبارەکێ مەزن بن و مرۆڤ نەدهێلان، مێشان تخویبەك یێ هەی لێ دراوەستن، و دیسا رووەك و گیانەرەر هەمی، ژ وانا ژی ماسی، و لەشێ مرۆڤی، کو پیڤەر و شەنگست و هەڤسەنگی یێن تێدا.
ئەگەر هوین ئافراندنا ئەرد و ئەسمانان هویربین بکەن، دێ تشتێن گەلەك حێبەتی بینن، خودێ دبێژیت: (وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ) [الحجر: ١٩]،
ئەڤ رووەکە یێ هەڤسەنگە، قەبارێ وی و گەشەکرنا وی و زێدەبوونا وی د هەڤسەنگن، و ئەگەر هەڤسەنگی نەبا دا مرۆڤ تووشی ژ ناڤچۆنێ بن ب رۆتینیەتێ، و رویدانا ڤی

جۆرێ دارێ ل ئوسترالیا ب تنێ بەلگەیەکێ روهن و دیارە ل سەر هندێ کو خودێ هەمی تشت ب پیڤان و قەدارە یێن داین.

ئەڤ ئایەتێن ئەم گوه لێ دبین یان دبینین یان دخوینین ژ مە نەچن، بێی ئەم ل سەر راستییێن وان، و ل سەر مەزناهییا چێکەرێ وان راوەستین، خودێ دبێژیت: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١)) [آل عمران]، (ئانکو، ب راستی چێکرنا ئەرد و ئەسمانان، و هاتن و چوونا شەڤ و رۆژان نیشانن (ل سەر هەبوون و دەستهەلاتدارییا خودێ) بۆ کەسێت ژیر و ئاقلدار. ئەوێت راوەستیایی (ل سەر پێیان) و روینشتی و ل سەر تەنشتێ درێژکری، خودێ دئینن بیرا خۆ و زکرێ خودێ دکەن و هزرا خۆ د چێکرنا ئەرد و ئەسمانان‌دا دکەن، و دبێژن: خودێوۆ (ئەڤ جیهانە) تە ژ قەستا چێ نەکرییە. پاکی (ژ هەمی کێماسییان) هەر بۆ تەیە، (و ئەم تە ژ کێماسییان و تە ژ چێکرنا ژ قەستا و پویچ پاقژ دکەین) ئێدی تو مە ژ ئاگرێ دۆژەهێ بپارێزە).

# هژمارا خانەیان و ژیییٚ وان

هژمارا خانەیان د لەشێ مرۆڤیدا ژ سەد هزار هزار ملیۆنان پترە، ئانکو سەد هزار بلیۆن، یان سەد ترلیۆن، ڤێ خانێ مرۆڤ ب چاڤ نابینیت، ب تنێ ئەگەر ب تلسکۆپی نەبیت، ئەو ژی سەد و چل جاران مەزن بکەت، و کێشا ڤێ خانێ ئێك ژ هزار ملیۆنان ژ گرامێیە، ئانکو هزار ملیۆن خانەیان دانینە د ترازیێدا دێ کێشا وان بیتە گرامەك، و د هەر چرکەکێدا سەد و بیست و پێنج ملیۆن خانە د لەشیدا ژ ناڤ دچن.

و تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە د خانێدا ناڤك و بۆیاغێن کو ژ جینەیان پێك دهێت، و زانستی هەشت سەد جین یێن ئاشکەرا کری، و سێ سەد ژ وان جینەیان حەتا نوکە زانییە.

و ناڤك و ناڤکۆکە و سایتوپلازما یێن د خانەیێدا، کو ئەڤە لەشێ خانەیێنە، و پەردەکە، و پەردەی شرۆڤەکرنەکا تایبەت یا هەی، و سایتوپلازما ئەڤە کو زانا حێبەتی کری، حەتا وان ب ئاشکەرایی گۆتی: خانە نە یەکا پێکهاتا ئاڤاکرنێیە، بەلکو یەکا فەرمانییە، و نە بچویکترین لەشە و لەش ژ وێ پێك دهێت.

چ د خانەیێدا هەیە؟

تشتێ حێبەتی و سەرسۆرمان ئەوە د خانەیێدا پرۆتین دهێنە چێکرن، و د خانەیێدا کۆگەهێن هەین هندەك کەرستان عومبار دکەت، و د خانەیێدا ئامویرێن پاقژکرنێ یێن هەین، و دیسا بۆرییێن گەهاندنێ یێن تێدا، و دیسا د خانەیێدا دانا وزێ یا هەی، ئەڤ هەمییە یێن د سایتوبلازمایا خانەیێدا، ل ڤێرە ئەو (خانە) نە یەکا پێکهاتا ئاڤاکرنێیە، بەلکو یەکا فەرمانییە.

و تشتێ نەهێتە باوەرکرن: ئەوە خانەیان جوداهی یا د ژیێ واندا هەی ل دویف سروشتێ وان، خانەیێن پیستی ژ سێ دەمژمێران پتر ناژین، ئانکو ژییێ خانەیێن پیستی سێ دەمژمێرن، هەر دەمێ مرۆڤ دچیتە سەرشۆیێ و خۆ پاقژ دکەت، مرۆڤ هەست دکەت کو تشتەك ژ پیستێ مرۆڤی دهێتە خوار، ئەڤە خانەیێن مرینە، کو پتر ژ سێ دەمژمێران ناژین، بەلێ خانەیێن رویفیکێن زراڤ، ژ چل و هەشت دەمژمێرا پتر ناژین، ئانکو دڤێت ئەم بزانین هەر چل و هەشت دەمژمێران رویفیکێن مە یێن زراڤ نوی دبنەڤە، و هندەك خانەیێن هەین حەفت رۆژان دژین وەکی خانەیێن تامێ، و تەپکێن سۆرێن خوینێ سەد و بیست و پێنج رۆژا دژین.

و هەر پێنج سالێن ژ ژییێ مە، پێدڤییە تو باش بزانی هەمی تشتێن د ناڤخۆیا تەدا نوی دبنەڤە، ب تنێ دو جه (ئەندام) نەبن، ئەو ژی خانەیێن مێشکی و دلی، چونکی ئەگەر خانەیێن مێشکی نوی ببانەڤە دا مرۆڤ هەمی زانیارییێن خۆ ژ بیر کەت، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ هۆسا ڤیا خانێن مێشکی بمینن د کۆرپەلەیدا (جنین) هەتا مرنێ، و دیسا خانێن دلی.

کی ب ناڤ سالڤە چۆیە (دانعەمر)؟ ئەوە یێ کارتێکرنێن مرنێ ب سەر کارتێکرنێن ژیانێ دکەڤن، خانەیا ژییێ هەی، ئەو ژی یێن ساخێن مری یێن هەی، هێدی هێدی دچنە د ناڤ لەشێ ویدا، ئەڤەیە رامانا گۆتنا خودێ: (تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ) [آل عمران: ٢٧]، (ئانکو، شەڤێ دکەیە د ناڤ رۆژێدا و رۆژێ دکەیە د ناڤ شەڤێدا (هەردوکان ب ڤێ چەندێ کورت و درێژ دکەی)، و تو یێ زێندی ژ یێ مری دەردئێخی، و یێ مری ژ یێ زێندی دەردئێخی).

ئانکو خانەیێن مری، خانەیێن ساخ ژێ چێ دبن، خودێ دبێژیت: (وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَنْ تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ) [آل عمران:٢٧]،

## أَمْ خَلَقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُون

خودێ دبێژیت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)﴾ [الذاريات]، (ئانكو، و د هەوە ب خۆدا ژی (نیشان و بەلگە گەلەکن) ما هوین نابینن؟

لەشێ مرۆڤی پێك دهێت ژ خانەیان، و خانە یەکا بنیاتییە د پێکهاتنا زیندەوەراندا، و لەشێ مرۆڤێ پێ گەهشتی (بالغ) سەد ترلیۆن خانە یێن تێدا، ئانکو هزار بلیۆن، و خانەیێ هەبوونەکا زیندی یا هەی ئەم هەست پێ ناکەین و نابینین، ئەو تەپکێن خوینێ یێن کو ددانە بن تلسکۆپی، تەپکا سۆر پێدڤی ب چاڤکەکێ تلسکۆپییە کو تشتی سەد و چل جاران دوجایی مەزن بکەت هەتا ئەم ب چاڤ ببینین، ئانکو ئەگەر ئەم تەپکەکا سۆر سەد و چل جاران مەزن بکەین دێ ژ نوی بینین، و کێشا وێ ئێکە ژ ملیارێ ژ گرامێ، و لەشێ مرۆڤی د هەر چرکەکێدا سەد و بیست و پێنج ملیۆن خانەیان دمەزێخیت (ژ ناڤ دچن)، و خانە نوی دبنەڤە د هەمی حەفتییاندا، و بنیاتێ هەمی ڤان خانەیان کو هژمارا وان سەد ترلیۆنن ئەو ژی خانەیا چپکا تێکەلە ژ ئاڤا زەلامی و ژنێ کو هێکا پیتێنکرییە، خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا(٢)﴾ [الانسان]، (ئانکو، ب راستی مە مرۆڤ ژ چپکەکا ئاڤا ژن و مێران یا تێکەل یێ چێ کری، دا بجەرببینین کا پاشی دێ چ کار و کریاران کەت، و مە ب گوه و چاڤ ئێخست).

د ڤێ خانەیێدا ناڤك یا هەی، دبێژنێ: ناڤەندا کارگێرییێ، و سەرپەرشتیکرنێ، و سەرکێشییێ، و ل سەر ڤێ ناڤکێ بیست و سێ جۆتێن کروموسومان یێن هەین، و ئەڤەیە کەرستێ ژیانێ، و نهێنییێن ژیانێ ب ڤی کەرستەینە، و ڤان کروموسومان پتر ژ پێنج هزار ملیۆن پێزانین یێن ل سەر هەین، دبێژن: ئەگەر ڤان پێزانینێن ل سەر

کروموسومان ب زمانەکی بنڤێسین دێ پێدڤی ب مەوسوعەکێ بیت، و دێ ژ ملیۆن بەرپەران بۆریت، و د هەر بەرپەرەکیدا پێنج هزار پێزانین تێدا بن، ئانکو پێنج هزار ملیۆن پێزانین د داناییینە ل سەر ڤان کروموسومان، و ئەم نوزانین.
و ب راستی ڤەکۆلینا سەر خانەیێن بوماوەیی و جینان و خانەیێ تشتەکێ حێبەتییە، و د شێین د ماوێ ڤاندا مەزناهییا خودێ بزانین، دەمێ دبێژیت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)﴾ [الذاريات]،
دەمێ مرۆڤ خۆ دشۆت، و هندەك پیساتی ژ پیستێ وی دکەڤیت، ئەڤە خانەیێن مرینە، و هەر خانەیەکێ ناڤك و ناڤکۆکە و سایتوبلازما یێن هەین، و دیسا پەردە، و ئەو (خانە) هەبوونییەکا زێندییە ل سەر خۆیە، و چالاکی یێن تێدا، و د زانکۆیاندا ب سالێن درێژ خانەیێ ب تنێ دخوینن.
تو هزر دکەی تو جورمەکا بچویکی و د ناڤ خۆیا تەدا جیهانا مەزنتر یا هەی ئەڤ ئافرێنەرێ مەزن یێ تو ئافراندی کو بەری دەمی تو چو نەبووی، ئەرێ ما نەیا پێدڤییە ئەم وی بنیاسین؟ ئەرێ ما نەیا پێدڤیە ئەم گوهدانا وی بکەین؟

# زەنگێن ئاگەهدارکرنا زوی د لەشێ مرۆڤیدا

نیشانەکا مەزن یا د لەشێ مرۆڤیدا هەی بەلگەیە ل سەر مەزناهییا خودێ، هندەك زانا دبێژنێ: (زەنگێن ئاگەهدارکرنا زوی د لەشێ مرۆڤیدا)، و هندەك دەولەتێن پێشکەفتی د پیڤانا سەردەمیدا ـ ئەڤ چەندە داهێنا کو دبێژنێ ئامویرێن ئاگەهدارکرنا زوی، و خودێ ئەڤ لەشێ کو ب باشترین شێوە ئافراندی ئەڤ ئامویرێ ئاگەهدارکرنا زوی یێ کرییە تێدا، ئەڤ ئامویرە یێ د پیستیدا هەی، و پیست پاناتییەکە و تۆڕەکا مەزنا دەماران یێن تێدا، و بەربەلاڤییا دەماران د بن پیستیدا تشتەکە مرۆڤ باوەر ناکەت، و دویماهییا ڤان دەماران لەشێن بچویکێن تایبەت یێن پێڤە، و هەر ئێك یێ تایبەتمەندە ب ڤەگوهاستنا هەستەکێ، هندەکێن هەین گەرمێ و سەرمایێ ڤەدگوهێزن، دەمێ ئەم دەستێن خۆ دشۆین و ئاڤێ د هاڤێژینە ناڤچاڤێن خۆ تشتەکێ پەسەندە ل زڤستانێ، بەلێ دەمێ ئەم ئاڤێ ل پشتا خۆ دکەین، ئەڤە گەلەك مرۆڤ خۆ ل بەر ناگرن، چونکی ژمارا دەمارێن دابەشکری ل پشتا مرۆڤی پتر ژ هژمارا دەمارێن دەستی و ناڤچاڤان، و حیکمەتەکا دی یا مەزنا هەی: دەمارێن هەستپێکرنێ ب سەرمایێ د لاوازن د ئەندامێن کو پێدڤییە ئەم شەڤ و رۆژان پێنج جاران بشۆین، بەلێ جهێن دێ زیان گەهیتێ ئەگەر تە ئاڤ هاڤێتێ دەمارێن هەستپێکرنا سەرمایێ تێدا د زۆرن، و هندەك لەشێن بچویك یێن هەین هەست ب پەستانێ و دەستکرنێ (لمس) دکەن، و بابەتێ پەستانێ یێ درێژە، چاوا مرۆڤ دەمێ یێ نڤستی د ئێك شەڤدا پتر ژ چل جارا خۆ وەردگێریت، چونکی ئەگەر پەستانەك کەفتە سەر لایەکێ لەشێ مرۆڤی دێ لۆلەیێن خوینێ تەنگ بن، و تەڕاتی د ناڤدا نامینیت، ئەڤ لەشێن بچویك دێ ڤێ هەستپێکرنا ب پەستانێ ڤەگوهێزن بۆ مێشکی، و مرۆڤ یێ نڤستی، و دێ مێشك فەرمانەکا بزاڤێ دەرێخیت و مرۆڤ یێ

نفستی، و ئەڤ چەندە یا د قورئانا پیرۆزدا هاتی، کو ئەڤە ئیعجازا قورئانێ یا زانستییە، خودێ دبێژیت: (وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ) [الكهف:١٨]، (ئانکو، مە ئەو ل سەر تەنشتا راستێ و چەپێ دقولپاندن و دزڤراندن).

ئەگەر خۆ وەرگێران ب تنێ لایێ راستێ با، دا مرۆڤ ژ تەختی کەڤیت، بەلێ ژ حیکمەتا خودێ ئەڤ خۆوەرگێرانە ژ هەردو لایێن راستێ و چەپێیە، ئەڤەیە هەستپێکرن ب پەستانێ، و هەستپێکرنا ب ئێشانێ، زانا دبێژن: ((ژ سێ ملیۆنان هەتا پێنج ملیۆنان دویماهیێن دەماران تایبەتن ب ئێشانێڤە، و گەرمێ و سەرمایێ، ژ دو سەد هزار دویماهییێن دەماران پتر یێن هەین، و ئەوێن هەستپێکرنێن پەستانێ پترن ژ نیڤ ملیۆنێ!!)).

ڤەگوهاستنا ڤان پێزانینێن هویربین ژ گەرمێ و سەرمایێ، و ئێشانێ، و پەستانێ و دەستکرنێ، حەفتێ و شەش دەمارێن ناڤەندی بۆ مێشکی دچن و تو یێ نفستی و نوزانی! ئەگەر تە دەستێ خۆ کرە تشتەکێ گەرم، دێ لەزاتییا بەرسڤدانا دەستی ب رێکا دەستکێشانا دەستی کێمتر بیت ژ ئێك ژ سەدێ ژ چرکەکێ، تشتێ ب مەترسی ناخوازیتە هندێ هەستپێکرن بگەهیتە مێشکی، ب تنێ بەسە کو بگەهیتە ستڕییە مەژی، کو فەرمانەکێ دەربێخیت بۆ دەستکێشانێ کێمتر بیت ژ ئێك ژ سەدێ ژ چرکەکێ، و تو نەیێ پێ ئاگەهی.

هەستپێکرن ب هەڤسەنگییێ (ئەڤە ژ کریارێن هندەك دەمارانە)، کو پێنجی گەهـ ب ڤێ چەندێ رادبن، و دو سەد هەستی، و دو سەد ماسۆلکە، ئەڤە هەمی پشکدار دبن دەمێ مرۆڤ ل سەر پییێن خۆ دراوەستیت، بێی هەڤسەنگی تێك بچیت.

هەتا نوکە ژی ئەڤ ئایەتە دهێتە بیرا من: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآَفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣)) [فصلت]،

و د نەفسێن مەدا نیشانێن هەین ب دویماهی ناهێن، ئەگەر مرۆڤ هەمی ژییێ خۆ بمەزێخیت د هویربینکرنا کۆئەندامێن خۆدا، و ئەندامێن خۆ، و ماسۆلکێن خۆ، و دەمارێن خۆ، دێ ژییێ مرۆڤی ب دویماهی هێت، و ئەڤ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ ب دویماهی ناهێن.

و د هەر تشتەکیدا نیشانەکا هەی دسەلمینیت کو خودێ ئێکە

# تشتێن نەگوهۆڕ و گوهۆڕ د لەشێ مرۆڤیدا

ژ نیشانێن بەلگە ل سەر ئیعجازا خودێ د ئافراندییێن ویدا، ئەوە خودێ دلێ مرۆڤی یێ چێ کری، و یێ وەلێ کری شیانا گوهۆرینێ هەبیت، و ئەڤە د شیانێن وان لڤینەراندا (محرکات) نینە ئەوێن مرۆڤ چێ دکەن، ئانکو لڤینەرێ مرۆڤ چێ دکەن ب تنێ ئێك شیان یا هەی، بەلێ دلێ مرۆڤی شیانێن وی دهێنە گوهۆرین ل دویڤ کاودانان، دلێ مرۆڤی نێزیکی هەشتێ جاران د خۆلەکەکێدا لێ ددەت، ئەڤە نێزیکترین ژمارا نەگوهۆرە، بەلێ دەمێ دکەڤیتە هەمبەر کاودانێن ب زەحمەت وەکی چۆنا ژێهەلیێن چیایان، یان ب پەییسکێ (درج) ژێهەل دچیت، یان دەمێ مرۆڤ تووشی ئارێشەکا دەروونی دبیت، یان دەمێ مرۆڤ دترسیت، ل ڤێرە لێدانێن دلێ مرۆڤی زێدە دبن دگەهنە سەد و هەشتێ لێدانان، ئانکو هژمارەك یا نەگوهۆرە، و هژمارەك یا ب گوهۆرینە.

چاڤ هەمی تشتا ب ئاشکراییەکا تمام دبینیت ل دویراتییا شێست مەترا، بەلێ پشتی شێست مەترا دڤێت کریارەکا دی هەبیت کو ئارمانجەکا ئیعجازییە، ئەو ژی کریارەکا رێککەڤتنێ (مطابقة)یە، دەمێ مرۆڤ بەرێ خۆ ددەتە تەپێ، هەروەکی لایێ سێیێ دویراتییا د ناڤبەرا چاڤی و تەپێدا دپیڤیت، و پەستانێ دکەتە سەر لەشێ تەنك (گومبەتە) د چاڤیدا، ب دەهێکا میکرونێ، داکو خیالا وێنێ ڤی لەشی ل سەر تۆرا چاڤی بمینیت، و شرۆڤەکرنێن ڤێ رێککەفتنێ هەتا ڤێ دەمژمێرێ نەجهێ پشت راستکرنێنە، ئەڤە چاڤدێرییا خودێیە، ئەم دشێین رێکەکا ب قەرەبالغا هاتن و چۆنێ ببینین، هەر دەمێ مرۆڤ بەرێ خۆ ددەتە مرۆڤەکێ خواراتییا چاڤکی (عدسة) د چاڤیدا دێ هێتە گوهۆرین، گوهۆرینەکا وەسا خیالا وی وەلێ بکەت ل سەر تۆرا د چاڤیدا، ئەڤە نابیت

ئەگەر ب ماسولکێن کۆلکەیی کو گەلەك د هویربینن، دێ پەستانێ کەنە سەر لەشێ تەنك، دێ شکەستنا وێ زێدە بیت، یان دێ سڤك (کێم)بن، ل دویڤ دویراتییا لەشی بۆ چاڤی، و ئەڤەیە رێککەڤتن (مطابقة).

تشتەکێ دی... مرۆڤ ژ وان زیندەوەرایە یێن پلا گەرمییا وان نەگوهۆر، بەلێ چاوا مرۆڤ بەرسینگگرتنا کێش و هەوایێ گەرم دکەت؟ مرۆڤ بەرسینگگرتنا گەرمێ دکەت ب رژێنێن خوهدانێ، رژێنێن خوهدانێ ئامویرەکێ گەلەکێ هویربینە د گونجاندنا لەشیدا، و دەمێ ئەڤ رژێنێن خوهێ دەردانێ دکەن، و دەمێ گوهۆرینا گەرمییێ چێ دبیت د ناڤبەرا ئاڤێ و گەرمییا پیستیدا، دێ ئاڤ گەرمییا پیستی کێشیت، و ب ڤێ دێ گەرمییا پیستی کێم بیت، ژ بەر هندێ: خوهدان رێکەکا گەلەك هویربین و ئالۆزە، گەرمییا لەشی دئینیتە خوار، و دەمێ پلا گەرمییێ ژ رادەکێ بەرئاقل راوەستییا دێ لەرزك هێتە مرۆڤی و دێ ماسۆلکە لڤن و گەرمییێ چێکەن، و دێ پویتێ لەشی زوق بیت دا چەندەکا هەوایێ گەرم عومبار بکەن، دا هەمبەر ڤی کێش و هەوایێ سار راوەستیت، ل ڤێرە تەزینك و خوهدان، ب ڤان هەردو رێکا لەش بەرسینگگرتنا کێش و هەوایێ گەرم و سار دکەت.

ئەگەر دەمارێن هەستپێکرنێ یێن مێشکی تشتەکێ دەرەکی کارتێکرن لێ کر، وەکی گەرمێ و سەرمایێ، یان ئێشانەکێ، یان کارتێکرنەکا کیمیایی، چو گۆمان تێدا نینە دێ مرۆڤ هەست ب ئێشانێ کەت، بەلێ ئەگەر ئێشان گەهشتە رادەکی مرۆڤ خۆ ل بەر نەگریت، دێ مێشك کەرستەکی بەردەت جهێ ئێشێ بێهۆش بکەت، و ئەڤە ژ چێترینێ کەرستێن بێهۆشکەرە، هەتا ئێش نەمینیت، و ئەڤە بێهۆشبوونە، یان ئەم دبێژینێ دلگرتن، ئانکو ئەڤ دلگرتنە روی ددەت دەمێ ئەڤ کەرستە وی بێهۆش دکەت، و ئێشانێ ژ مرۆڤی دویر دئێخیت.

ئەرێ هەوە دیت ئەڤ مرۆڤێ د ئافراندنا ویدا تشتێن نەشیاندار (معجز)؟ کو جارەکێ د نەگوهۆرن، و جارەکێ ژی دهێنە گوهۆرین، لێدانێن دلێ مرۆڤی د جێهگرن، بەلێ د دەمێ پێدڤیدا دگەهنە سەد و هەشتێ لێدانان، و دیتنا چاڤی یا نەگوهۆرە، بەلێ

دویراتییا کێمتر ژ شەش مەترا رێککەفتن چێ دبیت کو ژ هویربینترین کارێن د چاڤیدانە، و گەرمییا لەشی یا نەگوهۆرە، بەلێ تەزینک و خوهدان دو رێکن لەش ب خۆ دگونجینیت د گەل کێش و هەوایێ گەرم و سار، و مێشک هەست ب ئێشانێ دکەت ب شێوەکێ نەگوهۆر، بەلێ دەمێ ئێشان زێدە دبیت مێشک مایتێکرنێ دکەت ب دەردانا کەرستەکێ بێهۆشکەر، و ئەڤەیە کاودانا دلگرتنێ یان بێهۆشییێ مرۆڤ هندەک جارا تووش دبیتێ.

# دەمژمێرا بایولۆجی ل دەڤ مرۆڤی

زانایێن فرەنسی ئاشکرا کر د شیانێن رووەکیدایە هژمارتنا دەمی بکەت، چونکی بەلگێن هندەك رووەکان لڤینێن دەستنیشانکری دکەن ل دەمەکێ دەستنیشانکری یێ رۆژێ، ل ڤێرە ل دەڤ ڤی رووەکی کو زانا دبێژنێ: دەمژمێرا بایلوجی، ب ڤی دەمی دهەژمێرن.

و دیسا زانایان ئاشکرا کرییە د گیانەوەراندا ژی وەکی د رووەکیدا یێ هەی، هندەك گیانەوەر یێن هەین گەلەك هویربین چۆنا دەمی دزانن، ل زڤستانێ بەرەڤ جهێ بهێنڤەدانا خۆ دچیت، ئەگەر پیچەك گیرۆ ببیت دێ مریت، و ئەگەر زوی ژی بچیت دێ مریت، و ب هژمارییەکا هویربین یا دەمی هندەك گیانەوەر دچنە هێلینێن خۆ، دا ب درێژاهییا زڤستانێ بنڤن، و ئەگەر نەزانیبا کا چاوا دەم دبۆریت نەشیان ڤێ چەندێ بکەن، خودێ دبێژیت: (قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى (٤٩) قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى (٥٠) ) [طه]، ئانکو: فیرعەونی گۆت: پا خودایێ هەوە کییە، هەی مووسا؟ مووسای گۆت: خودایێ مە ئەوە یێ هەر تشتەکێ چێ کری، ئەو داییێ (ژ رەنگ و وێنەیان) یێ ب کێر وی بهێت پاشی هەمی راستەرێکرن (بۆ وێ ئارمانجا ئەو بۆ هاتینە چێکرن).

د لەشێ مرۆڤیدا و ل دۆر رژێنا ژێرمەژیدا کۆمەکا خانەیان یا هەی، تایبەتمەندییەکا حێبەتی یا هەی، ئەڤە هەست ب وێ رۆناهییا دکەڤیتە سەر چالا تۆرێ د ماوێ رۆژێدا دکەت، ئەگەر هەست ب ڤێ رۆناهییێ هاتە کرن رامانا وێ ئەوە ئەڤ دەمە رۆژە، و ئەگەر ئەڤ تیشکە چۆ ئەوا دکەڤیتە سەر چالا تۆرێ رامانا وێ ئەوە کو ئەڤ دەمە شەڤە.

و د ماوێ رۆژێدا چو گوهۆرین د لەشێ مرۆڤیدا چێ دبن؟ و چ د شەڤێدا چێ دبیت؟

د ماوێ رۆژێدا مەزاختنا وزا لەشی زێدە دبیت، دێ پلا گەرمییا لەشی نیڤ پلێ بلند بیت ژ رێژا ناڤنجی، و دێ نیڤ پلە کێم بیت د شەڤێدا.

کی هەسپێکرنێ ددەتە خانەیان و خانەیێن دەربرینا خۆراکی کو ئەڤ دەمە دەمێ رۆژێیە؟ ئەڤ خانەیێن ل دۆر رژینا ژێرمەژی هەستکرنێ د ماوێ وەرگرتنا وێ رۆناهییا دکەڤیتە د چاڤیدا وەردگرن کو ئەڤ دەمە دەمێ رۆژێیە.

**زانایان ئەڤ دیاردە ب ڤی شێوێ خوارێ شرۆڤە کر:**

کەڤتنا رۆناهییێ ل سەر تۆرا چاڤی دهێتە ڤەگوهازتن ب رێکا ڤەگوهێزەرێن دەماری د ماوێ رویشالێن دەمارا دیتنێ بۆ رژێنا ژێرمەژی، و ئەڤە شاها رژێنایە، کو تامییێ و گونجاندنێ د ناڤبەرا کریارێن کۆئەندامێن ناڤەکی دورست دکەت، و چالاکییا گشتی یا لەشی یا گرێدایە ب رژێنا پەریزادێڤە، و رژێنا پەریزادێ کو دەربرینا خۆراکی یا تێدا (گوهۆرینا خوارنێ بۆ وزێ)، ئەڤ خوارنە ب رۆژ دگەهیتە وزەکا بلند، و وزەکا کێم ب شەڤێ، ئەڤ رژێنا ژێرمەژی د گەل رژێنا پەریزادێ کاریگەر دبن ب دەمی، بەلکو ل ڤێرە دەمژمێرەکا هەی ل دویڤێك چۆنا شەڤ و رۆژا دهەژمێریت.

و لێدانێن دلی د رۆژێدا ژ دەه بۆ بیست لێدانا زێدە دبیت بەراورد د گەل شەڤێ، و هاتنا میزێ ژ دوجارکی بۆ چار جارکی ل رۆژێ زێدەترە ژ شەڤێ، و د ماوێ تۆمارکرنا چالاکییا کارەبایی یا مێشکی دیار بوو کو ب رۆژ زێدە دبیت، و ب شەڤ لاواز دبیت، و حولییا خوینێ ب رۆژ زێدەتر دبیت ژ شەڤێ، و هژمارا تەپکێن سپی یێن خوینێ (وەك چەکەکێ بەرگرییێ د مرۆڤیدا) ب رۆژ زێدەتر دبن ژ شەڤێ، کی هەستێ ددەتە لەشی کو دەم دەمێ رۆژێیە؟

تو ب عەقلێ خۆ تشتان دزانی، بەلێ ئەڤ خانەیێن کو کریارێن وان د ناڤبەرا شەڤ و رۆژاندا دهێنە گوهۆرین، یان بلندبوونا رێژێن کریارێن وان د ناڤبەرا شەڤ و رۆژاندا کی هەست دئێخیت ب دەمی؟

ئەڤەیە زانایان ناڤ لێنایی ب ((دەمژمێرا بایولۆجی))، دەمژمێرا بایلوجی کۆمەکا خانەیانە ب رەخ رژێنا ژێرمەژی، کو هەستپێکرن ب رێکا وێ رۆناهییا رۆژێ دهێت ئەوا

دکەڤیتە سەر چالا تۆرا چاڤی د ماوێ رۆژێدا، ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ مرۆڤ بەردەوام د تاریاتیییێدا ژیا دێ کریارێن وی یێن زیندەیی تێك چن، چونکی ئەڤ دەمژمێرا بایلوجی دێ ژ کار کەڤیت چونکی رۆناهیا رۆژێ ناگەهیتە کویراتیا چالا چاڤی.

دیارترین تشت د لەشێ مرۆڤیدا کو چەنداتییێن هۆرموونان د خوینێدا دهێنە گوهۆرین، ژ رۆناهییێ بۆ تاریاتییێ، هۆرموونان ب شەڤێ رێژا خۆ یا هەی، و رێژەکا دی ب رۆژێ، چونکی خودێ رۆژ یا کرییە دەمێ ژیارێ و پێدڤییێن خۆ ب دەستڤە بینن، و شەڤ یا کرییە کراس کو تاریاتیا وێ وەکی کراسی مە دنخێڤیت، د شەڤێدا هۆرموونێ گەشەبوونێ زێدە دبیت، و هۆرموونێن جۆتبوونێ (زێدەبوونێ) زێدە دبن، و مەزاختنا شەکرێ سیە ژ سەدێ کێم دبیت بەراورد د گەل رۆژێ، ژ بەر هندێ چالاکییا کۆئەندمێ هەناسێ ب شەڤ کێم دبیت ب رێژا سیە ژ سەدێ بەراورد د گەل رۆژێ، ئەڤە هندەك ژ رامانێن گۆتنا خودێنە: (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ) [التين: ٤]، و ئەڤ گوهۆرینە ئاستێ زیندوویيا کریارێن لەشی دەستنیشان دکەت ئەوێن ب رۆژ زێدە دبن، و یێن ب شەڤ کێم دبن، بۆ نموونە گەرمی د لەشێ مرۆڤیدا دگەهیتە نزمترین ئاست د ماوێ شەڤێدا، و دگەهیتە نزمترین پلە ل دەمژمێر شەشێ سپێدێ، و لێدانێن دلی دهێنە گوهۆرین ژ شەڤێ بۆ رۆژێ، و فشارا خوینبەری دهێتە گوهۆرین ژ شەڤێ بۆ رۆژێ.

و شیانێن دەردانا مەعیدەی، و شیانێن هەرسکرنا خوارنێ د ماوێ شەڤێدا یا کێمە.

زانا دبێژن: ((د گەل هشیاربوونا مرۆڤی ژ خەو کەرستەك یێ هەی د خوینێدا دکەڤیتە سەرێك یان کۆوم دبیت دبیتە ئەگەرێ لەزکەفتنا لێدانێن دلی، و بلندبوونا فشارا خوینێ، و ئەڤە دکێشیتە هندێ لەش چالاك بکەڤیت))، ژ بەر ڤێ چەندێ دو دەم خۆشترینن بۆ کاری ل دەڤ بەهرا پتر ژ مرۆڤان، ژ دەمژمێر نەهـ هەتا دوازدێ نیڤرۆ، و ژ چارێ هەتا شەشێ، د ڤان دەمژمێراندا چالاکییێن لەشێ مرۆڤی د خورتن و شیانێن هەر پێنج هەستێن مرۆڤی زێدە دبن، و دهێنە ئاراستەکرن بۆ مەزاختنا شیان و چالاکییان د ڤان هەردو دەماندا و بێهنڤەدانێ بکەت ل دەمێن ئاستێ چالاکییێن مرۆڤی

**کێم دبن، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((اللَّهُمَّ بَارِك لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا))[1]، (ئانکو، یا خودێ تو بەرەکەتێ بدییە ئوممەتا من د سپێدەهییێن واندا).**

**ئەڤ دەمژمێرا بایولۆجی هەستی ددەتە کۆئەندام و ئەندام و شانان و خانەیان و رژێنان، کو دەم دەمێ رۆژێیە، دیار دکەت فلان کاری بکەت یان نەکەت، پاشی دێ هەستی دەتە ڤان خانەیان کو ئەو دەمژمێرا بایلوجییە، ئەندام و کۆئەندام و شانە و رژێن و خانەیان کو دەم دەمێ شەڤێییە، دیار دکەت فلان کاری بکە یان نەکە، ئەو کارێ تو ب رۆژ دکەی نەشێی ب شەڤ ئەنجام بدەی.**

**زانا دبێژن: ((ئەوێ ب شەڤ و رۆژ کار دکەت ب گاڤێن لەز، ل دەڤ ڤی کەسی دەمژمێرا بایلوجی د لەشێ ویدا تێك دچیت)).**

**زانایان نەخۆشییەك ل دەڤ بازرگانان ئاشکەرا کر، ئەوێن ب لەز ژ باژێرەکی دچنە باژێرەکێ دی، ئەڤێن ب ڤێ لەزاتییێ دهێن و دچن دەمژمێرا بایلوجی ل دەڤ وان تێك دچیت، ئەڤە هویربینترین چێکرییێ خودێیە: (صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ) [النمل:٨٨]، (ئانکو، ئەڤە چێکرنا خودێیە، ئەوێ هەر تشتەك موکوم و بنەجھ چێ کری).**

**تە دەمژمێرەك یا هەی، هۆرموونان بەرنامە دکەت، و لێدانێن دلی، و فشارێ، و گەرمییێ، و شیانێن هەرسکرنا خوارنێ، و ئەڤ دەمژمێرە دزانیت کا تو د رۆژێدایی یان د شەڤێدا، بێی کو پەیوەندی ب هێزا زانینا تەڤە هەبیت، ئەڤە چێکرنا خودێیە ئەو خودایێ هەمی تشت ب موکمی چێ کری، خودێ دبێژیت: (وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ (٢٠) وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات]، (ئانکو، د ئەردیدا نیشان و بەلگە گەلەکن، بۆ وان ئەوێت هەقییێ پەسەند دکەن و پشتەڤانییا وێ دکەن. و د هەوە ب خۆدا ژی (نیشان و بەلگە گەلەکن) ما هوین نابینن؟).**

---

**(١) ترمزی (١٢١٢)، ئەبو داوود (٢٦٠٦)، ئیبن ماجە (٢٢٣٦) زار سەخرێ غامدی، و ئەحمەد (١٣٢٢) زار عەلی.**

# ئامویرێ گەرمکرن و تەزاندنێ د لەشێ مرۆڤیدا

ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ کو د لەشێ مرۆڤیدا ئامویرێ گونجاندن و تەزاندنێ یێ هەی، دهێتە هژمارتن ژ هویربینترین و ئالۆزترین ئامویران، و مرۆڤ زیندەوەرەکە دهێتە ڤەدەرکرن کو گەرمییا وی یا جێهگرە، سیه و حەفت پلەیە، دێ چ چێ بیت ئەگەر گەرمییا لەشێ مرۆڤی زێدە ببیت یان کێم، و مرۆڤ نامریت ب تنێ دو کاودانان نەبیت؛ کاودانێ ئێکێ ئەگەر پلا گەرمییا مرۆڤی گەهشتە چل و پێنجێ د گەل شها ب ئێك جاری، و یا دووێ ئەگەر پلا گەرمییا مرۆڤی گەهشتە شێستێ د گەل هشکبوونا ب ئێك جاری، ژ بلی ڤان دو کاودانان، مرۆڤی ئامویرەکێ گەلەکێ ئالۆز یێ هەی، کو گەرماتییا وی د سیه و حفت پلەیەدا نەگوهۆر دکەت، چەوا ئەڤە چێ دبیت؟
د لەشێ مرۆڤیدا ژ سێ ملیۆن هەتا چار ملیۆن رژێنێن خوهدانێ یێن هەین و د دابەشکرینە د پیستیدا ب دابەشکرنەکا زانایانە، بۆ نموونە: د پانکا دەستیدا هەشتێ و چار رژێنێن خوهدانێ د سەنتیمەترەکا دوجاییدا یێن هەین، و ئەگەر ئەم ڤان رژێنێن خوهدانێ بکەینە سەرێك دێ درێژاهییا وان بیتە پێنج کیلۆمەتر د لەشێ هەر ئێك ژ مەدا، ئەڤ رژێنێن خوهدانێ ل رۆژێن گەرم دو سەد سەنتیمەتران د رۆژێدا هەتا هزار و پێنج سەد سەنتیمەترێن سێجایی د دەمژمێرەکێدا دەردکەت، دەمێ خوه دەردکەڤیت، و بەلاڤ دبیت سەر پیستی کو رویبەرێ پیستێ مرۆڤی پترە ژ (١,٨م٢)، و ئەڤ ئاڤا ب رێکا خانەیێن خوهدانێ دەرکەفتی دێ بیتە هەلم، و د گەل هەلبوونا وێ دبێژنێ: لێکگوهۆرینا گەرمییێ، ژ بەر کو دەمێ خوه دبیتە هەلم گەرمییەکێ ژ لەشی دمێژیت

و گەرمییا لەشی دزڤریتەڤە بۆ پلەیا خۆ یا جێهگر، ئەڤە ژ ئالۆزترین ئامویرێن گونجاندنێیە د گەردوونیدا.

دەمێ مرۆڤی سار دبیت خوینهێنەر تەنگ دبن، دا هاتن و چۆنا خوینێ د لەشێ سەرڤە یێ مرۆڤیدا سڤك ببیت، دا خوین پاراستنێ ل سەر گەرمییا خۆ بکەت، و دەمێ مرۆڤی هەست ب گەرمییێ کر، دێ خوینبەر و خوینهێنەر فرەهـ بن دا خوین بەلاڤە ببیتە هەمی پیستێ مرۆڤی، و دەمێ مرۆڤی سار دبیت دێ رەنگێ وی زەر بیت، چونکی تیرێ خوینهێنەر و خوینبەران تەنگ دبیت دا خوین گەرمییا خۆ د ناڤ ڤاندا بپارێزیت، و دەمێ مرۆڤ دلەرزیت، ئەڤ لەرزینە وزەکا گەرمییێ ددەت دا ئەو وزا ژ دەست دای ل جێوێ دەرڤەدا ڤەرەبوو بیت، و دەمێ موییێن مرۆڤی راست دبن (زوق) ئەڤە ژ بەر هندێیە کو هەوایەکێ گەرم بگریت ب ڤەبارەکێ مەزنتر.

ل ڤێرە سیستەمەکێ ئالۆز یێ هەی دورست دبیت دەمێ گەرمی دهێتە خوارێ ب رادەکێ گەلەکێ نزم، و سیستەمەکێ دی یێ ئالۆز یێ هەی دورست دبیت دەمێ گەرمی ب رادەکێ گەلەکێ بلند بلند دبیت.

ئەگەر (١٠٠٠ سم٢) ژ خوهێ ژ لەشێ مرۆڤی دەرکەڤن، ئەو دێ هزار و سێ سەد گەرمۆکان ژ دەست دەت، ئەڤە ئامویرەکێ گونجاندنێ یێ گەلەك هویربینە، بەرسینگگرتنا گەرمییێ دکەت، و دیسا یا سەرمایێ ژی.

ئەڤە ژ نیشانێن خودێ یێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا وی، و خودێ دبێژیت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)﴾ [الذاريات: ٢١]،

# ئاميرێ خوهدانێ ل دەڤ مرۆڤی

ئاميرەكێ تەزاندنێ يێ د لەشێ مرۆڤيدا هەی زانا دبێژنێ: ئاميرێ خوهدانێ، ئەڤ ئاميرە وەكی ئاميرێ تەزاندنێيە، و ئاميرێ رێكخستنا گەرمييێيە بۆ مرۆڤی.

ئەڤ ئاميرە ژ مليۆن يەكەيێن تەزاندنێ پێك دهێت، ئانكو ژ مليۆن رژێنێن خوهدانێ، و هەر رژێنەكا خوهدانێ ژ بۆرييەكا درێژاهييا وێ (٢ملم) پێك دهێت، و تيرا وێ (١٠ملم)، و ئەڤ بۆرييە يا د خۆ ئالاندييە، و يا ب پيستيڤە، و ئەڤ بۆرييە د دابەشكرينە ل سەر پاناتييا پيستی ب شێوەكێ نەيێ يەكسانی، گەلەك يێن ل ئەنييێ هەين، و د چالا پێيدا، و پانكا دەستی، و ل هندەك جهێن دی يێن لەشی، نێزيكی سێ سەد رژێنێن خوهدانێ د هەر سەنتيمەترەكێدا يێن هەين، و هەر رژێنەكا خوهدانێ ئاميرەكێ تەزاندنێ يێ تمام يێ هەی، و ڤان بۆرييان ئەگەر ب سەرێكڤە بكەين دێ درێژاهييا وان بيتە پێنج كيلۆمەتر د هەمی لەشيدا، و د هەر سەد گرامێن خوهێدا، نۆت و نەه گرامێن ئاڤێ يێن تێدا و گرامەك ژ كەرستێن حەليايی، و نيڤا ڤێ گرامێ خوێيە، و نيڤا دی يوريايە، و هندەك كەرستێن كيميايی يێن دی، مرۆڤ د ماوێ بيست و چار دەمژمێراندا شەش سەد تا هزار گرامێن خوهێ ژ لەشێ وی دەردكەڤن، و خوهدان يا بەردەوامە، و ئەم هەست پێ ناكەين ب تنێ ئەگەر گەلەك نەبيت، و بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ كو خوهدان يا بەردەوامە ئەو ژی نەرماتييا پيستی و شها وی، ب ئەگەرێ خوهدانێ، و ئەگەر خوهدان نەبا، نەرماتييا پيستی نەدبوو، و شها وی ژی نەدبوو، و خوهدان دياردەكا پاراستنێيە هەمبەر بلندبوونا گەرمييا لەشی، وەكی چاوا هندەك ئامانێن هەلێ كونەكا هەی ژ ترسا هندێ ئەو ئامانە بپەقيت، و لەش ژی وەسا، دەمێ

گەرمییا لەشی یا ناڤخۆیی و ژ دەرڤە بلند دبیت، ئەڤ ئامویرێ خوهدانێ دێ ئاڤا د لەشێ مرۆڤیدا بەردەت، و ئەڤ ئاڤا گەلەك دێ گەرمییا زێدە مێژیت و دێ بیتە هەلم، و ب ڤێ رێکێ دێ لەش گەرمییا خۆ یا ناڤنجی پارێزیت.

ژ کارێن خوهدانێ دەرکرنا یوریاییێیە، و پیستی نەرم دکەت، و گەرمییا لەشی رێك دئێخیت، ژ بەر ڤێ چەندێ پێدڤییە چاڤدێری ب پاقژکرنا لەشی بهێتە کرن دا شوینوارێن خوهدانێ پێن بهێن نەخۆش نەمینن، چونکی خوێ د لەشێ مەدا پێن هەین، و ترشێ یوریایێ، وەکی کا چاوا د میزێدا هەیە، ژ بەر ڤێ چەندێ یا گۆتی: (اغْتَسِلْ وَلَوْ مُدًّا بِدِينَارٍ)، ئانکو، خۆ بشۆ خۆ ئەگەر مستا ئاڤێ ب دینارەکێ بیت.

شویشتنا رۆژا ئەینی وەکی ئەرکەکی لێ دهێت، دا ئەگەر و شوینوارێن خوهدانێ ببەت، و مافێ خودێ یێ ل سەر موسلمانی هەر حەفت رۆژان جارەکێ خۆ بشۆت، وەکی د فەرموودێدا هاتی، زار جابری دبێژیت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ غُسْلٌ فِي سَبْعَةِ أَيَّامٍ كُلَّ جُمُعَةٍ))[1] و پاقژی ژ باوەرییێیە، و ب ڤێ پاقژییێ بێهنا نەخۆش یا خوهدانێ دبەت، و شوینوارێن خوهدانێ ئەوێن پشتی هەلبوونێ چێ بووین دبەت، و کونێن پیستی ڤەدکەت، و کونێن رژێنێن خوهدانێ ژی ڤەدکەت.

---

(١) ئەحمەد (١٤٣٠٥)، و ئیبن ئەبی شەیبە د (المصنف)دا (٥٠٠٧).

# ئەندامەتی چاوا بەرسینگگرتنا سەرمایێ دگریت

ئەڤ مرۆڤێ خودێ ب باشترین شێوە چێ کری، دێ چ کەت دەمێ سەرمایەکا توند و دژوار گەهشتێ؟ و دێ چاوا بەرهەڤانییێ ژ خۆ کەت؟ خودێ چ کۆئەندام کرینە د لەشێ ویدا کو هەمبەر سەرمایێ راوەستیت؟

زانا دبێژن: ((پیستێ مرۆڤی وەکی وەزارەتا دەرڤەیە، بۆ مرۆڤی هەمی گوهۆرینکارییان ڤەدگوهێزیت کو ل دەوروبەرێن مرۆڤی چێ دبن، و د پیستیدا ناڤەندەکا هەی بۆ ڤەگوهاستنا پێزانینێن گرێدایی ب نزمبوون و بلندبوونا پلا گەرمێ، و ئەگەر کەش و هەوا سار بوو و چو تشت نەبن سەرمایێ ببەن، دێ د لەشێ مەدا چ روی دەت؟)).

دێ هەمی خوینبەر و خوینهێنەر تەنگ بن، نەخاسمە یێن سەرڤەی پیستی، دەمێ تەنگ بوون دێ ئەو خوینا د ناڤدا یا کو دهێت و د چیت کێم بیت، و ئەگەر خوین د ناڤدا کێم بوو، دێ تیشکا گەرمییێ کێم بیت، دێ لەش پاراستنێ ل سەر گەرمییا خۆ کەت ئەوا هەی ژ سۆتنا کەرستێن خوارنێ.

ئەوێ سەرمایەکا دژوار دگەهیتێ دێ رەنگێ وی زەر بیت، و رامانا زەراتییا رەنگی ئەوە کو خوینبەرێن سەرڤە ئەوێن تژی خوین دێ تەنگ بن، و دەمێ تەنگ دبن دێ چەنداتییا خوینێ تێدا کێم بیت، و پاشی ئەو گەرمییا لەشی ژ دەست دایی دێ کێم بیت.

تشتەکێ دی، رژێنا ژێرمەژی هۆرموونەکی دهنێریتە رژێنا پەریزادێ، و رژێنا پەریزادێ ب کارەکێ گەلەك ئالۆز و مژدار رادبیت، کو ئەو ژی دەربرینا خۆراکییە (گوهۆرینا خوارنێ بۆ وزێ)، و رژێنا ژێرمەژی دێ فەرمانەکا هۆرموونی هنێریت بۆ

رژێنا پەریزادێ دا دەربرینا خۆراکی زێدە بکەت، ئانکو ژ سۆتنا کەرستێن خوارنێ، و دێ گەرمییێ بەرهەم ئینیت کو ئەڤ گەرمییە د لەشیدا بهێت و بچیت، ئەگەر ئەم ڤەکۆلینا هۆرموونێن د ناڤ خوینێدا بکەین، دێ بینین رێژا وێ یا بلندە، و نەخاسمە ئەوێن ژ رژێنا ژێرمەژی دەردکەڤن، کو فەرمانا رژێنا پەریزادێ دکەت، ب بلندکرنا ئاستێ سۆتنێ د لەشیدا.

تشتەکێ دی، مرۆڤ ب شێوەکێ دی بەرسینگگرتنا سەرمایێ دکەت، د سەرێ مرۆڤیدا پتر ژ دو سەد و پێنجی هزار موییان یێن تێرا، زێدە ببن یان کێم، هەر موییەکی: خوینهێنەر و خوینبەر و دەمار و رژێنا دوهنی و رژێنا رەنگی یێن هەین، دەمێ مرۆڤی سار دبیت، وەکی فەرمانەکێ دێ بۆ موییان هێت، دێ موی زوق بن، و دەمێ زوق دبن، دێ ئەڤ موییە چەندەکا هەوایێ گەرم وەرگرن ژ بەرێ پتر.

ئەڤ چەندە د لەشێن مەدا چێ دبیت بێی ئەم بزانین، و بێی ئەم بزانین خوینبەر تەنگ دبن، و بێی بزانین رژێنا ژێرمەژی دلڤیت بەرسینگگرتنا سەرمایێ دکەت، و بێی بزانین رژێنا پەریزادێ ئاستێ دەربرینا خۆراکی بلند دکەت، و بێی بزانین چەندییا شەکرێ د ناڤ خوینێدا زێدە دبیت، و ئەم د ڤەلەرزین، موییێن مە زوق دبن، ئەڤە بۆ هندێیە ئەم بەرسینگگرتنا سەرمایێ بکەین، مەزناهی بۆ وی خودایە یێ ئەم ب باشترین شێوە چێ کرین.

# شوین تبلێن مرۆڤی (بصمات) تۆمار و ناسنامە و ئیمزایە

ئەگەر دو جێمك ژ هێكەكێ چێ ببن، (دو جێمك ژ دو هێكا چێ دبن، و دو جێمك ژ هێكەكێ ژی چێ دبن)، و ئەگەر دو جێمك ژ هێكەكێ چێ ببن، دێ شوین تبلا یێ ئێكێ ژ یێ دویێ جودا بیت، خودێ د پەرتۆكا خۆ یا پیرۆزدا ئاماژە ب ڤێ چەندێ یا كری، خودێ دبێژیت: (أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَلَّنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ (٣) بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ (٤)) [القيامة٤]، (ئانكو، ئەرێ ما مرۆڤ هزر دكەت ئەم نەشێین جارەكا دی هەستیكێت وی لێك بدەین. بەلێ.. ئەم دشێین سەرتلێت وی ژی وەكی بەرێ چێ كەین).

زانا شیان د ڤێ تبلێدا سەد نیشانان ئاشكرا بكەن، و ئەگەر دوازدە نیشان وەكی ئێك بن ل دو تبلا دێ بنە یێن كەسەكی، بەلكی دو شوین تبل وەكی ئێك بن ب هلكەتن (صدفە)، ئێك ژ شێست و چار ملیاران، ئانكو ئەگەر هژمارا مرۆڤێن عەردی ببیتە شێست و چار ملیار، ب تنێ (ئیحتیمالەك) یا هەی، كو دو شوین تبل بهێن وەكی ئێك، وەكی دهێتە زانین كو هژمارا مرۆڤان ل سەر عەردی ب تنێ شەش ملیارن.

تشتەكێ دی.. سەرێ تبلێ شێوەكێ تایبەت یێ هەی، كڤانێن تێدا، جهێن چەمیای، و خواراتی، و گۆشە، و هێل، و چال، ل هندەك پەیمانگەهێن نوژداری شوین تبلەك ئینا، بەراورد كر د گەل پازدە هزار شوین تبلێن دی، چو ژ وان وەكی ئێك نەدەركەفتن، و د حەفت خالاندا ژی وەكی ئێك نەدەركەفتن.

هێژ زارۆك د زكێ دایكا خۆدا و د هەیڤا شەشێدا شوین تبلا وی دورست دبیت، و د مینیت هەتا مرنێ، و ئەگەر ڤێ پارچا گۆشتی یا شوین تبلێ ب هەمیڤە ژێڤەكەن، دێ

گۆشتەكێ نوی دەتەڤە كو شوین تبل ل سەر بیت، و ئەگەر نشتەگەرییەكێ بۆ كەسەكی بكەن، و ب هەمیڤە شوین تبلا وی ژێڤەكەن، و پیستەكی ل جهەكێ دی یێ لەشی بینن دانە جهێ شوین تبلا وی، پشتی چەند هەیڤەكا جارەكا دی دێ نیشان و سیمایێن شوین تبلێ شین بنەڤە ل سەر ڤی گۆشتێ نوی.

شوین تبل، تۆمارە، و ناسنامەیە، و ئیمزایەكە ژ چێكرنا خودێیە، چو هێزێن مرۆڤان نەشێن ژێ ببەن.

هندەك گونەهباران نشتەرگەری ل سەر شوین تبلێن خۆ كرن، و پیستەكێ دی ل جهەكێ دی ئینا و لێ دانا، پشتی هندەك هەیڤان جارەكا دی شوین تبلێن وان چێ بوونەڤە، ئەڤە ئیمزایەكا خوداییە دایە مرۆڤی، چو هێزێن مرۆڤان نەشێن ژێ ببەن.

دەمێ خودێ ل رۆژا قیامەتێ مە ساخ دكەتەڤە، شوین تبلێ یان ڤێ ئیمزایێ، یان ڤان هێلا، و چالا و ڤان گزیرتا و ڤان تایان و لقا دێ جارەكا دی زڤرینیتەڤە وەكی خۆ.. (بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ) [القيامة:٤]،

ئەڤە نیشانەكە ژ نیشانێن خودێ، چاوا ئەڤ شوین تبلە ئافراندییە، و تو هێژ د زكێ دایكا خۆدا؟ و چاوا جارەكا دی خودێ دێ نیشان و سیمایێن وێ زڤرینیتەڤە دەمێ ئەو مە رادكەتەڤە پشتی مرنێ؟

زێدەباری ڤێ چەندێ ل ڤی دویماهییێ ناسنامەیەكا مرۆڤی یا نوی هاتییە ئاشكراكرن ئەوژی رەشكا چاڤییە (ئەو پارچا رەنگا و رەنگ ژ رەشكا چاڤی)، ئەو ب رەنگەكێ مەزن جودایە ژ كەسەكی بۆ ئێكێ دی كو دئێتە بەرانبەر شوین تبلێ بۆ دیاركرنا ناسناماەیا كەسی.

# پشکا دووێ
# زانستێ دەروونی یێ ئیسلامی

1- زانستێ دەروونی یێ ئیسلامی

2- بێهیڤیبوون و دوورپیاتی و پویچبوون د زانستێ دەروونی یێ ئیسلامیدا

3- کارتێکرنا کەیفخۆشییێ و خەمێ ل سەر دەروونی

4- رەنگێ کەسك

5- پەیوەندییا تۆرەییێ ب ساخلەمییێڤە

# زانستێ دەروونی یێ ئیسلامی

ئەم دشێن بێژین زانستێ دەروونی زانستەکێ نوییە، ل سەر سروشتێ دەروونی دئاخڤیت، و ل سەر یاسایێن وێ، و ل سەر کێماسیێن وێ، و ل سەر گەربێ، و ل سەر پالدەران، و پێدڤییان، و ل سەر کاودانێن دەروونی د هێز و لاوازیا وێدا، و د بلندیا وێدا، و د داکەڤتنا وێدا، و چ ئەم خۆ غافل کەین یان خۆ سەرڤە ببەین ژ هندێ کو قورئانا پیرۆز زانستێ دەروونی یێ تێدا ژ لایێ ئافرێنەریڤە (جل و علا).

بەهرا پتر تێگەهێن زانستێ دەروونی، و هەمی یاسایێن زانستێ دەروونی، د قورئانێدا ب هەر شێوەکێ یێن تێدا هاتین.

و ژ وان بابەتێن د پەرتۆکا (زانستێ دەروونی یێ ئیسلامی)دا هاتین، بابەتەك ل سەر جۆرێن دەروونان دئاخڤت، ئەڤی دەربرین ژ نموونێن مرۆڤایەتییێ دکر، کو نموونێن دوبارەکری خودێ یێن سالۆخەتکرین، ژ بەر کو خودێ جۆرێن نەفسا یێن دیار کرین، ژ وان ژی دەروونێ ئارام، و دەروونێ لۆمەکار، و دەروونێ پاقژ، و گەلەك ئایەت یێن هەین سالۆخەتا ڤان نموونان دکەن، خودێ دبێژیت: (يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي (٣٠)) [الفجر]، (ئانکو، (د وێ رۆژێدا (رۆژا حسابێ) دێ ئێتە گۆتن:) هەی نەفسا ب باوەری و ئێمن و رەحەت و پشت راست. ب بال خودایێ خۆڤە بزڤرە، قایل و رازی ب بارا خۆ، سەرباری رازیبوونا خودێ ژ تە. ڤێجا خۆ بدە د گەل بەندەییێت من. و هەرە د بەحەشتتا مندا).

دەروونێ ئێمن و رەحەت، ئەوە یا خودایێ خۆ دنیاسیت، و ب وی رەحەت دبیت؛ رەحەت و ئێمن دبیت ب ناڤ و سالۆخەتێن وی یێن بلند، رەحەت دبیت بۆ سۆز و ژڤانێ وی، رەحەت دبیت بۆ بەحەشتا وی، رەحەت دبیت بۆ ئێکتاپەرێسیا وی، رەحەت دبیت بۆ هندێ کو چو خودا نینن ژ بلی وی.

دەروونەکێ دی یێ هەی ئەو ژی دەروونێ پاقژە ژ هەمی پیساتییان، و ژ هەمی عەیبان، و ژ هەمی سالۆخەتێت بێ بها، دەروونێ پاقژ ئەو تشتێ ل سەر وی ددەت، و وەردگریت بێی هاڤێتن، بێی سەرداچۆن، بێی زێدەگاڤی، بێی ستەمێ بکەت، خودێ دبێژیت: (أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا (٧٤)) [الكهف]، (ئانکو، ئەرێ تە چاوا مرۆڤەکێ پاقژ و بێ گونەهـ و نە د بەر کەسێدا کوشت؟!). و دیسا دبێژیت: (وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا (١٠)) [الشمس]، (ئانکو، و سویند ب نەفسێ، و یێ نەفس بێ کێم و کاسی چێ کری و دای. و پاشی فەنجی و خرابی نیشا دای. ب ڕاستی هەر کەسێ ئەو نەفس ژ گونەهان پاقژ کر سەرفرازە (ڕۆژا قیامەتێ)).

و نەفسا پاقژ، دەمێ دبێژن فلا کەس یێ پاقژە، ئانکو: یێ پاقژە، نەڤیانێ ناهەلگریت، و زکرەشییێ ناکەت، و زێدەگاڤییێ ناکەت، و ستەمێ ژی ناکەت، و ژ سنوورێن خۆ دەرباز نابیت، یێ ب دانە، و باشە، حەژ ئاشتییێ دکەت، دژمنکاری نەڤێت، حەژ زێدەگاڤی و ستەمێ ناکەت، ئەڤ نەفسا پاقژ بەحسێ وێ یێ د گەلەك ئایەتاندا هاتی.

ئەو دەروونێ خودێ پەسنا وی کری، دەروونێ گشت باوەردارانە، ئەو ژی دەروونێ لۆمەکارێ خۆیە، خودێ دبێژیت: (لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ (١) وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ (٢)) [القيامة]، (ئانکو: سویندێ ب ڕۆژا ڕابوونێ و دویماهییێ. و سویند ب نەفسا خێرخواز و زێدە لۆمەکاری خۆ (لۆمەی خۆ دکەت ل سەر خەلەتییێ، کا بۆچی کر، و ل سەر باشییێ کا بۆچی نەکر).

ئەڤە ئەو دەروونە یێ کو هەر پەیڤەکێ دبێژیت سەح دکەتێ، و حسێبا دەروونێ خۆ ل سەر دکەت، کا ئەرێ چێ دبیت ئەز ڤێ پەیڤێ بێژم؟ چێ دبیت غەیبەت بیت، یان چێ دبیت فەسادی بیت، چێ دبیت خودێ پێ نەرازی و عێجز بیت، زار ئەبی هورەیرە گۆت پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((وَإِنَّ الرَجُلَ لَيَتَكَلَّمَ بالكَلِمَةِ لا يَرَى بهَا بأساً يَهْوي بهَا سَبْعِينَ

خرِيفاً فِي النّارِ))[1]. (ئانكو، زەلام دێ ئاخفتنەكێ بێژیت ب چوڤە ومرناگریت، حەفتێ سالان دێ وی د جەهنەمەدێدا بەتە خوارێ).

ئەڤ دەروونێ لۆمەكارێ خۆ، دەروونەكە خودێ پەسنا وی یا كری، دڤێت مرۆڤێ باوەردار لۆمەكارێ دەروونێ خۆ بیت، بەردەوام پسیارا دەروونێ خۆ بكەت، حسێبەكا ب زەحمەت و توند د گەل نەفسا خۆ بكەت ل دنیایێ، حەتا حسێبا وی ل رۆژا قیامەتێ یا ب سناهی بیت، حسێبا نەفسا خۆ دكەت ل سەر دەرهەمەكی، زێدەباری دیناری، حسێبا نەفسا خۆ دكەت ل سەر دیتنەكێ، و حسێبا نەفسا خۆ دكەت ل سەر پەیڤەكێ، حسێبا نەفسا خۆ دكەت ل سەر هەر دژمنەكێ ورەیی (معنوي) یان ماددی ل سەر مافێن مرۆڤی، ئەڤ نەفسا لۆمەكاری خۆ نموونەكا دییە د قورئانا پیرۆزدا هاتی.

نەفسەكا هەی یا زكرەشە.. ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ﴾ [البقرة:١٠٩]، (ئانكو، گەلەك ژ خودان كتێبان (جوهی و فەلەیان) ژ زكرەشی پێ خۆشە (و دخوازن) پشتی باوەری ئینان و موسلمانبوونا هەوە، هەوە ڤەگەریننەڤە سەر گاورییێ)، ئەو نەفسە یا دویری خودێ، و یا ڤەقەتیایە ژ وی، ئەوا كەفتییە د هەڤپشكییا نهێنیدا زكرەشییێ ب خەلكی دبەت.

نەفسەكا هەی یا گونەهكارە دكەڤیتە د وان تشتێن خودێ حەرام كری، خودێ دبێژیت: ﴿وَمَنْ يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ﴾ [النساء]، (ئانكو، هەر كەسێ گونەهەكێ بكەت، زیانێ ل خۆ دكەت).

و نەفسا زێدە خرابیخواز، خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي﴾ [یوسف:٥٣]، (ئانكو، ب ڕاستی نەفس زێدە خرابیخوازە، ئەو (نەفس) تێ نەبیت یا خودێ دلۆڤانی پێ بری و پاراستی).

نەفسەكا دی یا هەی یا ستەمكارە، و نەفسا خاپینەر، و نەفسا ڤەدەر (شاذ)، و نەفسا خۆمەزنكەر، و نەفسا قەلس.

---

(١) ترمزی (٢٣١٤)، و د ریوایەتا بوخاریدا و ئاخفتن یا وییە (٦١١٢) و موسلم (٢٩٨٨): ((ان العبد ليتكلم بالكلمة ما تبين فيها، يزل بها في النار أبعد مما بين المشرق)).

دەمێ باوەردار قورئانێ دخوینیت، و ئەڤ سالۆخەتە بۆ نەفسێن مرۆڤان هاتن، ئەڤێ پسیارا گرنگ ژ خۆ بکەت: ئەز کیژ ژ ڤان نموونێن نەفسامە؟ ژ یا رەحەت و ئێمن، یان یا پاقژ، یان یا لۆمەکارا خۆ، یان ژ زکرڕەشا، یان یا گونەهکار، یان ژ نەفسا زێدە خرابیخواز، یان یا ستەمکار، یان یا خاپینەر، یان یا خۆمەزنکەر، یان ژی یا قەلس؟ بابەتەکە ژ بابەتێن زانستێ دەروونی بۆ تە نموونێن مرۆڤی سالۆخەت دکەت، کو دهێنە دوبارەکرن ل هەمی دەما، و ل هەمی جها.

حافز موحەمەد کورێ (نصر)ێ مروزی د پشکا ڕابوونا شەڤێدا دبێژیت، زار ئەحنەفێ کورێ قەیسی: (رۆژەکێ یێ روینشتی بوو ئەڤ ئایەتە کەڤتە بەر چاڤێن وی: (لَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (١٠)) [الأنبياء]، (ئانکو: ب سویند (گەلی گاوران) مە کتێبەك بۆ هەوە ئینایییە خوارێ، سەربلندییا هەوە یا تێدا، ئەرێ ما هوین تێ ناگەهن؟). ل سەر ڕاوەستا و گۆت: پێدڤییە ئەز د قورئانێدا لێ بگەرم، کا ئەز کیمە، و ئەز وەکی کێمە؟.

پشتی وی زانی کو قورئانێ هەمی سالۆخەتێن مرۆڤان یێن بەحس کرین، و تەخ و پلەیێن وان یێن دیارکرین، وی ڤیا دویڤچۆنا خۆ بکەت، کا ئەو ژ کیژ تەخایە؟ و ژ کیژ پلەیانە؟ و بەرپەرێن قورئانێ ڤەدان، و خواند و گەهشتە سالۆخەتێ جوینەکا مرۆڤان: (كَانُوا قَلِيلًا مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ (١٧) وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ (١٨)) [الذاريات]، (ئانکو: ئەو (تەقوادار) پیچەك ژ شەڤێ دنڤستن. و ئەو بەرێ سپێدەهییان (خودێ دپەرستن) و داخوازا ژێبرنا گونەهان ژ خودێ دکرن).

و گەهشتە جوینەکا دی: (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ (١٦)) [السجدة]، (ئانکو: قەوی تەنشتێت وان ناکەڤنە سەر نڤینان (ئانکو: کێم دنڤن، و ڕادبن شەڤنڤێژان دکەن)، و ب ترس و هیڤیڤە دوعایان ژ خودێ دکەن، و ڕزقێ مە داییە وان خێر و سەدەقەیان ژێ ددەن).

و گەهشتە جوینەکا دی: (الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣٤)) [آل عمران]، (ئانکو: (ئەو پارێزکارێت) د

بەرفرەهی و تەنگاڤییێدا (د دەولەمەندی و دەستکورتییێدا) مالێ خۆ دمەزێخن، و کەربا خۆ دادعویرن و ڤەدشێرن (ستەمێ ژ کەرباندا ل کەسێ ناکەن) و د ڕاستا خۆدا خەلکی ئازا دکەن، و خودێ حەژ ڤەنجیکاران دکەت).

و گەهشتە جوینەکا دی: (وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩)) [الحشر]، (ئانکو: ئەوێت بەرێ ل مەدینەیێ ئاکنجی، و باوەری ئینایین بەری مشەخت بچنە مەدینەیێ، ئەو حەژ وان مشەختییان دکەن ئەوێت قەستا وان کرین، و چو کەرب و دلڕەشییێ د دلێت خۆدا نابینن بەرانبەری مشەختان، ژ بەر مالێ پێغەمبەری داییە وان مشەختان، و ئەو وان ب پێش خۆ دئێخن و وان ژ خۆ فەرتر ددانن، خۆ چەند د هەوجە و دەست تەنگ ژی بن، و ئەوێت خۆ چرویکییا نەفسا خۆ دپارێزن، ئەون سەرفراز).

ل ڤێرە ئەحنەف ڕاوەستییا، و پاشی گۆت: خودایێ من، من ل ڤێرە (ئانکو د ڤان ئایەتاندا) نەفسا خۆ نەنیاسی، ئانکو: من ئەڤ سالۆخەتە د خۆدا نەدیتن، هەتا کو ئەز خۆ بهەژمێرم ژ ڤان کەسان، پاشی ئەحنەفی ڕێکا بەروڤاژی گرت (ئانکو: ل وان ئایەتان گەریا یێن بەحسێ خرابکاران دکەن)، گەهشتە جوینەکا دی: (إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ (٣٥)) [الصافات]، (ئانکو: هەر وەختێ دگۆتە وان: ژ بلی خودێ چو پەرستی نینن هێژایی پەرستنێ بن، وان خۆ مەزن دکر (و باوەری نەدئینان).

و گەهشتە جوینەکا دی کو پسیار ژ وان دهاتنە کرن: (مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ (٤٢) قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ (٤٣) وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ (٤٤) وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ (٤٥) وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ (٤٦) حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ (٤٧) فَمَا تَنْفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ (٤٨) [المدثر]، (ئانکو: (دبێژنە گونەهکاران): چ هوین کرنە د (ڤێ) دۆژەهێدا. (گونەهکار) دێ بێژیت: مە نڤێژ بۆ خودایێ خۆ نەدکرن. و مە نان نەددا فەقیر و ژاران. مە ژی وەکی خەلکی خۆ دهاڤێتە هەمی کاران. چ باش چ خراب. و مە د دنیاییێدا باوەری ب

**رۆژا جزادانێ نەدئینا. و ئەم د هۆسا بووین، هەتا مرن ب سەر مەدا هاتی. مەهدەرا مەهدەرچییان چو مفایی ناگەهینیتە وان.**

**ل ڤێرە ئەحنەف راوەستا و گۆت: خودایێ من، ئەز خۆ ب تە ژ ڤان کەسان دپارێزم، و هێژ ئەحنەفی پەرێن قورئانێ ڤەددان و یێ بەردەوام بوو، وی بەرێ خۆ ددایێ کا ئەو ژ کیژ تەخ و جوینایە، هەتا گەهشتییە ڤێ ئایەتێ: (وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٠٢)) [التوبة]، (ئانکو، هندەکێت دی ژ خەلکێ مەدینەیێ (ژ وان بوون ئەوێت ژ تەبووکێ ڤەمایین) گونەهێت خۆ ل سەر خۆ ئاشکەرا کرن، کارێ خۆ یێ چاك (جیهادا خۆ یا بەری تەبووکێ) و هندەکێ دی یێ خراب (ڤەمانا خۆ ژ تەبووکێ) تێکەل کرن، بەلکی خودێ تۆبەیا وان قەبویل بکەت، ب ڕاستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە). ئینا گۆت: ئەز ژ ڤان کەسامە).**

# بێهیڤیبوون، و دوڕوییاتی، و پویچبوون د زانستێ دەروونی یێ ئیسلامیدا

زانستێ دەروونی یێ ئیسلامی، زانستەکێ بنەجهێ مەزنە، ئانکو پەیوەندییێن وی د جێهگرن، و بنەما و یاسایێن وی، ئەو زانستێ دەروونییە، و تو نەفسی ئەڤێ د ناڤبەرا دو رەخێن تە، کو خۆیەتییا تەیە، کو ئەو هەر یا زێندییە و نامریت، ئەوە یا بلند دبیت، و ئەوە یا کو خراب و پیس دبیت، زانستێ دەروونی یێ ئیسلامی، ئانکو ئەو راستییێن نەفسێ یێن هاتینە وەرگرتن ژ کتێبا خودێ (قورئان) و سوننەتا پێغەمبەرێ وی ﷺ.

دەمێ مرۆڤ ب خودێڤە دهێتە گرێدان مرۆڤی خۆیەتییا خۆ زانی، و راستییا خۆرسکییا (فطرة) خۆ، و دەمێ ئەڤ پەیوەندییە د گەل خودێ هاتە برین، هەر وەکی زانایێن دەروونی و نوژدارێن دەروونی دبێژنێ: تێکچۆنێن دەروونی. تێکچۆنێن دەروونی یێن جودا جودا چێ دبن، ژ وان بێ هیڤیاتییە (اليأس)، خودێ دبێژیت: (وَلَئِنْ أَذَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ (٩)) [هود]، (ئانکو: ئەگەر ئەم ژ رەحمێ خۆڤە نیعمەت و دلۆڤانییەکێ بگەهینینە مرۆڤی پاشی مە ڤەگرت، ئەو (ژ دلۆڤانییا مە) زوی بێ هیڤی دبیت، و ئەو ڤەنجییێت بەرێ، مە د گەل کرین ژ بیرا خۆ دبەت)، و خودێ دبێژت: (وَإِذَا أَنْعَمْنَا عَلَى الْإِنْسَانِ أَعْرَضَ وَنَأَى بِجَانِبِهِ وَإِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ كَانَ يَئُوسًا (٨٣)) [الاسراء]، (ئانکو: هەر وەختەکێ مە کەرەم و نیعمەت د گەل مرۆڤی کر، ڕوییێ خۆ وەرگێڕا (ژ بیرئینان و سوپاسییا خودێ)، و ژ مەزناتی خۆ (ژ مە) دویرئێخست، و هەر وەختێ نەخۆشییەکێ هنگاڤت گەلەك بێ هیڤی دبیت).

و بێهیڤیاتی تێکچۆنەکا دەروونییە، ئەگەرێ وێ ڤەقەتیانە ژ خودێ، چونکی نەبوونا باوەرییا ب خودێ، یان ژێ ڤەقەتیان ژ خودێ دێ تووشی تێکچۆنێن دەروونی بیت، بەلێ مرۆڤێ باوەردار یێ گەشبینە، و ئەو باوەری ب خۆبوونا ل دەڤ پەیدا بووی ئەوا ل پال

خودێ، و یا هاتییە گۆتن: ((ئەگەر تە بڤێت ببییە ب هێزترین مرۆڤ پشتا خۆ ب خودێڤە گرێدە، و ئەگەر تە بڤێت ببییە زەنگینترین مرۆڤ، دێ ب وی تشتی رازی بی یێ خودێ کرییە د دەستێن تەدا، و ئەگەر تە بڤێت ب قەدرترین (رویمەتترین) مرۆڤ بی، تەقوا خودێ بکە)).

زانایێن دەروونی یێن ئیسلامی دوڕیاتییێ دهژمێرن تێکچۆنەکا دەروونی، کو ئەگەرێ وێ هەڤپشکییە، دەمێ مرۆڤ هەڤپشکەکی بۆ خودێ چێ دکەت، و هزر دکەت کو د گەل خودێ خودایەکێ دی یێ هەی، چارەنڤیسێ وی یێ د دەستێ ویدا، و د گەل ڤێ چەندێ زیانبەخشینا وی و مفاگەهاندنا وی ژی یا د دەستیدا، دەمێ دیتنا وی ئەڤە بیت، ژ ئەنجامێن خەلەتییا ڤێ باوەرییێ: تێکچۆنا دەروونیە، ئەو ژی دوروویاتییە.

خودێ دبێژیت: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨) يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩)) [البقرة]، (ئانکو: هندەك هەنە ژ خەلکی دبێژن: مە باوەری ب خودێ و رۆژا ئاخرەتێ (دویماهییێ) هەیە، بەلێ ب ڕاستی ئەو ب خۆ بێ باوەرن. دڤێن خودێ و خودان باوەران بخاپینن، و ژ خۆ پێڤەتر کەسێ ناخاپینن و پێ نوزانن ژی).

دوروییاتی دیاردەکا نەخۆشییێیە، دورویياتی تێکچۆنا دەروونییە، کو ئەگەرێ وێ هەڤپشکییە.

پویچبوون (ألاحباط)، دەمێ مرۆڤ هیڤییێن خۆ ب ژ بلی خودێڤە گرێ ددەت، پاشی دبینیت ڤی تشتی چو بۆ نینە، و ئارمانجا وی بجھ نەهات، دێ تووشی نەخۆشییەکا دەروونی یا گەلەك ب ئێش بیت، ئەو ژی پویچبوونە، خودێ دبێژیت: (وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٦٥)) [الزمر: ٦٥]، (ئانکو: ب سویند وەحی بۆ تە و بۆ پێغەمبەرێت بەری تە یێ هاتی، ئەگەر تو هەڤپشکان بۆ خودێ چێ کەی دێ کار و کریارێت تە پویچ بن، و دێ ببیە ژ وان ئەوێت خوسارەت).

شرۆڤەکرنەکا دی بۆ پویچبوونێ؛ ئەوە تو هزرکەی تشتەك گەلەکێ مەزنە، و تو پەسەند بکەی، و ژ بەر ڤی تشتی تو گەنجاتییا خۆ و پیراتییا خۆ ژ دەست بدەی، پاشی بۆ تە ئاشکرا ببیت پشتی کو ژ دەستا دچیت، ئەو تشت چو نەبوو، و ئەو بەختەوەرییێ نادەت.

ژ وان جۆرێن تێکچۆنا دەروونی یێن ژ ئەنجامێ لاوازییا باوەرییێ دورست دبن، و ژ لاوازییا پەیوەندییا ب خودێڤە، ئەڤا دبێژنێ: هەڤڕکییا بەردەوام، دەمێ هەڤڕکی بەردەوام دبیت دهێتە گوهۆرین بۆ نەپویتەدانێ، و ئەڤە نەخۆشییەکە ژ نەخۆشییێن ڤی سەردەمی، کو هەڤڕکییەکە د ناڤبەرا راستی و نەحەقییێدا، هەڤڕکییەکە د ناڤبەرا پێدڤییێ و داب و نەریتان، هەڤڕکییەکە د ناڤبەرا دنیا و ئاخرەتێدا، هەڤڕکییەکە د ناڤبەرا عەقلی و شەهوەتێدا، و د گەل نەبوونا باوەرییێ، مرۆڤ دێ بیتە قوربانی ڤێ هەڤڕکییێ، خودێ دبێژیت: (مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لَا إِلَى هَؤُلَاءِ وَلَا إِلَى هَؤُلَاءِ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا (١٤٣)) [النساء]، (ئانکو: ئەو (دوڕوی د ناڤبەرا موسلمان و گاوراندا یێت ماین) نە ژ وانن و نە ژ وان، و ب ڕاستی ئەوێ خودێ بەرزەکر، تو چو ڕێکان بۆ نابینی ڤەگەریتەڤە).

داماییبوون ـ کو ئەڤە نەخۆشییا ڤی سەردەمییە ـ چونکی هژمارا وان کەسێن چارەسەرییا دەروونی وەردگرن د کلینیکێن دەروونیدا د جڤاکێن ژ خودێ دویر گەلەکن، و هندەك نوژدارێن دەروونی چارەسەرییا خۆ ژ لایێ هەڤالێن خۆڤە دکەن، داماییبوون یان غەمگینبوون نەخۆشییا سەردەمییە، ئەگەرێ وێ ئەوە دەمێ خۆرسکییا مرۆڤی یا ساخلەم، هەر دەما ژ ڤێ ساخلەمییێ دەرکەڤتن دێ خۆرسکییا وان وانا ئێزا دەت و دێ داماییبوون ل دەڤ پەیدا بیت، ئەڤەیە زانا دبێژنێ: هەستکرن ب گونەهێ، و گرێکا کێماسی، یان داماییبوون، خودێ دبێژت: (وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا) [طه:١٢٤]، (ئانکو: هەر کەسێ ڕوییێ خۆ ژ من و کتێبا من (کو قورئانە) وەرگێڕیت (و باوەرییێ پێ نەئینیت)، ب ڕاستی د ڤێ دنیایێدا بارا وی ژیانەکا تەنگ و تارییە).

**دەمێ مە باوەری ب خودێ هەبیت، دێ د کاودانەکیدا ژین دبێژنێ: ساخلەمییا دەروونی، نەفسەکا رازی، نەفسەکا هێمن و رەحەت، نەفسەکا گەشبین، نەفسەکا هەڤسەنگ، ئەڤ هەمی سالۆخەتێن بەرز و بلند ژ بەرهەمێ باوەرییێنە.**

# كارتێكرنا كەیفخۆشییێ و خەمێ ل سەر دەروونی

ئەو تشتێ دیتنا مرۆڤی د گۆتنا خودێدا رادكێشیت: (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢) لِكَيْ لَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (٢٣)) [الحديد]، (ئانكو: نینە تشتەك د ئەردیدا بقەومیت یان بێتە سەرێ هەوە، و د دەپێ پاراستیدا یێ نڤێسی نەبیت ـ بەری ئەم بدەین ـ و ب ڕاستی ئەڤە ل بەر خودێ یا ب ساناهییە. دا ب خەم نەكەڤن بۆ یا ژ دەستێ هەوە چۆیی، و دا بەتران نەبن ب یا خودێ دایە هەوە، و خودێ حەژ چو خۆمەزنكەرێت قەبە ناكەت).

ئەڤ هەردو ئایەتە ئاماژێ ددەن، و نەخاسمە د یا دوویێدا ئەو ژی دەمێ خەما مرۆڤی زێدە دبیت یان كەیفخۆشییا مرۆڤی زێدە دبیت دلێ وی ڤێ چەندێ راناگریت، نە ئەڤێ و نە یا دی، و ئەو تشتێ پێدڤی كو خەما مرۆڤی یا پەسەند و ساخلەم بیت ئەوە هەمی كار و كریار ژ دەڤ خودێنە، و ئێكتاپەرێسییێ بكەن، و دەمێ ژ وان كەسێن ئێكتاپەرێسییێ بوو دێ نەخۆشی ل سەر سڤك بن، و دەمێ ئێكتاپەرێس بیت دێ كەیفخۆشی ل سەر وی نەرم و خۆش بن، ژ بەر كو هندەك جاران كەیفخۆشییان ژی ڤێككەڤتنەكا دەروونی چێ دبیت وەكی كا چاوا د خەماندا چێ دبن، چەند هەژاران مالەكێ مەزن بۆ مایە و گیانێ خۆ یێ ژ دەست دای؟ چونكی خۆ ل بەر وی دەنگ و باسی نەگرت، و خودایێ مە دبێژیت: (لِكَيْ لَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ) [الحديد: ٢٣]، ئانكو دەمێ تو یێ ئێكتاپەرێس بی، و بەرێخۆدانا تە بۆ كاروباران ئەو بیت كو هەمی ئەڤ كاروبارە ژ دەڤ خودێنە، دێ بارێ خەما سڤك بیت ل سەر دلێ مرۆڤی، و توندییا كەیفخۆشییان ژی دێ سڤك بیت، زار عەبدوللایێ كورێ مەسعودی

گۆت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((مَا أَصَابَ أَحَدًا قَطُّ هَمٌّ وَلا حَزَنٌ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ، ابْنُ عَبْدِكَ، ابْنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ نُورَ صَدْرِي، وَرَبِيعَ قَلْبِي، وَجَلاءَ حُزْنِي، وَذِهَابَ هَمِّي، إِلاَّ أَذْهَبَ اللهُ هَمَّهُ وَحُزْنَهُ، وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَحاً)) قَالَ: فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلا نَتَعَلَّمُهَا؟ فَقَالَ: ((بَلَى، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهَا أَنْ يَتَعَلَّمَهَا))[1]، (ئانكو: نینە کەسەکی ژ هەوە دلتەنگییەك یان خەمەك بگەهیتێ و بێژیت: ئەی خودایێ من ئەز بەندەیێ تەمە، و کورێ بەندیێ تەمە، و کورێ بەندەیا تەمە، وئەز یێ دبن حوکمێ تەدا، و ئەمرێ من یێ د دەستێ تەدا، حوکمێ تە ل سەر من یێ ب جه هاتی، و یێ دادپەروەری د حوکمێ خۆدا، داخوازێ ژ تە دکەم ب هەمی وان ناڤێن تە بۆ خۆ داناین، یان تە د پەرتۆکا خۆدا یا ئیناین، یان تە نیشا ئافراندییەکێ خۆ داین، یان تە د زانستێ نەپەنیدا ل دەڤ خۆ هەلگرتی، تو قورئانێ بکەیە رۆناهی د سینگێ مندا، و بکەیە بهارا دلێ من، و خەما من ڤەرەڤینی)، دێ خودێ خەم و خەمگینییا وی بەت، و دێ ب کەیفخۆشییەکێ گوهۆریت. گۆت: گۆتێ: هەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ ئەم خۆ فێری وێ نەکەین؟ ئینا گۆت: ((بەلێ، پێدڤییە ئەوێ گوه لێ دبیت خۆ فێر بکەت)).

و پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((مَنْ أَلْبَسَهُ اللهُ نِعْمَةً فَلْيُكْثِرْ مِنَ الْحَمْدِ للهِ، وَمَنْ كَثُرَتْ ذُنُوبُهُ فَلْيَسْتَغْفِرِ اللهَ، وَمَنْ أَبْطَأَ عَنْهُ رِزْقُهُ فَلْيُكْثِرْ مِنْ قَوْلِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ))[2]. (ئانکو: ئەوێ خودێ نیعمەتەك داییێ بلا گەلەك حەمدا خودێ بکەت، و ئەوێ گونەهێن وی زۆر بن بلا داخوازا ژێبرنێ ژ خودێ بکەت، و ئەوێ رزقێ وی ژ وی گیرۆ بوو بلا گەلەك بێژیت: (لا حول ولا قوة الا بالله).

---

(١) ئەحمەد (٣٧١٢) و ئەبو یەعلا (٥٢٩٧) و ئبن حیبان (٩٧٢) و ئەلحاکم (٥٠٩٩/١) و مجمع الفوائد (١٨٦/١٠).

(٢) تەبەرانی یا ڤەگوهاستی د (المعجم الصغیر)دا (٩٦٥) زار ئەبی هورەیرە.

و (ابن عباس) خودێ ژێ رازی بیت دبێژیت ـ ئەڤە ئاخڤتنەکا گەلەکا هویربینە ـ (نینە کەس ژ مە ب کەیف و خەم نەکەڤیت، بەلێ ئەوێ نەخۆشییەك بۆ دورست دبیت بکەتە بێنفرەیی، و یێ خۆشییەك بۆ دورست دبیت بکەتە شوکر[1]).

و ژ سەیرترین ئاماران: ل هندەك وەلاتێن رۆژئاڤا د ماوێ جەنگا جیهانی یا دوویێدا دو ملیۆن ژ خەلکێ وان وەلاتان مرن ژ بەر توندییا دەروونی، و د مەیدانا شەریدا سێکا ملیۆنێ مرن، ل ڤێرە: توندییا دەروونی بێی ئێکتاپەرێسی، بێی باوەری، کارەکێ مەترسی ل مرۆڤی دکەت، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢)) [الحديد].

یێ دنیا نیاسی بۆ بەرفرەهی و خۆشییێ کەیفخۆش نابیت، و بۆ بەرتەنگی و هەژارییێ ب خەم ناکەڤیت، خودێ دنیا یا کرییە مالا تاڤیکرنێ، و ئاخرەت یا کرییە مالا خەلات و سزایی، و تاڤیکرنا دنیایێ ئەگەرەکە بۆ دان و بەرهەمێ وێ ل رۆژا ئاخرەتێ، و دانا ئاخرەتێ ژ تاڤیکرنا دنیایێ قەرەبووکرنەکە، و هۆسا دان بەرامبەر وەرگتنێیە، و تاڤیکرن هەمبەر خەلاتییە.

---

(١) بەیهەقی د (شعب الایمان)دا (٩٧٧١) زار عەکریمەی ژ ئیبن عەباسی.

# رەنگێ کەسك

د قورئانا پیرۆزدا رەنگێ کەسك د هندەك ئایەتاندا هاتییە، خودێ دبێژیت: (مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ (٧٦) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٧٧)) [الرحمن]، (ئانکو: پالا وان (بەحەشتییان) یا ل بالیفکێت کەسك، و مەحفویرێت جوان و ب ڕویشی. ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن).

و د ئایەتەکا دیدا: (عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُنْدُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِنْ فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا) [الانسان:٢١]، (ئانکو: جلکێت ب خەمل و کەسك ل بەر وانە، ژ ئارمویشێ تەنك و ستویر، و بازنێت زێری دکەنە دەستێت خۆ، و خودایێ وان ڤەخوارنەکا زەلال و پاقژ دێ دەتە وان).

و د ئایەتا سێیێدا: (أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِنْ سُنْدُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا (٣١)) [الكهف]، (ئانکو: ئەڤان بەحەشتێت ئاکنجیبوونێ بۆ وانن، کو ڕویبار د بنڕا دئێنە خەملاندنێ، و جلکێت کەسکێت ئارمویشێ تەنك و ستویر دێ کەنە بەر خۆ، و پالداینە ل سەر تەختێت چارچەڤکری، چ خەلاتەکێ باشە و چ خۆش جهە لێ خۆجهـ و ئاکنجی).

زانایێن دەروونی چ دبێژن ل دۆر پەیوەندییا مرۆڤان ب رەنگانڤە؟ دبێژن: کارتێکرنا رەنگان ل سەر مرۆڤان کارتێکرنەکا کویرە، بەلکو چێ دبیت رەنگ کارتێکرنێ د پێشداچۆن و راوەستاندنا مەدا بکەت، چێ دبیت ئەم هەست ب گەرمییێ بکەین، یان هەست ب سەرمایێ بکەین، چێ دبیت هەست ب خۆشییێ یان ب دامایيبوونێ بکەین، رەنگی کارتێکرنەکا مەزن یا هەی، بەلکو چێ دبیت کارتێکرنا رەنگان د کەسایەتییا مرۆڤیدا ژی هەبیت، و دیتنا مرۆڤی بۆ ژیانێ.

زانا دبێژن: ((رەنگێ سۆرێ تاری، ژ بەر درێژاهییا پێلا وی، چالاکییێ د کۆئەندامێ دەماریدا دورست دکەت، و ئەگەر تە بڤێت ریکلامەکا پێش چاڤ و کاریگەر بکەی د رێکێن گشتیدا، ل ڤێرە رەنگێ زەر درێژترین پێلێن رەنگانە و گونجایترە، کۆئەندامێ دەماری چالاك دکەت، دێ گەلەك کارتێکرنێ لێ کەت، و رەنگێ سۆرێ تاری (أرجواني) خۆجهییێ نیشا ددەت، و رەنگێ شین ب بەرفرەهبوونێ دهێتە هەستکرن، و هەستکرن ب سەرماییێ، و رەنگێ سۆر و ژێکچێکرنێن وی هەست ب گەرمییێ دهێتە کرن، بەلێ ئەو رەنگێ کەیفخۆشییێ د ناخێ مرۆڤیدا پەیدا دکەت، ئەو ژی رەنگێ کەسکە؛ ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ رەنگێ رووەکی کەسك کرییە، ئەڤ رویبەرێن کەسکێن ئەردی کەیفخۆشییەکێ د ناخیدا پەیدا دکەت)).

ژ بەر ڤێ چەندێ جلکێن کەسك یێن کرینە جلکێن نوژدارێن نشتەگەرییان؛ چونکی مرۆڤێ نەخۆش ئەوێ کو ل بەرە نشتەگەرییێ بۆ بکەن ـ دێ هەست ب خۆشییێ کەت دەمێ ڤی جلکێ کەسك دبینیت.

تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە دەمێ خودێ بەحسێ خەلکێ بەحەشتێ دکەت، و ئەو تشتێن د بەحەشتێدا ژ نیعمەتان، رەنگێ کەسك د ڤان ئایەتاندا یێ هاتی.

# پەیوەندییا تۆڕەبیێ ب ساخلەمییێڤە

تێکئاریانێن توند ـ ب ڕێکێن جودا جودا ـ لێدانێن دلی ب لەز دئێخیت، و هەناسێ، و فشارا خوینێ بلند دبیت، دێ دێمێ مرۆڤی سۆر بیت، و دێ لولەیێن خوینێ یێن ستۆی ستویر بن، و مرۆڤێ تۆڕە لێدانێن دلێ وی بلند دبن کو دگەهنە سەد و شێست لێدانان، و د گەل بلندبوونا فشارا خوینێ، ل ڤێرە مەترسییا هەی بۆ خوین ڕشتنێ د مێشکیدا، و مەهینا خوینێ د مێشکیدا ڕامانا ڤێ فالنجە (شلل)، یان جەلتەکە د دلیدا، یان کۆرەبوونا ژ نیشکەکێڤە.

زانا دبێژن: ((بەهراپتر کاودانێن نەخۆشییا شەکرێ پشتی تۆڕەبوون و تێکئاریانا توند چێ دبن))، چونکی دەمێ مرۆڤ تۆڕە دبیت، ڕژێنا ژێرمەژی ـ کو میرکا ڕژێنایە دێ فەرمانێ ل ڕژێنا ئەدرینالی کەت، دێ فەرمانەکێ دەتە مێلاکێ کو چەندییەکا مەزن ژ شەکرێ باڤێت، و دێ شەکر ژ نیشکەکێڤە د ناڤ خوینێدا زێدە بیت، دێ چڕاتییەکێ د ناڤ خوینێدا دورست کەت، ژ بەر ڤێ چەندێ نەخۆشییا شەکرێ ل دویڤ تێکئاریانەکا گەلەك توند دهێت.

تشتەکێ دی: تۆرەیا توند دکێشیتە بلندبوونا بەزێ خوینێ، و ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ ڕەقبوونا خوینبەران، و ئەڤە ژی دکێشیتە دورستبوونا نەخۆشییان د دلیدا.

و تێکئاریانێن توند لڤینا ڕویڤیکان گیرۆ دکەت، و کەسێ گەلەك تۆڕە، قەڤزبوونەکا بەردەوام یا هەی، و د گەل قەڤزبوونا بەردەوام کویفکیبوونا خوینێ ژی چێ دبیت، و دیسا کولبوون، و چێ دبیت بکێشیتە پەنجەشێرێن ڕویڤیکان.

و مەزنترین مەترسی ئەوە تێکئاریانا توند کۆئەندامێ بەرگرییا لەشێ مرۆڤی لاواز دکەت، و د گەل لاوازییا کۆئەندامێ بەرگرییا لەشی میکرۆب و ورمتنێن پیس ب هێز

دكەڤن؛ ژ بەر ڤێ چەندێ كۆئەندامێ بەرگرییا وەرگر بەرپرسە ژ نەخۆشییێن میكرۆبی و پەنجەشێرێ.

نۆت و نەه ژ سەدێ ژ نەخۆشییێن ئایدزێ پەنجەشێر ژی یا هەی، چونكی دەمێ كارێ ڤی كۆئەندامی ژ دەست دا دێ خانە ب شێوەكێ بەرەلایی گەشێ كەن.

ژ بەر ڤێ چەندێ نەرماتی سەربارێ رەوشتییە، و پێغەمبەری ﷺ ئەم پێن دایە پاش ژ تۆرەبوونێ. ژ زارێ ئەبی هورەیرە خودێ ژێ رازی بیت كو زەلامەكی گۆتە پێغەمبەری ﷺ: أوصِنِي، قالَ: ((لَا تَغضَبْ)) فَرَدَّدَ مِرَاراً، قالَ: ((لا تَغضَبْ))(١)، ئانكو: زەلامەكی گۆتە پێغەمبەری ﷺ من شیرەت بكە و ئەمری ل من بكە. گۆت: كەربێن خۆ نەڤەكە (تورە نەبە) چەند جاران ڤەگێرا، گۆت: كەربێت خۆ نەڤەكە.

نەرماتی رەوشتەكێ گەلەك بلندە، بەلێ ئێكتاپەرێسی بەرێ تە ددەتە نەرماتییێ، و دەمێ تە دیت هەمی فەرمان ب دەستێ خودێنە ـ و كارێن خودێ هەمی ب زانینن، و هەمی تشتێن حەزكرنا خودێ ل سەر بیت دێ بن، و ب حەزكرنا خودێ روی ددەن، و شیانا وی یا گرێدایە ب زانینەكا رەهایی، و زانینا وی یا رەهایی یا گرێدایە ب باشییا رەهایی، ئەڤ تشتێ روی ددەت ب حەزكرنا خودێیە و بێ ب حەزكرنا وی نەبیت روی نادەت ـ ئەڤ ئێكتاپەرێسییە سلامەتی و ئێمنییە، و ئێكتاپەرێسی رەحەتییە، و ئێكتاپەرێسی تەناكرنە، و ئێكتاپەرێسی جهێ باوەرییێیە ب خودێ، و دیسا پاراستن و ساخلەمییە.

خودێ دبێژیت: ﴿الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ (٧٨) وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ (٧٩) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ (٨٠) وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ (٨١) وَالَّذِي أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ (٨٢)﴾ [الشعراء]، (ئانكو: ئەوێ ئەز داییم (ئەوە خودانێ هەمی جیهانان)، و ئەو دێ بەرێ من دەتە رێكا راست (نە بوتێت هوین دپەرێسن)، و ئەوێ خوارن و

---

(١) بوخاری (٥٧٦٥).

ڤەخوارنێ ددەتە من (ئانكو: من ب خوارن و ڤەخوارنا خۆ ساخ دهێليت). و ئەوێ گاڤا ئەز نەساخ بووم، ئەو ساخی و سلامەتيیێ ددەتە من، و من ساخ دكەت. و ئەوێ من دمرينيت، و پاشی پشتی مرنێ من ساخ دكەتەڤە. و ئەوێ ئەز ب هيڤی، كو گونەهێت من رۆژا قيامەتێ و جزادانێ ژێ ببەت).

ئيبراهيم پێغەمبەر ﷺ وەكی خودێ بەحس كری نەگۆت ئەوێ من نەساخ دكەت و من چارەسەر دكەت، بەلكو گۆت: (وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ)، (ئانكو، ئەوێ گاڤا ئەز نەساخ بووم، ئەو ساخی و سلامەتيیێ ددەتە من). نەخۆشی د ڤێ ئايەتێدا يا بۆ مرۆڤی زڤراندی... ژ بەر لاوازيیا ئێكتاپەرێسيیا وی تێك چۆ... ژ بەر لاوازيیا ئێكتاپەرێسيیا وی تێك ئاريا... ژ بەر هەڤپشكيیا وی بۆ خودێ نەڤيان هەلگرت، و نەڤيان و تێكئاريان ئەگەرێ وێ هەڤپشكيیێيە.

# پشکا سیێ

# نڤستن

**١- نڤستنا زوی**

٢- (وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ)

**٣- نڤستن ل سەر کێلەکا راستێ**

**٤- نڤستنا درێژ**

# نڤستنا زوی

ئەویٚ پەرتۆکا خودیٚ و سوننەتا پاقژ دخوینیت، د ماویٚ چەندین ئایەتاندا، و د ماویٚ چەندین فەرموودەیاندا دیٚ دەرئیٚخیت، کو خودیٚ و پیٚغەمبەریٚ وی هاندان و حەزا نڤستنا زوی و هشیاربوونا زوی دکەن، خودیٚ دبیٚژیت: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً﴾ [النبأ:٩]، (ئانکو: ما مە خەو (نڤستن) بۆ هەوە نەکرییە ڤەهسیان (بۆ نەهیٚلانا ویٚ وەستیانا هوین د بزاڤا خۆ یا رۆژانەدا دبینن، و جارەکا دی دزڤرنەڤە سەر بزاڤا خۆ). و خودیٚ دبیٚژیت: ﴿وَقُرْآَنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآَنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا (٧٨)﴾ [الاسراء]، (ئانکو، نڤیٚژا سپیٚدیٚ ژ بیر نەکە (نڤیٚژا سپیٚدیٚ ب قورئانیٚ هاتە ناڤکرن چونکی قورئان ب دریٚژی ل سەر دئیٚتە خواندن)، چونکی ب ڕاستی نڤیٚژا سپیٚدەیان ملیاکەت ل سەر شاهدن (ب شەڤ و ڕۆژ تیٚدا حازر دبن، و خۆ تیٚدا پیٚك دگوهۆڕن، ڤیٚجا هەردو جوین ل سەر دبنە شاهد).

پیٚغەمبەر ﷺ دبیٚژیت: ((اللهُمَّ بَارِكْ لِأمَّتِي فِي بُكُورِهَا))[1]. (ئانکو: یا خودیٚ تو بەرەکەتیٚ بۆ ئوممەتا من بیٚخییە د سپیٚدەهییێن واندا).

زار عائیشاییٚ ژ پیٚغەمبەری ﷺ دبیٚژیت: ((رَكْعَتَا الفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا))[2]. (ئانکو: هەردو رکاعەتیٚن سپیٚدیٚ (مەبەست سوننەتا بەری نڤیٚژا سپیٚدیٚیە) چیٚترن ژ دنیاییٚ و هندی د دنیاییٚدا).

---

(١) ترمزی (١٢١٢) و ئەبو داوود (٢٦٠٦) و ئیبن ماجە (٢٢٣٦) زار (صخر)یٚ غامدی.

(٢) موسلم (٧٢٥)، و ترمزی (٤١٦)، و نەسائی د (سنن الكبرى)دا (١٤٥٢)، و ئەحمەد (٢٦٣٣٠).

و زار عەبدولایێ کورێ مەسعودی دبێژیت: ((جَدَبَ لَنَا رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) السَّمَرَ بَعْدَ الْعِشاءِ، يَعْنِي زَجَرَنَا))[1]. (ئانکو، پێغەمبەری ﷺ ئەم ژ مان و شەڤبێرییێت پشتی نڤێژا عەیشا داینە پاش). بەلێ هشیار مان (درەنگ نڤستن) دورستە بۆ زانستی، و بوخاری د سەحیحا خۆدا دبێژیت: درەنگ نڤستن بۆ زانستی بیت، و فەرموودە پێن ل سەر ڤێ چەندێ هاتین.

بەلێ تو بمینییە هشیار هەتا درەنگی شەڤ نە ژ بۆ مەرەمەکا زانستی ئەڤە نە ژ سوننەتا پێغەمبەری یا پاقژە، پشتی نڤێژا عەیشا کۆم نەبن ب تنێ بۆ وەرگرتنا زانستی نەبیت، هەر وەکی پێغەمبەری ﷺ ژ مە دڤێت کو ئەم زوی بنڤین، و زوی هشیار بین، خودێ دبێژیت: ﴿وَقُرْآنَ الْفَجْرِ﴾ [الاسراء]، و د هندەك راڤەکرنێن ڤێ ئایەتێدا: ئانکو ئەو قورئانا دهێتە خواندن د نڤێژا سپێدێدا، ﴿إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾.

زانا دبێژن بلندترین رێژا گازا ئۆزۆن ل سپێدەهییان یا هەی، و ئەڤ رێژە پیچ پیچە کێم دبیت هەتا نەمینیت د گەل هەلاتنا رۆژێ، و کاریگەرییا ڤێ گازێ ـ گازا ئۆزۆن ـ کارتێکرنەکا گەلەك باش یا هەی بۆ کۆئەندامێ دەماری، و گەلەکێ چالاکە بۆ کارێ هزری و ماسۆلکەیی، و ئەوێ دمینیتە د ناڤ نڤینێن خۆدا، و پشتی هەلاتنا رۆژێ رابووڤە وێ رۆژێ هەمییێ دێ هێزا وی یا هەرفی بیت، ئەڤە راستییا ئێکێ.
تشتەکێ دی، رێژا تیشکا د سەر بنەفشیدا مەزنترە دەمێ رۆژهەلاتنێ، ژ دەمێ رۆژ بلند بیت و دچیتە نیڤا ئەسمانی، و ئەڤ تیشکا د سەر بنەفشیدا، ئەڤەیە وەل پیستی دکەت ڤیتامین (د) چێ کەت، و ڤیتامین (د) ب تنێیە کو کەرستێ کلسی د هەستییاندا جێهگر دکەت، و ئەگەرێ پۆتیبوونا هەستییان، و شکەستنا زوی یا هەستییان، و لاوازییا بنیاتێ هەستی ئەگەرێ وێ نڤستنا پشتی هەلاتنا رۆژێیە.

---

(١) ئیبن ماجە یا ڤەگێرایی (٧٠٣).

سێ: هشیاربوونا زوی خەوا درێژ ناهێلیت، خەوا درێژ: حەفت دەمژمێران، هەشت دەمژمێران سەرێك چالاكییا لەشی لاواز دكەت ب نزمترین ئاست، و لێدانێن دلی كێم دبن بۆ نزمترین ئاست، و خوین هێدی د خوینبەراندا دچیت، ل ڤێرە دێ كەرستێن دوهنی ڤەمینن و بنە گیرهە ب دیوارێن خوینبەرانڤە، و ئەڤەیە دبیتە ئەگەرێ تەنگبوونا وان، و ئەگەرێ جەلتا دلی...ئەو ژی نڤستنا درێژە، و هشیاربوون بۆ نڤێژا سپێدێ خەوا درێژ ناهێلیت، ئانكو هۆسا مرۆڤ دو جاران دنڤیت بەری نڤێژا سپێدێ و پشتی رۆژهەلاتنێ.

تشتەكێ دی، د لەشیدا كەرستەك یێ هەی هەمی چالاكییێن لەشی زێدە دكەت، و ئاستێ دەربرینا خۆراكی (گوهۆرینا خوارنێ بۆ وزێ) بلند دكەت، و رێژا شەكرێ د خوینێدا زێدە دكەت، ئەڤ كەرستە دگەهنە بلنترین پلە ل سپێدە زوییاندا، ناڤێ ڤی كەرستەی كۆرتیزۆلە، د ناڤ لەشێ مرۆڤیدا یێ هەی، ئاستێ گوهۆرینا خوارنێ بۆ وزێ بلند دكەت، رێژا شەكرێ د ناڤ خوینێدا زێدە دكەت، و د سەر ڤێ چەندێدا چالاكییا گشتی بۆ كۆئەندام و ئەندامێن مرۆڤی زێدە دكەت، و ئەڤە دگەهیتە رێژا بیست و دو پلە ل سپێدەیان، و كێم دبیت بۆ حەفت پلەیان.

ئەڤە هندەك راستییێن زانستی بوون دبنە پشتەڤان كو ئەڤ پەرتۆكە (قورئان) و سوننەتا پێغەمبەری؛ یا ژ لایێ خودێ ب تنێڤە هاتی.

# وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ

زانا دبێژن: خەو مەزنترین ڤەنجیيە ژ ڤەنجییێن خودێ بۆ مە، ژ بۆ زڤراندنا چالاکییا مرۆڤی پشتی وەستیانێ، ژ بۆ زڤراندنا چالاکییا لەشێن بێ هێز، ئەوێن وەستیانێ بێ هێز کرین، و ژ نیشانێن خودێنە ل سەر مەزناهییا وی، خودێ دبێژیت: (وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ (٢٣)) [الروم]، (ئانکو: ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتدارییا وی، نڤستنا هەوەیە د شەڤ و ڕۆژاندا و بەرگەڕیان و داخوازکرنا هەوە بۆ ڕزقێ خودێ ب شەڤ و ڕۆژ، ب راستی ئەڤە نیشان و بەلگەیێت ئاشکەرانە (ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتدارییا خودێ) بۆ وان ئەوێت گوهدارییێ دکەن، دا تێ بگەهن). ئانکو: ژ وان نیشانانە یێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ.

نویترین ڤەکۆلین د بابەتێ نڤستنێدا: ئەوە مرۆڤ دەمێ هشیار دبیت و دەست ب کاری دکەت د خوینا ویدا کەرستەك دهێتە دەرکرن یان کەرستەکێ کیمیایی ب ڕێژەکا گەلەك کێم، و چەند دەم بچیت ئەڤ ڕێژە زێدە دبیت، و دەمێ گەهشتە سنورەکێ دەستنیشانکری، ئەڤ ڕێژێن گەهشتینە سنورەکێ دەستنیشانکری د خوینێدا ب کاریگەرییا چۆنا دەمی ل سەر مەزاختنا شیانان دێ فەرمانەکێ هنێریت بۆ مێشکی، و مێشك ژی دێ ب ڕۆلێ خۆ رابیت دێ فەرمانەکا دەماری یا کارەبایی ڤرێکەتە ناڤەندێن نڤستنێ د لەشیدا، ناڤەندێن نڤستنێ ئەوە گرێکێن دەمارینە، گرێکێن دەماری یان دێ ژێك دویر کەڤن و چۆنا کارەبایی دێ بڕیت، ئەڤە نڤستنە یان ژی دێ ژ ئێك نێزیك بن و چۆنا دەماری یا کارەبایی دێ ئاسایی بیتەڤە، ژ بەر ڤێ چەندێ سیستەمێ نڤستنێ کەرستەکێ کیمیاییيە، یان کۆمەکا کەرستانە دەردانێ دکەن ل دەستپێکا ڕۆژێ ب ڕێژێن

گەلەك كێم، هەر چەند دەم دبۆریت ئەڤ رێژە بلند دبیت، هەتا دگەهیتە سنورەكێ دەستنیشانكری دێ لەش بۆ مێشكی پێگەهاندنەكا دەماری ڤرێكەت ژ بۆ نێزیكبوونا وەستیانێ، مێشك دێ فەرمانێ ل ناڤەندێن نڤستنێ كەت كو كار بكەن، دێ دویماهیێن دەماران ژ ئێك و دو دویر كەڤن و دێ خەو چێ بیت رێڤەبرنا كێیە؟ رێكخستنا كێیە؟ ئافراندنا كێیە؟ داهێنانا كێیە؟ دێ ژیانا مە یا چاوا بیت بێی خەو، ئەگەر مرۆڤ دو شەڤا سەرێك بمینیتە هشیار دێ سروشتێ وی تێك چیت، و دێ هەڤسەنگیا خۆ ژ دەست دەت، پا دێ چاوا بیت ئەگەر ب هەمیڤە ژ خەوێ بوو، خودێ دبێژیت: (وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ (٢٣)) [الروم].

د لەشێ مرۆڤیدا ناڤەندێن خەوا سڤك و خەوا كویر یێن هەین، چێ دبیت مرۆڤ یێ نڤستی بیت بۆ ماوێ هەشت دەمژمێران ل سەر جهێ خۆ، ب تنێ دەمژمێرەكێ یان دو دەمژمێران دنڤیت ب خەوەكا كویر، و دەمژمێرێن مایی مرۆڤ خەوا سڤك دنڤیت، ئانكو تە جۆرەكێ زانین و پێحەسیانێ یێ هەی، كا چ د ناڤ مالێدا چێ دبیت، جۆرەكێ پێ حەسیانێیە، كا كی دئاخڤیت، و كی هاتە ژۆر، كێ دەرگەه ڤوتا، كی دەركەڤت، بەلێ نڤستنا كویر مرۆڤی های ژ چو تشتا نینە، كێ وەلێ كرییە كو د لەشێ مرۆڤیدا ناڤەندێ نڤستنا كویر و ناڤەندێ نڤستنا سڤك هەبن و مەلبەندەك بۆ هشیاربوونێ؟

زارۆك هەژدە دەمژمێران ژ بیست و چار دەمژمێران دنڤیت، دا لەشێ وی گەشێ بكەت، و ئەوێ ژییێ وی پێنج سال بن دوازدە دەمژمێران دنڤیت، و سنێلە نەه دەمژمێران، و پێگەهشتی (بالغ) حەفت هەتا هەشت دەمژمێران.

كێ خەو رێكخستییە؟ كێ ماوێ وێ رێكخستییە؟ كێ جۆرەیا وێ رێكخستییە؟ كێ خەو كرییە ماوێ بهێنڤەدان و رەحەتییێ بۆ ماسۆلكە و كۆئەندامان؟ خودێ دبێژیت: (وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ (٢٣)) [الروم].

# نڤستن ل سەر کێلەکا راستێ

دەمێ مرۆڤ دچیتە د جهێ خۆڕا و بەرێ خۆ بدەتە خۆ کا دێ چەوا نڤیت؟ هندەك مرۆڤ ل سەر زکێن خۆ دنڤن، و هندەك ل سەر پشتێن خۆ، و هندەك ل سەر کێلەکا خۆ یا راستێ، و هندەك مرۆڤ ل سەر کێلەکا خۆ یا چەپێ دنڤن، و ئەوێن ل سەر زکێن خۆ دنڤن هەست ب بێنتەنگییێ دکەن؛ چونکی گرانییا پشتا مرۆڤی و پەیکەرێ هەستی دکەڤیتە سەر هەردو سیهێن وی، زێدەباری هندێ کو ئەڤ نڤستنە نەیا جوانە.

ئەوێن ل سەر پشتا خۆ دنڤن ئەڤانە کۆئەندامەك ژ کار ئێخست کو ژ هویربینترینێ کۆئەندامانە، ئەو ژی کۆئەندامێ گەرمکرنێ و زەلالکرنێیە، ژ بەر کو د دفنێدا پاناتی یێن هەین کو خوینبەرێن ب ماسۆلکەنە، دەمێ ماسۆلکە فرەھ دبن دێ چەندییەکا مەزن ژ خوینێ هێت، و دەمێ هەوا د ڤان پاناتییادا دهێت، و ب ڤێ چەندییا مەزنا خوینێڕا دهێتە هوسین د دفنێدا ب ڤان ماسۆلکێن خوینبەران دێ هەوا گەرم بیت، و دێ گەهیتە دەستپێکا بۆرییا هەوای، د پلەیا سیه و هەشتدا، چێ دبیت ئەو هەوایێ مرۆڤی هەلکێشای د پلەیا سفردا بیت، زێدەباری کەرستەکێ چڕ یێ تێدا، هەر تۆزەك و هەر هاتنا تشتەکێ دی، و هەر تشتەکێ د گەل هەوای دێ پێڤە نویسیت، ئەگەر ئەم هزر بکەین کو تشتەك بشێت د ناڤ ڤان پاناتییێن دفنێدا بچیت بێی پێڤە بهێتە هوسین، یان بێی پێڤە بمینیت، ل ڤێرە موی یێن هەین خودێ یێن د دفنێدا چێکرین، ژ بەر کو دا ڤان کەرستێن د گەل هەوای دهێن بگرن، ئانکو، پێشکەفتیترین کۆئەندامێ گەرمییێ، و پێشکەفتیترین کۆئەندامێ زەلالکرنێیە، دا ئەو هەوایێ دچیتە د هەردو سیهاندا یێ پاقژ بیت، و یێ گەرم و زەلال بیت.

دەمێ مرۆڤ ل سەر پشتا خۆ نڤست، و بێهنا خۆ ژ دەڤی ئینا و بر ئەڤە وی ئەڤ کوئەندامێن زێدە ئالۆز ژ کارئێخستن، لەورا ل دەمێ گەرمێ مرۆڤ دبینیت دفنا مرۆڤی

سۆر دبیت، و هەکە مرۆڤی بێهنا خۆ ژ دەڤی ئینا و بر دێ چ چێبیت؟ دێ پتر تووشی پەرسیڤێ بیت ژ ییێن دی، و دێ پدیا وی هشك بیت، و هەکە هشك بوو دێ ژ ددانا ڤەبیت و هەکە ژ ددانا ڤەبوو ئەڤە نەساخییەکا سەردەمانەیە، زێدباری خرخرێ ئەڤا کو مرۆڤ خۆ ل بەر ناگریت ژ ئەگەرێ ئینان و برنا بێهنێ ژ دەڤی.

دەمێ مرۆڤ ل سەر پشتا خۆ نڤست یان ل سەر زکی ئەڤ شێوە نە د ساخلەمن، ما ل وێرێ نڤستنا ل سەر کێلەکا چەپێ، خوارن هەر دمینیت یا سروشتی د مەعیدەیدا ژ دو دەمژمێران بۆ چار دەمژمێران، ئەگەر مرۆڤ یێ نڤستی بیت ل سەر کێلەکا چەپێ هەرسکرنا خوارنێ پێنج دەمژمێران بۆ هەشت دەمژمێران ڤەدکێشیت، چونکی سیها راستێ - کو ئەڤ سیهە مەزنترە ژ یا چەپێ - دێ پەستانێ کەتە سەر دلی، و مێلاکێ - کو مەزنترین ئەندامە - دێ نەرەحەت مینیت، و دەمێ مرۆڤ ل سەر کێلەکا راستێ دنڤیت، و سیها چەپێ بچویکتر و سڤکترە، و مێلاك کو مەزنترین ئەندامێ لەشییە یێ خۆجهە د لەشیدا ژ لایێ عەردیڤە، و هەرسکرن دێ ب لەز چێ بیت. ژ زارێ ئەبی هورەیرە دبێژیت: رأى رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) رَجُلاً مُضطجِعاً عَلَى بَطنِهِ فقَالَ: ((إِنَّ هذِهِ ضَجْعَةٌ لاَ يُحِبُّهَا اللهُ))[1]، (ئانکو: پێغەمبەری ﷺ زەلامەك دیت یێ ل سەر زکێ خۆ نڤستی، ئینا گۆت: ئەڤ شێوێ نڤستنێ خودێ حەژێ ناکەت).

هندەك ژ وان دبێژن: (نڤستنا ل سەر پشتێ نڤستنا میرایە، و نڤستنا ل سەر زکی نڤستنا شەیتانایە، و یا ل سەر کێلەکا چەپێ یا زەنگینایە، ژ بەر گەلەك خوارنا وان ل سەر کێلەکا چەپێ دنڤن داکو بێهنا خۆ بدەن، و نڤستنا ل سەر کێلەکا راستێ یا زانایانە).

---

(١) ترمزی (٢٧٦٨)، ئەحمەد (٨٠٢٨).

# نڤستنا درێژ

ڤەكۆلینێن نوژداری یێن نوی سەلماندییە كو ئەو مرۆڤێ دەمژمێرێن درێژ دنڤن ب نڤستنەكا ب ئێك جاری تووشی نەخۆشییێن دلی دبیت ب رێژەكا گەلەك بلند، و ئەگەرێ ڤێ دیاردێ ئەوە ئەو بەزێن د ناڤ خوینێدا دمینە ب دیوارێن شاخوینبەرێن دلیڤە، ب رێژەكا مەزن ئەگەر دەمژمێرێن نڤستنێ درێژ بوون، ئەڤە دكێشیتە ژ كاركەفتنا كارێ ڤان خوینبەران، و نەرماتییا خۆ ژ دەست ددەن، پشتی ڤێ چەندێ ب كێر ناهێن بۆ كێشانا وێ چەندییا خوینێ ژ بۆ ماسۆلكا دلی، هەر خوینبەرەكا دلی نەرماتی یا تێدا هەی، نەرماتییا وەكی لاستیكی، و دەمێ لێدانا دلی دهێت ب ڤێ نەرماتییێ فرەهـ دبن، و پێدڤییە بزڤریت وەكی بەرێ، دەمێ زڤری وەكی بەرێ، دێ خوینێ پالدەتە پشكا دی یا خوینبەرێ، و هەر خوینبەرەك هاریكارییا دلی دكەت د كێشانا خوینێدا، ناڤێ ڤێ نەرماتییە، و دەمێ بەز ب دیوارێن خوینبەرانڤە دنویسن، خوینبەر دێ نەرماتییا خۆ ژ دەست دەن.

خەوا درێژ ب دەمژمێرێن زۆر لێدانا دلی لاواز (سست) دكەت، و د گەل سستبوونا لێدانێ هاتن و چۆنا خوینێ ژی سست دبیت، دێ بەز مینە ب دیوارێن خوینبەرانڤە، دێ خوینبەر نەرماتییا خۆ ژ دەست دەت، و ئەڤ پێڤەنویسیانا بەزی (دوهن) دیسا دێ خوینبەرێ تەنگ كەت، و ئەڤە دیسا دكێشیتە هندێ كو تەراتی د ماسۆلكا دلیدا كێم ببیت، و ئەڤ كێم تەراتییە دكێشیتە نەخۆشییان بەس خودێ دزانیت.

ئەڤ زانایێن بیانی یێن دویری رێبازا خودێ، كو چو تشتا ژ ئیسلامێ نوزانن، دبێژن: (ڤەكۆلەر شیرەت دكەن، مرۆڤ پشتی چار یان پێنج دەمژمێران ژ خەو رابیت و هندەك راهێنانێن وەرزشی بكەت، یان چارێك دەمژمێری ب پێیان بچیت، ژ بۆ پاراستنا نەرماتییا خوینبەرێن دلی، و بۆ پاراستنا وان ژ گیرهەیێن بەزی، و دا بهێتە پاراستن ژ نەخۆشییێن دلی).

ئەگەر تو چار یان پێنج دەمژمێران نفستی پێدڤییە هشیاربی و هندەك راهێنانێن وەرزشی بکەی، ئانکو ئەگەر تو دەمژمێر یازدێ شەڤێ نفستی بۆ نموونە پێدڤییە ل دەمژمێر پێنج بۆ نڤێژا سپێدێ هشیار ببی، یان چارێك دەمژمێرێ دێ ب پێیان چی بۆ مزگەفتێ، یان دێ هندەك راهێنانێن وەرزشی کەی کو ئەو ژی نڤێژە.

زار عەبدولایێ کورێ مەسعودی ﷺ، بەحسێ زەلامەکی ل دەڤ پێغەمبەری ﷺ کر، گۆت: هێژ یێ نفستییە هەتا دبیتە رۆژ، و نارابیت نڤێژێ بکەت، ئینا پێغەمبەری گۆت: ((ذاك رجلٌ بال الشيطانُ في أذنيه، أو قال: في أذنه))[1]، ئانکو، ((ئەو کەسەکە شەیتانی یا میزتییە د گوهێن ودا))، یان ژی گۆت: ((د گوهیدا)).

و ژ زارێ ئەبی هورەیرە گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((إنَّ أثقلَ صلاةٍ على المُنافقِينَ صلاةُ العِشاءِ وصلاةُ الفَجرِ، ولَوْ يَعلَمُونَ ما فِيهِمَا لَأتَوْهُمَا، ولَوْ حَبْواً، ولَقَدْ هَمَمْتُ أنْ آمُرَ بالصَّلاةِ فتُقَامَ، ثمَّ آمُرَ رَجُلاً فيُصَلِّيَ بالنَّاسِ، ثمَّ أنْطلِقَ مَعِي برِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إلى قَوْمٍ لاَ يَشْهَدُونَ الصَّلاةَ فأُحرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بالنَّارِ))[2]، (ئانکو: گرانترین نڤێژ بۆ دوروییان نڤێژا عەیشا و یا سپێدێیە، و ئەگەر زانیبا کا چ د ڤان هەردو نڤێژاندا هەیە دا هێن کەن، خۆ ئەگەر ل سەر زکی هاتینە، و من ئنیەت بی فەرمانێ بدەم قامەتا نڤێژێ بێتە گرتن، پاشی فەرمانا زەلامەکی بکەم نڤێژێ ل بەری خەلکێ بکەت، پاشی ئەز هندەك زەلاما د گەل خۆ ببەم هندەك دار ڤێ بن بچینە وان یێت نەهێنە نڤێژێ و خانییێت وان ب سەر واندا بسۆژم).

و زار ئەنەسێ کورێ سیرینی گۆت: من های ژ جوندەبەیێ قەسری بوو گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللهِ، فلاَ يَطلُبَنَّكُمْ مِنْ ذِمَّتِهِ بشَيْءٍ، فإنَّهُ مَنْ يَطلُبْهُ مِنْ ذِمَّتِهِ بشَيْءٍ يُدرِكْهُ، ثمَّ يَكُبَّهُ عَلَى وَجهِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ))[3]، (هەرکەسێ نڤێژا سپێدێ ب جەماعەت بکەت، ئەو یێ د ئێمناهیا خودێدا و د بن چاڤدێریا ویڤە،

---

(١) بوخاری (١٠٩٣)، موسلم (٧٧٤)، نەسائی (١٣٠٢)، ئەحمەد (٤٠٥٩).

(٢) بوخاری (٢٢٨٨)، موسلم (٦٥١)، و ناخفتن یا ویيە، و ترمزی (٢١٧)، ئەبو داوود (٥٤٨)، ئیبن ماجە (٧٩١).

(٣) موسلم (٦٥٧).

هشیاربن نەهێلن و سستیێ تێدا نەکەن، و خودێ حسێبا وە نەکەت ل سەر شکاندنا وێ پەیمانێ یا هوین پێ هەژی ئێمناهی و چاڤدێریا وی بووین، ب راستی یێ خودێ وی بخوازیت (حسێبا وی بکەت) دێ گەهیتێ، پاشی ب سەر و سەر دێ هاڤێژتە د جەهنەمێدا.).

تە دیت ـ هەی موسلمان ـ رابوونا تە بۆ کرنا نڤێژا سپێدێ پاراستنە بۆ دلێ تە ژ رێگرتنا چۆنا خوینێ ب رێکا خوینبەران، و جەلتا دلی، و یێن وەکی ڤان، و پاراستنە بۆ خوینبەرێن تە ژ رەقبوون و گرتنێ.

ئەڤ چەندە وان زانایان یا گۆتی ئەوێن ب هەمیڤە چو ژ ئیسلامێ نەزانی بوو.

نڤستنا درێژ بزاڤا دلی سست دکەت، و مرۆڤ د خەوا درێژدا چێ دبیت لێدانێن دلی بگەهنە پێنجی لێدانان، یان شێستان، ئەڤ سستبوونە د لێداناندا دێ بیتە ئەگەرێ سستبوونا بزاڤا خوینێ د لۆلەیێن خوینێدا، و ئەڤە دێ بیتە ئەگەرێ گیرهەبوونا بەزی ب دیوارێن خوینبەرانڤە، و گیرهەبوون رەقبوونێ دورست دکەت، و تەنگبوونا خوینبەران، و ئەڤە دبیتە ئەگەرێ کێمیا تەربوونێ و جەلتا دلی، ل ڤێرە نڤێژ ساخلەمییە، زێدەباری هندێ کو د بنیاتدا پەرستنە، و نێزیکبوونە ژ خودێ، خودێ دبێژیت: (إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي (١٤)) [طه]، (ئانکو: ب راستی ئەزم خودێ (ئانکو ئەڤێ گازی تە دکەت، ئەوە خودێ)، و چو پەرستی ژ بلی من هێژای پەرستنێ نینن، ڤێجا من ب تنێ بپەرێسە و نڤێژێ بکە، دا ئەز ل بیرا تە بم (یان ژی ل وەختێ بیرئینانا من (کو نڤێژە) نڤێژێ بکە).

ئەڤە رێبازا خودێیە، ئەڤە ڤێرکرنێن چێکەرینە، ئەڤە نە ژ دەڤ پێغەمبەرییە ﷺ، چونکی ئەو ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت، بەلکو ئەو ژ وەحییێ پێڤەتر نەبوو ئەوا بۆ دهات.

# پشکا چارێ

# نڤێژ

١-  پەیوەندیا نڤێژێ ب ساخلەمییا لەشیڤە

٢- نڤێژ و دوعا ئێشانا نەخۆشییێ کێم دکەن

٣- ڤیتامین ( د ) و پەیوەندییا وێ ب نڤێژێڤە

٤-  پەیوەندی د ناڤبەرا دەستنڤێژێ و نەخۆشییا تراخۆمادا

٥- دەستنڤێژ و مفایێن وێ یێن ساخلەمییێ

# پەیوەندییا نڤێژێ ب ساخلەمییا لەشیڤە

ئەڤە بابەتەکێ هویربین و دلخۆشە، ئەو ژی پەیوەندییا نڤێژێ ب ساخلەمییا لەشیڤە، دەلیڤە نینە ل ڤێرە ب بەرفرەهی ل سەر باخڤین، بەلێ دێ هندەك تێبینییان ژ ڤی بابەتێ هویربین ژێگرین.

نڤێژ شیانا دلی و زڤرۆکا خوینێ بلند دکەت، زێدەباری کو نڤێژ پەرستنەکا ئەرکە و خۆشکاندن و ئارامی یا تێدا، ل ڤێرە - ژ لایەکێ گەلەکێ بەرتەنگ - دێ ل سەر نڤێژێ ئاخڤین، ئەو ژی پەیوەندییا نڤێژێ ب ساخلەمییا لەشیڤە.

دێ کێم کەسان بینی د ناڤ نڤێژکەراندا تووشی نەخۆشییێن بربرا پشتێ ببن، و سروشتێ کریارا رکوع و سوجدەیان و ڕابوون د نڤێژێدا ساخلەمینە بۆ بربرا پشتێ، و کولبوونێن گەهان د ناڤ نڤێژکەراندا ب هەمی جۆرێن خۆڤە د کێمن، و نەخۆشییا (الدوالي)[1] د ناڤ نڤێژکەراندا یا کێمە، و جەلتێن خوینهێنەرێن کویر، و کێم هەبوونا تێ وەستیانا خوینا وی د حەوزێدا د ناڤ نڤێژکەراندا بینی کو دبیتە ئەگەرێ باسیران و بەربوونا خوینێ د رەحمیدا.

و دێ کێم بێنتەنگبوونێ د ناڤ نڤێژکەراندا بینی، کو ئەڤە ژی ژ ئەگەرێ کەڤتنە سەرێکا دوان ئۆکسیدی کاربۆنێ د هەردو سیهاندا، و بهێن هەلکێشانا ب کۆتەکی ئەوا رکوع و سوجدە چێ دکەن هەردو سیها چالاك دکەن، و دلی ژی د گەل هەردو سیهان چالاك دکەن.

---

(١) ناڤدارترین وان نەخۆشیانە یێن تووشی خوینهێنەران دبن، خوینهێنەر دئێنە بادان و درێژ دبن، باراپتر پێیێن ئافرەتان دگریت. وەرگێر.

و کێم تووشبوونا نڤێژکەران ب نەخۆشییا کولبوونا گوهێ ناڤەکی و بێ هش و بیرییا پیراتییێ، چونکی سوجدە مێشکی ب خوینێ ئاڤ ددەت، و نەخۆشییا کولبوونا گوهێ ناڤەکی و بێ هش و بیرییا پیراتییێ د هندەك ئەگەرێن وێدا کێم تەراتییە د لۆلەیێن مەژیدا، ژ بەر ڤێ چەندێ سوجدە خوینێ دبەتە لۆلەیێن خوینێ ب شێوەکێ کۆتەکی ب کریارا ڕاکێشانێ، ژ بەر هندێ کێم نەخۆشییا کولبوونا گوهێ ناڤەکی و بێ هش و بیریا پیراتییێ ل دەڤ نڤێژکەران یا هەی.

و پێغەمبەری ﷺ ئاماژەکا کورتا جوان ب ڤێ چەندێ یا دایی، فعَنْ سَالِمِ بْنِ الْجَعْدِ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهُ مِنْ خُزَاعَةَ: لَيْتَنِي صَلَّيْتُ فَاسْتَرَحْتُ، فَكَأَنَّهُمْ عَابُوا عَلَيْهِ ذَلِكَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: ((يَا بِلاَلُ أَقِمِ الصَّلاَةَ، أَرِحْنَا بِهَا))[1]، ئانکو: زەلامەکی گۆت: میسعەری گۆت: یا ژ منڤە خەلکێ خوزاعەیە، خۆزی من نڤێژ کربا و ڕەحەت ببام، هەر وەکی وان لۆمەی وی کری، گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو ﷺ گۆت: ((بیلال، قامەتا نڤێژێ بگرە و دلێ مە پێ خۆش بکە))، و بەلکی د نڤێژێدا ئارامییا دەروونی و لەشی د ئێك دەمدا هەبیت.

فەرمانا خودێ گەلەك مەزنترە ژ هندێ ئەم راڤە بکەین ب ئەگەرەکێ، یان ب زانینەکێ، و فەرمانێن خودێ زانینا وان و ئەگەرێن وان ناهێنە هژمارتن.

و زانایان تاقیکرنەك ل سەر هندێ کر کو دەمێ سەر نزم دبیت خوین درژیتە تێدا، دێ فشارا خوینبەران زێدە بیت، و دەمێ سەر ژ نیشکەکێڤە دهێتە بلندکرن دێ ژ نیشکەکێڤە فشار چیت، و ژ ئەگەرێ زێدەبوونا پەستانێ و هاتنەخوارا وێ دێ نەرماتی د لۆلەیێن خوینێدا چێ بیت، و ئەگەر فشارا مرۆڤی بلند بوو گەهشتە بیست و سێ پلەیێن چێوەیی (زئبقي) دێ ئەڤ لۆلەیێن نەرم خۆ ل بەر ڤێ فشار بلند گرن، ژ بلی ئەو مرۆڤێ نڤێژا نەکەت ئەگەر فشارا وی گەهشتە هەژدە پلە چێ دبیت خوینبەرێن مێشکی بپەقن، و تووشی راوەستانەکا مێشکی ببیت.

---

(١) ئەبو داوود (٤٩٨٥)، و ئەحمەد (٢٣١٣٧).

و نەخۆشییەکا دی یا هەی تووشی ژنان دبیت، ئەو ژی سەروبنبوونا رەحمییە، چارەسەرییا وێ ڕاهێنانێن ب هەمیڤە وەکی لڤینێن نڤێژێنە، و فەرمانا خودێ هزارەها مفا یێن تێدا هەین.

و ئەو فەرمانێن ئەم پێ هاتینە راسپاردن ئەڤە ژ لایێ ئافرێنەرێ مەڤەیە، و ژ دەڤ چێکەرێ مرۆڤییە، ژ دەڤ پرزانایە، ژ دەڤ پر شارەزایە، و مرۆڤ دەمێ یێ هشیار بیت بەری رۆژهەلاتنێ، و بەری ئاڤابوونێ، و تووشی ڤێ تیشکا ب مفا بیت، تیشکا سەر بنەفشی ئەڤە کارەکە رازیبوونا خودێ یا تێدا، و دیسا مفایەکە بۆ لەشی.

و نویترین ڤەدیتنێن د بوارێ نوژدارییێدا دیار دکەن کو وەرەمێن پەنجەشێرێ ئەگەرێ وێ لاوازییا کۆئەندامێ بەرگرییا لەشییە ب ئەگەرێ توندییا دەروونی، و ئێکتاپەرێسی ب تنێ مرۆڤی ژ ڤان توندییان ددەتە پاش.

تو دشێیی ل هەر جهەکی راگەهینی و بێژی: باوەری ساخلەمییە، ژ بەر کو دەمێ تە دیت خودێ ب تنێ پارێزکارە، و خودان حیکەمەتە، و پر زانینە، و یێ پر دلۆڤانە، و یێ خودان شیانە، و تە دیت دەستەك ب تنێ (هێزەك) رێڤەبەری و پارێزکارییا گەردوونی دکەت دێ دەروونێ تە هێمن بیت، و دەمێ دەروونێ تە هێمن بوو دێ توندییێن دەروونی ل سەر تە سڤك بن، و کۆئەندامێ بەرگرییا تە دێ ب هێز کەڤیت، و گەشەبوونا پترین خانەیێن بەرەلاییێ، ئانکو: دبێژنێ پەنجەشێر ئەگەرێ وێ لاوازییا بەرگرییێیە، و لاوازییا بەرگرییێ ئەگەرێ وێ توندییا دەروونییە کو گڤاشتنێ دکەتە سەر دەروونی، و چو تشت مرۆڤی چارەسەر ناکەن ژ توندییا دەروونی ژ بلی ئێکتاپەرێسییا خودێ نەبیت، ژ بەر ڤێ چەندێ تشتەك نینە باشتر ژ ئێکتاپەرێسییێ کو مرۆڤ فێر ببیتێ، خودێ دبێژیت: (فَلَا تَدْعُ مَعَ اللهِ إِلَهاً آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ المُعَذَّبِينَ) [الشعراء:٢١٣]، (ئانکو: چو پەرستییان د گەل خودێ نەپەرێسە (و بۆ نەکە هەڤپشك)، ئەگەر دێ بییە ژ وان یێت ب بەر ئیزایێ دکەڤن). (ئانکو: هەی موحەممەد، تو ژ خۆشڤیترین بەندەیێت منی، بەلێ د گەل هندێ ژی، ئەگەر تو پەرستییەکێ دی ژ بلی من بپەرێسی، دێ تە ئیزادەم).

# نڤێژ و دوعا ئێشانا نەخۆشییێ سڤك دكەن و دبنە هاریكار بۆ چارەسەرییێ

ڤەكۆلینەك هاتبوو كرن ل زانكۆیەكێ ژ زانكۆیێن ئەمریكا، ل دۆر كاریگەرییا نڤێژێ و دوعایان د سڤككرنا ئێشاندا، و ڤەكۆلین یا بابەتی (بێ لایەنی) بوو سەد ژ سەدێ، ڤێ ڤەكۆلینێ دوپات كر كو نڤێژ و دوعا ئەو ئێشانا نەخۆش هەست پێ دكەت كێم دكەت.
ئێشانا هندەك دەرگەهـ یێن هەین، و ئێشانێ رێكەك یا هەی ژ دویماهییێن دەماریڤە بۆ سترییە مەژی، بۆ لاكێشە مەژی، بۆ تیڤلێ مێشكی، ئەڤە رێكا ئێشانایە، و دەرگەهێن ل سەر ڤێ رێكێ هەین.
ڤان دەرگەهان كاودانێ دەروونی یێ نەخۆشی كۆنترۆلا وێ دكەت، ئەگەر یێ باوەردار بیت، و رازی بیت ب قەزا و قەدەرا خودێ، ئەڤ دەرگەهە دێ هێنە گرتن كو ئێشان نەگەهیتە تیڤلێ مێشكی ب تنێ كێمەك نەبیت، و ئەڤە تشتەكێ جێهگرە، و ئەوێ باوەرییەكا ب هێز هەبیت ئێشانێن وی یێن ژ ئەنجامێ هندەك نەخۆشییان چێ دبن دێ گەلەكا كێم بیت، چونكی دەرگەهێن ئێشانێ ل دەڤ وی د گرتینە، و ئەڤە بوو ڤێ ڤەكۆلینێ دوپات كری، ل ڤێرە چارەسەری ب رێكا نڤێژ و دوعایان ئێشانێ سڤك دكەت ئەوا نەخۆشێ سادە هەست پێ دكەت.
تشتەكێ دی، پێنجی و حەفت ژ سەدێ ژ وان ئەوێن پشكداری د ڤێ تاقیكرنێدا كری كارتێكرنەكا مەزنا ئەرێنی لێ هاتە كرن ب رێكا نڤێژ و دوعایان، و پێغەمبەری ﷺ دەستێ خۆ یێ پیرۆز ددانا سەر جهێ نەخۆشییێ (ئێشانێ) و دوعا دكرن، فعَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِي (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا دَخَلَ عَلَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ

قال: ((لَا بَأسَ، طَهُورٌ إن شاءَ اللهُ))[1]. (ئانكو، ژ زارێ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەری ﷺ دەمێ سەرا نەساخەکی ددا دگۆت: ((چو نینە، پاقژییەکە خودێ حەزکەت)). و هندەك تاقیکرنێن هاتینە کرن کو مرۆڤەکێ بەرنیاس و خودان سەنگ (تەقوادار) دەستێ خۆ دانیتە سەر جهێ ئێشانێ دێ ئەنجامێن ئەرێنی دیار بن، و پێغەمبەری ﷺ ئەڤ چەندە یا کری، و فەرمان یا ل مە کری بکەین.

ژ بەر کو دا تاقیکرن یا زانستی بیت، هندەك تشتێن بێ بنیات (وهمي) یێن بێ ڕامان کرنە د تاقیکرنێدا، بەلێ چو کاریگەری نەبوو، وەکی دانا ئاڤەکا پاقژ بۆ نەخۆشی کو بۆ دیار کر ئەڤە دەرمانە، بەلێ چو کارتێکرن ب هەمیڤە ل نەخۆشی نەکر ب ڤێ چەندێ، ب تنێ ب نڤێژ و دوعایان کاریگەری هەبوو، و دیسا د ڤێ تاقیکرنێدا دانانا دەستی ل سەر جهێ ئێشانێ د گەل دوعا و نڤێژێ کارتێکرن کر.

کرنا نڤێژێ مەرەم پێ ئەو نینە دا چارەسەر ببین، نڤێژ پەرستنە، و ئەرکە، بەلێ دەمێ تو پەیوەندییێ د گەل خودێ گرێ ددەی ئێشان گەلەك سڤك دبن، و دەمێ تو پەیوەندییێ د گەل خودێ گرێ ددەی کۆئەندامێ تە یێ بەرگرییێ ب هێز دکەڤیت، و ب هێزکەفتنا کۆئەندامێ تە یێ بەرگرییێ سەرکەفتنەکە ل سەر هۆکارێن نەخۆشییێ، چونکی کۆئەندامێ بەرگرییێ کارێ وی بنبرکرنا نەخۆشییێن میکرۆبی و شێرپەنجییە.

و ب ڤێ هەلکەڤتێ (ڤی بابەتی) دێ بۆ هەوە پێزانینەکێ ڤەگوهێزم کو د جهەکێ زانیارییاندا هاتبوو، ئەو ژی ڤەکۆلینەکە زانکۆیەکا مەزن پێ رابوویی، د ڤێ ڤەکۆلینێدا دوپات کر نڤێژ و چارەسەرییا روحانی دشێن وێ ئێشانا نەخۆش هەست پێ دکەت کێم بکەت، و لەزاتییێ د چارەسەرکرنێدا دکەت، و ئەڤە رەوشا دەروونی یا بلندە، و دبیتە هاریکار بۆ سڤککرنا ئێشانا، ئەڤ کاودانێ دەروونی دبیتە دو کاودان؛ یان دێ بیتە رەوشەکا کو چو بنیات بۆ نەبن (وهمي)، یان دێ بیتە رەوشەکا باوەرییێ، چێ دبیت تو چەکەکێ پارا (شیك) بدەیە مرۆڤەکی ب بهایێ سەد ملیۆنان، بەلێ د سەختە بن، و ئەو نوزانیت سەختەنە دێ ورەیێن وی بلند بن، و دێ هەست ب زەنگینییێ کەت، ئەڤە

---

(١) اخرجه البخاري (٣٤٢٠).

رەوشەکا بلندە، بەلێ نە رەوشەکا دورستا هەبوویيە (واقعية)، ڤێ ڤەکۆلینێ ئاماژە دا کو رەوشا دەروونی یا بلند پەیوەندی یا ب سڤککرنا ئێشا و لەزکرنا چارەسەرییێدا هەی، بەلێ چێ دبیت ڤی کاودانی ئەگەرێ وێ باوەری ب خودێ بیت، و خۆرادەستکرنا فەرمانێن وی بیت، و پەیوەندیکرنا ب وی، ئەڤە رەوشەکا باشە، و ئەو کاودانێ چو بنیات بۆ نە بنەرەتییا وی نەیا دورستە، و هەمان کارتێکرن یا هەی، ژ بەر ڤێ چەندێ دبێژن: زانست دیدەڤانە ل سەر رەوشێ، هەر دەمێ زانستێ تە یێ ب هێز بیت دێ ب زانستێ تە یێ موکم رەوشا تە یا موکم بیت، ل ڤێرە رەوشەکا رەحمانی، و رەوشەکا شەیتانی یا هەی.

من دڤیا ب رێکا ڤێ ئاخفتنێ ئاشکەرا بکەم کو ئەڤ ڤەکۆلینە یا گرێدایە ب رەوشەکا بلندڤە، کو چێ دبیت ب ئەگەرێ باوەری ب خودێ، و ڕاوەستانا ل سەر فەرمانا وی، و پەیوەندی ب وی بیت، و چێ دبیت ب ئەگەرەکێ دی بیت کو نە ژ بابەتێ مە بیت.

من دڤیا ڤان ڤەکۆلین و تاقیکرنان دانمە د ناڤ دەستێن هەوەدا، دا بۆ هەوە دیارکەم دەمێ هوین پەیوەندییێ ب خودێ دکەن ئەڤە هوین گەهشتنە هەمی تشتان، و د فەرموودەکا قودسیدا هاتییە: ((ابنَ آدمَ اطلُبني تجدني، فإذا وَجدتني وَجدتَ كُلَّ شيْءٍ، وإنْ فُتكَ فاتكَ كُلُّ شيْءٍ، وأنا أحبُّ إليكَ مِنْ كُلِّ شيْءٍ))[1]. (ئانکو، کورێ ئادەمی داخوازێ ژ من بکە دێ ب من کەڤی، و دەمێ تو ب من کەڤتی تە هەمی تشت دیتن، و دەمێ تە ئەز ژ دەست دام تە هەمی تشت ژ دەست دان، و ئەز ژ هەمی تشتان بۆ تە چێترم).

هەی خودا ما دێ چ ژ دەست دەت ئەوێ ب تە دکەڤیت (ئانکو ئەوێ ب سەر رێکا تە یا دورست هەل دبیت)؟ و دێ چ ب دەست کەڤیت یێ تە ژ دەست ددەت؟ و ئەگەر خودێ د گەل تە بیت کی د سەرڕا هەیە؟ و ئەگەر د سەر تەڕا هەبیت پا کی د گەل تەیە؟

---

(١) تەفسیرا ئیبن کەسیر (٢/٣٠٢).

# ڤیتامین (د) و پەیوەندییا وێ ب نڤێژێڤە

ڤیتامین (د) د بن پیستیدا چێ دبیت، رادبیت ب کریارا دەربڕینا خۆراکی د مێلاك و هەردو گورچیکاندا، هاریکارییا مێتنا کلسێ و فوسفوری دکەت ژ رویڤیکا، و ڤەدهێلتە د هەستییاندا، و ژ بەر ڤێ چەندێ ڤی ڤیتامینی رۆلەکێ گرنگ یێ هەی د هاڤێتنا ئەنسولینێ د پەنکریاسێدا، و ڤی ڤیتامینی رۆلەکێ گرنگ یێ هەی د گەشەبوونا خانەیێن سترییە مەژیێ هەستیدا، و ئەڤی ڤیتامینی رۆلەکێ گرنگ یێ هەی د گەشەبوونا خانەیێن سەرڤەیا پیستیڤە، ئەڤ چەندە یا بەرنیاسە ژ لایێ نوژدارانڤە، بەلێ تشتێ نوی ئەوە کو باشترین دەم بۆ مفا وەرگرتن ژ تیشکا رۆژێ ب بۆچۆنا نوژداران دەمێ هەلاتنا رۆژێیە، و دەمێ ئاڤابوونێ، ل ڤێرە نڤێژا سپێدێ رۆلەکێ گرنگ یێ هەی ل سەر ساخلەمییا مرۆڤی، چونکی ئەو مللەتێن تیشکا رۆژێ لێ نەدەت، و ماوەکێ درێژ دنڤن، تووشی نەرماتییا هەستییان دبن.

و خودێ فەرمان یا کری، ئەگەر فەرمانەکا پەرستنێ ژی بیت، بەلێ نابیت مە های ژێ نەبیت ژ لایەنێن ساخلەمیڤە، و ئەڤ چەندە یا ژ گۆتنا خودێ دەرئێخستی دەمێ چیرۆکا هەڤالێن شکەفتێ ڤەدگێریت: (وَتَرَى الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَتْ تَزَاوَرُ عَنْ كَهْفِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَتْ تَقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِنْهُ) [الكهف:١٧]، (ئانکو، تو دێ بینی وەختێ رۆژ دهەلێت تیرۆژکێت وێ ڕێکا خۆ ل سەر ڕەخێ ڕاستێ یێ شکەفتێ دگوهێزیت، و وەختێ ئاڤا دبیت ژ ملێ چەپێڤە ل وان نادەت، و ژ وان دبۆریت و ئەو د نیڤا شکەفتێڤە بوون (ئانکو نە هەلاتنێ و نە ئاڤابوونێ، رۆژێ ل وان نەددا هەر چەندە دەرێ شکەفتێ یێ ڤەکری بوو، و ئەو د ناڤا وێدا بوون).

و ئەوێ بەری رۆژهەلاتنێ یێ هشیار بیت، و بەری ئاڤبوونێ دێ مفایی ژ تیشکا سەر بنەڤشی یا رۆژێ وەرگریت، و زانا دبێژن: (نەیا گرنگە مرۆڤ ئێکسەر تووشی تیشکا رۆژێ ببیت، بەلکو تیشکا رۆژێ ئەوا ل ڤان هەردو دەماندا هەی ( هەلاتنێ و ئاڤابوونێ)، مفای دگەهینیتە پیستی د چێکرنا ڤیتامین (د)دا کو دبیتە هاریکار بۆ جێهگرکرنا کلسێ د هەستییاندا و موکومکرنا وان، و د کارێ پەنکریاسیدا، و د گەشەبوونا مەژیێ هەستییان، و خانەیێن تەخا پیستی یا سەرڤە).

# پەیوەندی د ناڤبەرا دەستنڤێژێ و نەخۆشییا کولبوونا چاڤی ( تراخۆما ) دا

ئەز ب سەر بابەتەکی هەلبووم یێ گرێدایە ب نەخۆشییەکێڤە دگەهیتە چاڤی، دبێژنێ (تراخۆما)، ئەڤ نەخۆشییە کولبوونەکە دگەهیتە تەخا سەرڤە یا چاڤی و کورنییا چاڤی، و ڤێ نەخۆشییێ ڤۆناغێن هەین تێدا دبۆریت، زڤربوون، و خوریانەکا سڤك، و ل دویماهییێ کۆرەبوونە، ئەڤە نە مەبەستا مەیە، ئەڤ بابەتە یێ ژ پەرتۆکێن نوژدارییا مرۆڤی دەرئێخستی، بەلێ ئەو تشتێ بۆ مە گرنگ و ئەم دێ بەحس کەین ئەوە نڤێسەرەکا تایبەتمەند گۆتارەك نڤێسی و د گۆڤارەکا زانستیدا بەلاڤ کر، ئەڤ گۆڤارە دهێتە دەرێخستن ژ لایێ نڤێسینگەها زانیارییان یا سەر ب نەتەوێن ئێکگرتیڤە، ئەڤ نڤێسەرا ئافرەت دبێژیت: (شویشتنا ب رێك و پێك، و دەستنڤێژ بۆ نڤێژێ د جڤاکێن ئیسلامیدا، ڤێ چەندێ گەلەك هاریکاری یا کری ژ بۆ رێگرییێ ژ بەلاڤبوونا نەخۆشییا تراخۆما، کو ئەڤە ئەگەرێ سەرەکییە بۆ کۆراتییێ، د وەلاتێن جیهانا سێییێدا)، و نڤێسەرێ هێژ زێدە کر و گۆت: (نێزیکی پێنج سەد ملیۆن کەس ل هەمی جیهانێ ئەڤ نەخۆشییە یا لێ هەی، و د شیانێن واندایە خۆ ژ کۆراتییێ بدەنە پاش ئەگەر ل دویف رێکا ئیسلامێ بچن د وێ پاقژکرنا ئەرك ل سەر هەمی موسلمانان بەری نڤێژێ)، و دبێژیت: (تێبینی بکەن د جڤاکێن ئیسلامی یێن پێگیر کێمییا رێژا تووشبوونا ب ڤێ نەخۆشییێ، بەلکو گەهشتییە پلا نەمانێ د جڤاکێن ئیسلامی یێن پێگیر کو پێگرییێ ب دەستنڤێژ شویشتنێ دکەن پێنج جاران د رۆژێدا)..

پێدڤیە مە باوەری هەبیت ئەڤ فەرمان و دانەپاشە ژ دەڤ ئافرێنەرێ مرۆڤانە، و ژ بەر ڤێ چەندێ ژ خشیماتییێیە مرۆڤ هزرکەت کو فەرمانا خودێ مفایەك یان دو ب تنێ

هەبن، بەلكو گەلەك مفايێن هەين ناهێنە هژمارتن، ئەوێ نقێسەرێ چو پەيوەندى ب هەميڤە ب فەرمانا ئايينيڤە نينە، د ماوێ ڤەكۆلينا وێ، و دويڤچۆنا وێ، و ل دويڤ ئاماران دێ بينى كو رێژا تووشبوويان ب نەخۆشييا تراخۆما كو پێنج سەد مليۆن كەس ل جيهانێ تووش دبنێ هەمى سالان، ژ ئەگەرێ كێم پاقژييێ، و ئەڤ نەخۆشييە ب شێوەكێ ديار گەلەك كێمترە د جڤاكێن ئيسلاميدا ئەوێن پێگرييێ ب دەستنڤێژ شويشتنێ و پاقژيێ دكەن، ئەڤە شەريعەت و ياسايا خوديێيە، ژ بەر ڤێ چەندێ هندەك زانا دبێژن: (پەيوەنديا د ناڤبەرا پەرستنێ و ئەنجامێن وێدا پەيوەندييەكا زانستييە، و پەيوەنديا د ناڤبەرا گونەهێ و ئەنجامێن وێدا ژى پەيوەندييەكا زانستييە).

ژ بەر ڤێ چەندێ زڤرين بۆ دەستپێكێ، مرۆڤ د بنياتدا يێ چێكرييە ل سەر ڤيانا هەبوونا خۆ، و ل سەر سلامەتييا هەبوونا خۆ، و ل سەر تەكووزييا هەبوونا خۆ، و ل سەر بەردەواميا هەبوونا خۆ، لەوا گوهدان و ب جهئينانا فەرمان و رێبازا خودێ پێدڤييە ل سەر تە، خودێ دبێژيت: (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا (٧١)) [الأحزاب]، (ئانكو: هەر كەسێ گوهێ خۆ بدەتە خودێ و پێغەمبەرێ وى، ب ڕاستى ئەڤە ئەو ب سەرفەرازييەكا مەزن سەرفەراز بوو).

# دەستنڤێژ و مفایێن وێ یێن ساخلەمییێ

د ڤەکۆلینەکا زانستیدا ژ لایێ هندەك مامۆستایێن کۆلیژا نوژداری ل وەلاتەکێ عەربی یێ موسلمان هاتبوو کرن، ڤان ڤەکۆلەران دوپات کر مرۆڤێ پێنج جاران د رۆژێدا دەستنڤێژێ دگریت، دڤنا خۆ پاقژ دکەت ژ میکرۆبان، و تۆزێ، و تشتێن هویر یێن دی، و وان گۆت: (ئەوێ دەستنڤێژێ نەگریت، دڤنا وی تووشی هژمارەکا میکرۆبان دبیت، هژمارا وان دگەهنە یازدە میکرۆبان).

و دەستنڤێژ وەل مرۆڤی دکەت بهێتە پاراستن ژ گەشەبوونا کەرۆیان د ناڤ تبلێن هەردو پێیاندا، دیسا ناهێلیت پیست تووشی کولبوونان ببیت، و عەداڤ و خوین ژێ هاتنێ، و کۆمێن کێمێ، و پەیدابوونا پەنجەشێرێن پیستی کێم دکەت، چونکی دەستنڤێژ کەرستێن کیمیایی دبەت بەری بکەڤنە سەرێك، و بەری ل سەر پیستی کۆم ببن، ژ بەر ڤێ چەندێ راستییەکا جێهگر یا هەی ئەو ژی تووشبوون ب پەنجەشێرا پیستی د وەلاتێن ئیسلامیدا یا کێمە.

دیسا پەرخاندنا ئەندامان زڤرۆکا خوینێ چالاك دکەت، و ئەڤە دێ دانا خوینێ بۆ ئەندامان چالاك کەت، و ب ڤێ چەندێ هاتن و چۆنا خوینێ بۆ مێشکی و هەردو گورچیسکان زێدە دکەت، و دەستنڤێژ ژ تەنگبوونا (اختناق) کۆئەندامێ دەماری سڤك دکەت ئەڤە دێ بیتە ئەگەر کو بیردانك چالاك بیت، وەکی دهێتە زانین کو ئیسلام پاقژییا لەشی بۆ دورستییا نڤێژێ دکەتە مەرج، و پاقژییا جلکی، و پاقژییا جهی د گەلدا، و ژ زارێ ئەبی مالکێ ئەشعەری گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((الطُّهُورُ شَطرُ الايمَانِ، وَالحَمْدُ للهِ تمْلأُ المِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالحَمْدُ للهِ تمْلآنِ، أوْ تمْلأُ مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالقُرآنُ حُجَّةٌ لكَ، أوْعَلَيْكَ، كُلُّ

النَّاسِ يَغْدُوا، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ، فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا))[1]. (ئانكو، دەستنڤێژ نیڤا نڤێژێیه، و خێرا (الحمد لله) ترازییێ تژی دكەت، و خێرا (سبحان الله والحمد لله) ناڤبەرا ئەرد و ئەسمانان تژی دكەت، و نڤێژ رۆناهییه، و سەدەقە هەجەت و نیشانه، و سەبر و بێنفرەهی رۆناهییه، و قورئان یان نیشان و بەلگەیه بۆ تە یان دژی تە، هەمی مرۆڤ كار دكەن خۆ دفرۆشن (یان خۆ دفرۆشنه خودێ ب گوهدارییێ یان خۆ دفرۆشنه شەیتانی ب گونەهان)، ڤێجا یان دێ خۆ رزگار كەت یان دێ خۆ بەتە هیلاكێ.

د ئامارەكێدا ژ لایێ رێكخراوا ساخلەمییا جیهانیڤە هاتبوو كرن، ئەو هژمار یا ب ترس بوو، سێ سەد ملیۆن مرۆڤ د نەخۆشن ب پیساتییێ ل جیهانێ، و موسلمان بزانن یان نەزانن، ما دەم دەستنڤێژێ دگرن، ئەو د پاراستینه ژ نەخۆشییێن پیساتییێ، چونكی دەستنڤێژ دبیتە ئەگەرێ پاراستنێ ژ ڤان نەخۆشییان.

ژ بەر ڤێ چەندێ وان گۆت: مفا وەرگرتن ژ تشتی نە ئێكە ژ چەڤێن زانینا وی تشتی، ئانكو چێ دبیت دەستنڤێژ بهێتە كرن بۆ پەرستنێ، بەلێ دێ هەمی بەرهەمێن دەستنڤێژێ ب دەست كەڤن ئەوێن ئەو دزانیت، و یێن نەزانیت، و بێی ئەو بزانیت، ل ڤێرە بەسی هندێیه ئەم فەرمانا خودێ ب جه بینین كو ئەو د وێ باوەرییێدا بیت فەرمانا خودێ باشییەكا ڤەبرە، ل ڤی دەمی بەرهەمێ ڤێ فەرمانێ دێ ب دەست كەڤیت.

دەمێ مرۆڤ رێبازا خودێ ب جه دئینیت ئەو یێ د خێرێدا و پشتی ڤێ ژی خێرەكا دییه (باشییەك و مفایەكێ دی)، و ئەو یێ د شادییەكێدا و پشتی ڤێ ژی شادییەكا دییه. و یێ د پاراستنەكێدا كو پشتی وێ ژی پاراستنەكا دییه، و یێ د ئێمنییەكێدا و پشتی وێ ژی ئێمنییەكا دییه، هەمی باشی، و هەمی سەرفەرازی، و هەمی سەركەفتن، و هەمی بەرزی، و هەمی ئاقل، یێن د فەرمان و گوهدانا خودێدا، خودێ دبێژیت: (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا (٧١)) [الأحزاب].

---

(١) موسلم (٢٢٣)، ترمزی (٣٥١٧)، ئیبن ماجه (٢٨٠)، ئەحمەد (٢٢٩٥٣)، دارەمی (٦٥٣).

# پشکا پێنجێ
## رۆژی

١- رۆژی د ناڤبەرا فەرمانا خودێ یا پەرستنێ و مفایێن وێ یێن ساخلەمییێ

٢- رۆژی خۆلەکا پاراستن و چارەسەرییێیە

٣- رۆژی و سیستەمێ هەرسکرنێ

٤- هندەك وەسیەتێن پێغەمبەری یێن ساخلەمییا ( پاشیڤێ و ڤتارەکرنێ )

٥- پەیوەندی د ناڤبەرا رۆژێن سپی و رۆژیگرتنا وان یا ساخلەمییێ

## رۆژی د ناڤبەرا فەرمانا خودێ یا پەرستنێ و مفایێن وێ یێن ساخلەمییێ

زانا دبینن رۆژی پاراستن و چارەسەرییە ژ گەلەك نەخۆشییان، ژ بەر کو هندەك نەخۆشییێن گران (پیس) چارەسەرییا وان چێ دبیت د رۆژییێدا بیت؛ وەکی کولبوونا تیژا مەعیدەی، و دلرابوونا دوگیانییێ یا توند، و هندەك جۆرێن نەخۆشییا شەکرێ، و بلندبوونا تێکچۆنا خوینبەرییێ، و لاوازییا گولچیسکێ یا هەلگر بۆ خوێ، و تەنگییا سینگی، و کولبوونا هەرسکرنا بەردەوام، و بەرکێن زراڤی، و هندەك نەخۆشییێن پیستی.

رۆژی چارەسەرییە بۆ هندەك نەخۆشییان، بەلێ ئەگەر ب جهـ بینن وەکی پێغەمبەری ﷺ گۆتی دێ بیتە پاراستن ژ گەلەك نەخۆشییان.

د رۆژییێدا ـ وەکی نوژدار دیار دکەن ـ ساخلەمییا دەروونییە، و د رۆژییێدا بلندکرنەکە بۆ ئاستێ دەروونی، و هیکرنەکە بۆ نەفسا مرۆڤی بۆ ئازادییێ ژ هەمی ئاستەنگان، و هەمی تشتێ مرۆڤ ل سەر هیبوویی، و باشترین هیبوون ئەوە مرۆڤ فێری چو هیبوونا نەبیت، ئەو مرۆڤێ هە بوویە کێشانا جگاران، چاوا شیا د هەیڤا رەمەزانێدا بهێلیت، ل ڤێرە جکارگێش دشێت جگاران بهێلیت، و مەزنترین رێخۆشکەر بۆ هێلانا جگارا هەیڤا رەمەزانێیە.

مرۆڤ ب رۆژییێ ژیانا خۆ ب هێز دئێخیت، و وەفادارییا مرۆڤ ب رۆژیێ گەشە دبیت، رۆژی پەرستنەکا وەفادارییە، و دیسا رۆژی هەستێن مرۆڤی گەشە دکەت، چێ دبیت خوارن و ڤەخوارن د مشە بن، و مرۆڤ نەشێت تشتەکی بخۆت یان ڤەخۆت.

ژ مفایێن ماددی یێن رۆژییێ مەعیدە و کۆئەندامێ هەرسکرنێ دەستویرییەکێ وەردگرن (بهێنڤەدان) د رەمەزانێدا، و کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ و دلی بهێنڤەدانێ

دکەت، و هەردو گورچیسك و زەلالکرن، ئەڤ کۆئەندامێن گرنگ دەمێ زیانەك دگەهیتێ دێ ژیانا مرۆڤی بیتە دۆزەخ، و دەمێ ژ نیشکەکێڤە هەردو گورچیسك راوەستان، مرۆڤ نەشێت خۆ ل بەر بگریت، و دەمێ لاوازی گەهشتە دلی، و خوینبەر تەنگ بوون، و رەق بوون، و دل هاتە تژیکرن ئەڤە کارەکێ ب زەحمەتە (مەترسییە)، ئەو نەخۆشییێن دگەهنە دلی ناهێنە هژمارتن، هندەك نەخۆشییێن هەین د بەربەلاڤن کو تووشی لۆلەیێن خوینێ دبن، و گەلەك نەخۆشی تووشی مەعیدە و رویڤیکان دبن، و نەخۆشی یێن هەین تووشی مێلاکێ دبن، و نەخۆشییێن تووشی کۆئەندامێ میزێ دبن؛ ئەڤ کۆئەندامێن گرنگ ژ کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ و هەرسکرنێنە، و کۆئەندامێ دەرهاڤێژتنا بەرماییکان (فضلات)، رۆژی بۆ ڤان کۆئەندامان پاراستنکەرە، ئەم نابێژین: رۆژی ب تنێ چارەسەرییە، بەلکو پاراستنە ژی.

گۆتارەك ل سەر نەخۆشییا دلی دبێژیت: ((کارێ دلی و سلامەتییا وی یا گرێدایە ب قەبارێ خوارنێ د مەعیدەیدا و جورێ وێ خوارنێ))، و دل، سلامەتییا وی، و رێکختسنا وی، و خوینبەر و نەرماتییا وان، ئەڤ تشتە د گرێداینە ب جۆرێ خوارنێ و قەبارێ وێڤە د مەعیدەیدا، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری ﷺ فەرمانا ل مە کری د ناڤنجی بین د خوارنێ و ڤەخوارنێدا، و خودێ ژی بۆ ڤێ چەندێ فەرمان یا ل مە کری دبێژیت: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ (٣١)﴾ [الأعراف]، (ئانکو، بخۆن و ڤەخۆن و دەرێژییێ و دەستدرێیانێ نەکەن، ب ڕاستی خودێ حەژ دەستدرێیایان ناکەت).

ئەوێ زێدەیێ دکەت د خوارن و ڤەخوارناندا دەمێ هەیڤا رەمەزانێ دهێت دشێت وێ خەلەتی و خواراتییێ راستڤەکەت، و وان کیفکۆیێن د کۆئەندامێ هەرسکرنێدا، و دا کو وێ کێشێ چارە بکەت یێ ژ سنوورێ سروشتی بۆری، و ئەو خەلەتییێن مرۆڤ دکەت د سالێدا دەمێ رۆژی دهێن سنوورەکی بۆ ڤان خەلەتییان ددانیت، و ئەگەر مرۆڤ سوننەتا پێغەمبەری ب جه بینیت هەیڤا رەمەزانێ ساخلەمییێ و چالاکییێ زێدە دکەت، و د پەرتۆکا (إحياء علوم الدين)دا غەزالی بەندەك، یان بابەتەکێ مەزن ل سەر باشییێن

برسێ تەرخان كرییە، دبێژیت: (باشی هەمی د كۆمڤەبووینە د برساتیییێدا، بەلێ نە مەرەم ب برسا توندە، بەلكو ناڤنجیكرن د خوارن و ڤەخوارناندا، چونكی حەبلین (زكشۆڕی) تێگەهشتنێ دبەت، و خوارنا گەلەك، و خوارنا ل سەر خوارنێ، و زێدەكرنا دانێن خوارنێ؛ ئەڤە مرۆڤی تووشی تەمبەلییێ دكەن، و خاڤاتی و جهدامانێ، و كیفكیبوونا رویڤیكان، و دلی دوەستینیت)، ل ڤی دەمی هەیڤا رەمەزانێ دێ هێت دێ ساخلەمییا مرۆڤی نوی كەتەڤە، لەشێ مرۆڤی دەوارێ (هەلگرێ) مرۆڤییە د ڤێ دنیایێدا، مە ژییەكێ دەستنیشانكری یێ هەی، یان دێ ب چالاك و ل سەر خۆ بۆرینین، یان دێ رازاندی ل مالێن خۆ بۆرینین، و مەحالە ئەڤ هەردو جوداهییە رێك بكەڤن د گەل ئێك، و ل ڤێرە تێرا ناكەت ئەم ل سەر مفایێن رۆژییێ باخڤین.

و یا هاتییە ڤەگوهاستن: ((صُومُوا تصِحُوا))[1]. (ئانكو، رۆژییا بگرن، دا د ساخلەم بن).

و رامانا ساخلەمییێ ل ڤێرێ پاراستنە ژ نەخۆشییان، و دەمێ تە هەمی هەیڤا رەمەزانێ رۆژی ب تمامی و دورستی گرت، تە لەشێ خۆ ژ نەخۆشییێن دژوار پاراست كو بەری نوكە ل دەڤ تە نەبوون، بەلێ ئەوێ خۆ ژ خوارن و ڤەخوارنان ددەتە پاش د ماوێ رۆژێدا، دەمێ دروینتە سەر مێزا خوارنێ دێ هندی خوارنا حێشترەكێ خۆت، ئەڤی ئارمانجا رۆژییێ ژ لایێ ساخلەمییێڤە ب جه نەئینا، دڤێت ناڤنجییێ د خوارن و ڤەخوارناندا بكەت د رۆژی گرتنێدا، و دەمێ تە سێ دانێن خوارنێ یێن رۆژێ كرنە د شەڤێن رەمەزانێدا!! تە چ ب جه ئینا؟ دانەكێ خوارنێ د گەل فتارێ دێ وەلێ كەت نەشێت ژ جهێ خۆ رابیت، و ل نیڤا شەڤێ ژی دێ دانەكێ دی خۆت، و ل دەمێ پاشیڤێ ژی دانەكێ دی دێ خۆتەڤە، ئەڤ چەندە ئەوە كو دانێن خوارنێ یێن رۆژێ برنە شەڤێ، وی چو تشت نەكر، دێ نەخۆشی و وەستییان هەر وەكی خۆ مینن.

---

[1] الفردوس بأثور الخطاب (٣٧٤٥)، و بەرێ خۆ بدە كشف الخفاء (١٤٥٥)، و لاوازییا تێدا.

# رۆژی خۆلەکا پاراستن و چارەسەرییێیە

ئاخفتن ل سەر رۆژییێ وەك پەرستنەك، و هەر تشتێ تێدا ژ لایێ تەقوایێ و رێزگرتنێڤە رامانا وێ ئەو نینە کو رۆژییێ چو مفایێن ساخلەمییێ نینن، د رۆژییێدا مفایێن ساخلەمی یێن هەین عەقل پێ حێبەتی دبیت؛ چونکی ئافرێنەرێ مرۆڤی ئەوە یێ رۆژی فەرز کری، و فەرمانا خودێ بلندتر و مەزنترە کو بۆ حیکمەتەکێ ب تنێ بیت، ژ بەر ڤێ چەندێ رۆژییێ چەندین حیکمەت یێن هەین ناهێنە هژمارتن.

هندەك زانا دبێژن: (رۆژی خۆلەکا پاراستنا سالانەیە، رۆژیگری ژ گەلەك نەخۆشییان دپارێزیت، و کریارەکا پاراستنێیە بۆ سلامەتیا مرۆڤییە، و خۆلەکا چارەسەرییێیە بۆ هندەك نەخۆشییان، خۆلەکا پاراستنێیە بۆ گەلەك نەخۆشییان، و رۆژی پاراستنەکە بۆ وی موسلمانێ ل دویڤ خوارنا ڤایدە دچیت دپارێزیت ل دەمێ رۆژیگرتنێدا ژ نەخۆشییێن پیراتییێ).

نەخۆشییێن پیراتییێ د ژییێ مەزندا دیار دبن، بەلێ ئەگەرێن وان نەخۆشییان د گەنجینییێدا دەست پێ دکەن، و رۆژی هەڤسەنگییەکێ چێ دکەت د ناڤبەرا مەزاختنا ئەندامییێ و پاراستنا کۆئەندامان، بەهرا پتر نەخۆشییێن پیراتییێ چێ دبن ژ زێدەییا وەستیانا ئەندامی ب درێژییا ژیانێ، ب خوارن و ڤەخوارنێدا، و ب هەمی خۆشیاندا، و و کاری، و وەستیانێ، و ب مەزاختنا شیانێ، و رۆژی دهێت دا ڤێ ئەندامییێ تەنا بکەت، و دا وان خەلەتییان راستڤەکەت یێن کو ل هەیڤێن دیدا کرین، ئەو خەلەتییێن مرۆڤی کرین د رۆژێن سالێدا دکەڤنە سەرێك، و پاشی هەیڤا رەمەزانێ دهێت دا ڤان خەلەتییان هەمیان چارەسەر بکەت، و دێ لەشێ مرۆڤی زڤریت هەر وەکی خۆلەکا پاراستنێ دەمێ خودانێ ڤی لەشی دکەت، و چالاکییا خۆ ب ڤێ چەندێ نوی دکەت.

یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن: ((صُومُوا تصِحُّوا))[1].

رۆژیگرتن وەکی زانا دبێژن: (بۆ نوژدارییا پاراستنێ نێزیکترە ژ نوژدارییا چارەسەرییێ)، ب بەلگە کو مرۆڤێ نەخۆش دەستویری یا هەی رۆژییێ نەگریت، هندەك ژ ڤان باشییان ئەوە کو رۆژی بارێ کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ سڤك دکەت، و یێن دل و لۆلەیێن خوینێ، چونکی رێژا قەلەوییێ و ترشێ یوریا د ڤێ هەیڤێدا دئینیتە نزمترین پلە، و د گەل نزمبوونا ڤێ رێژێ مرۆڤی دپارێزیت ژ نەخۆشییەکا مەترسی، ئەو ژی رەقبوونا خوینبەرانە کو دبنە ئەگەرێ وەستیانا دلی، و جەلتا دلی، و د گەل نزمبوونا رێژا ترشی یا یوریا د خوینێدا مرۆڤی دپارێزیت ژ نەخۆشییەکا دی ئەو ژی کولبوونا گەهانە.

رۆژی بارێ کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ سڤك دکەت، لۆلەیێن خوینێ تەنا دکەت، و دیسا دلی ژی ب رێکا نزمبوونا رێژا قەلەوییێ د ناڤ خوینێدا، و نزمبوونا رێژا ترشێ یوریا، دیسا رۆژی هەردو گورچیسکان تەنا دکەت ب کێمکرنا بەرماییکێن دەربرینا خۆراکی، و دەربرینا خۆراکی ئەو کریارە (گوهۆرینا خوارنێ بۆ وزێ)، ئەڤ کریارە د هەیڤا رەمەزانێدا نزم دبیت بۆ کێمترین ئاست، ئەڤە ژی ب مەرج کو مرۆڤ رۆژییێ بگریت هەر وەکی پێغەمبەری ﷺ فەرمان کری کو ب شێوەکێ نافنجی خوارنێ بخۆت، بەلێ ئەگەر مرۆڤی خوارن برە شەڤێ ل جهێ رۆژێ، ئانکو ب تنێ دەم گوهۆرین بیت، ئەڤە نە ئەو رۆژییە یا فەرمانا گرتنا وێ ل مە کری.

زانا دبێژن: (شەکرا مێلاکێ ـ شەکرا عومبارکری ـ ب بزاڤ دکەڤیت د ماوێ رۆژییێدا ئەو شەکرا عومبارکری د مێلاکێدا و د گەل ڤێ لڤینێ چالاکییا مێلاکێ نوی دبیتەڤە)، و مرۆڤ نەشێت بژیت بێی مێلاك پتر ژ سێ دەمژمێران، رۆژی وەل شەکرا مێلاکێ دکەت کو ب بزاڤ بکەڤیت، و ب بزاڤ دکەڤیت د گەل دوهنێ عومبارکری د بن پیستیدا، و پرۆتین ژی ب بزاڤ دکەڤن، و دیسا رژێن، و خانێن مێلاکێ، رۆژیگرتن وەکی هندەك

---

(١) سلف تخریجه.

نوزدار دبێژن: شانان دگوهۆریت و پاقژ دکەت، و هەر وەکی سەخبێرییەکا سالانەیە بۆ شانان و کۆئەندامێن لەشی، ئەڤە ژ لایێ پاراستنێڤە، و چ هەیە ژ لایێ چارەسەرییێڤە؟ رۆژیگرتن دهێتە هژمارتن چارەسەرییا هندەك نەخۆشییان، ژ وان ژی کولبوونا توندا مەعیدەی، و ڤەرەشیانا دوگیانییا (العنیدة)، و بلندبوونا فشارا خوینبەرییێ، و نەخۆشییا شەکرێ، و کێم و کاسییێن گورچیسکی یێن بەردەوام، و هندەك نەخۆشییێن پیستی.

فەرمانا خودێ یا پیرۆزە، نەفسێ پاقژ دکەت، و دلی رۆهن دکەت، و دیتنا دورست ددەتە تە، و دێ راستییێ ژ نەدورستییێ (باطل) زانیت، و باشییێ ژ خرابییێ.

# رۆژی و میکانزما هەرسکرنێ

هندەك زانایێن تایبەتمەند د بوارێ خوارنێدا دبێژن: (زانینا مرۆڤی نینە ب کار و مفایێن خوارنێ کو ئەڤ چەندە مرۆڤی پالدەتە خوارنێ، بەلێ هەست ب برسێ و دلچۆنا خوارنێیە ئەڤ هەردوکە مرۆڤی پال ددەن بۆ خوارنێ، و هەستەوەرێ مرۆڤی یێ برساتییێ مرۆڤی دکێشیتە هندێ کو پێدڤییا خۆ ژ خوارنێ دابین بکەت دا بمینیتە ساخ، و دلچۆنا خوارنێ ئەڤە رێکە نەئارمانجە).

ژ فەنجییێن خودێیە ئەڤ خوارنا دبیتە ئەگەرێ مانا تە تاما وێ یا خۆشە، بەلێ خودێ فەنجی یا ل مە کری کو ئەڤ خوارنا خودان تامەکا خۆش، دلچۆنا خوارنێ رێکە، و ئەگەر مرۆڤی کرە ئارمانج دێ لەشێ وی تێك چیت و نەخۆش بیت، گەلەك مرۆڤ یێن هەین، یان ژ لاوازییا شیانا وانە دلچۆنا خوارنێ دکەنە ئارمانج، و دەمێ خوارن بوو ئارمانج ژ کار دکەڤیت - وەکی زانا دبێژنێ زەنگا ڤەشارتی - دەمێ برساتییێ ب تنێ لێ ددەت! ئەڤ زەنگە دێ ژ کار کەڤیت، و مەعیدە وەکی زانا دبێژن: (گەلەك جاران ل بەرێك دهێتە دەر، ل قەبارێ وی یێ دەستپێکی دو سەد و پێنجی سەنتیمەترێن چارجایی بۆ دو هزار و پێنج سەد سەنتیمەترێن سێ جایی)، و دەمێ مەعیدە ژێك دهێتە دەر خوارن دبیتە ئارمانج؛ ل ڤێرە ئەم دێ ژین دا بخۆین!.

راستییەکا گەلەك حێبەتی یا هەی، بەلێ یا جێهگرە ب شێوەکێ ڤەبر، ئەو ژی سیستەمێن سەرەدەرییا لەشان د گەل خوارنێ پێدڤی رۆژیگرتنێ دکەت، چونکی خودێ وەسا لەش یێ چێکری ل دویف پێکهاتەیێن خوارنێ ب گونجیت و ل دویف سیستەمەکی کو ب رێك و پێك بچیت، و د سێ قۆناغاندا رێك دکەڤیت، و ئەڤە ڤەکۆلینەکا گەلەك گرنگە.

قۆناغا ئێكێ: قۆناغا هەرسكرنا خوارنێ د مەعیدەی و رویڤیكاندا، پاشی مێژتن و دەربرینا خۆراكی (گوهۆرینا خوارنێ بۆ وزێ)، و گوهۆرینا خوارنێ بۆ شەكرەكا ب ساناهی د خوینێدا، و بۆ كەرستێن دی یێن سەخبێركری كو لەش ب كار دئینیت بۆ هاڤێتنا وزێ و ئاڤاكرنا شانەیان.

قۆناغا دووێ: قۆناغا عومباركرنا وزا زێدە كو یا زێدەیە ژ پێدڤییا لەشێ مرۆڤی، و شەكرا زێدە دێ د مێلاكێ و ماسۆلكاندا عومبار بیت ل سەر نشایا گیانەوەری، و دوهنێ زێدە ژی عومبار دكەت د بەهرا پترى لەشیدا.

یا ئێكێ هەرسكرن، و مێتن، و مەزاختنە، و یا دووێ عمباركرنە.

قۆناغا سێیێ: ئەو قۆناغە یا ڤەكرنا عومبارێن وزێ، و گوهۆرینا شەكرێ و دوهنان بۆ شەكر و ترشێن دوهنی، دا وزا خۆ باڤێژیتە د لەشیدا، قۆناغا سێیێ سالۆخەتەكێ تایبەت یێ هەی، ئەو ژی ب هەمیڤە روی نادەت ئەگەر مرۆڤ بۆ ماوەكێ دەمی یێ دەستنیشانكری خوارنێ ل خۆ قەدەغە نەكەت، ل ڤێرە كریارا سێیێ یا ژ كار كەڤتییە ئەگەر مرۆڤ خوارنێ ل خۆ قەدەغە نەكەت!

زانا دبێژن: (ئاستێ شەكرێ دەست پێ دكەت د ناڤ خوینێدا ژ هەشتێیێ بۆ سەد و بیست ملی گرامان د هەر سەنتیمەترەكا سێ جاییدا، و پشتی رۆژیگرتنا شەش دەمژمێران ئەڤ رێژە كێم دبیت، و ل ڤێرە حێبەتییەك ژ حێبەتییێن لەشێ مرۆڤی ئاشكەرا دبیت؛ مەلبەندەك یێ د مێشكیدا دێ نامێن ب لەز ڤرێكەت بۆ كۆرە رژێنان دێ داخوازا هاریكارییێ ژێ كەت، و رژێنا ئەدرینالی دێ هۆرموونەكی بەردەت نشایا گیانەوەری د ماسۆلكان و مێلاكێدا بگوهۆریت بۆ شەكرێ ب رێكا هۆرموونەكی، و رژێنا پەریزادێ دێ هەمان كار كەت ب رێكا هاڤێتنا هۆرموونێ خۆ، كو ئاماژێ ب شەكرا عومباركری یا خوینێ دكەت د ماسۆلكان و مالێكێدا كو باڤێژیت و بمەزێخیت، چونكی رێژا شەكرێ د ناڤ خوینێدا نزم دبیت پشتی بۆرینا شەش دەمژمێرێن رۆژیگرتنێ، و رژێنا دی ئەو ژی پەنكریاسە، ئەو ژی هەمان كار دكەت ب رێكا هۆرموونی كو ئاما ژێ ددەتە ڤان عومباركرییان كو بچن دا بهێنە مەزاختن، و دەمێ مرۆڤی ئەوێ عومباركری

ل دهڤ خۆ مەزاخت ژ شەکرێ د ماسۆلکە و مێلاکا خۆدا، دێ کار بۆ هندێ هێتە کرن ئەو دوهنێن عومبارکری پویچ ببن، و وزا وێ دێ هێتە بەردان، و ڤەکۆلینێن زانستی یێن دوپاتکری کو سۆتن یان تێبرنا دوهنی د ماوێ ب درێژاهییا دەمژمێرێن رۆژییێدا زێدە دبیت، و دوهنێن کەڤتینە سەرێك ل جهێن پێڤەنسیان و گیرهەبوونا وان د لەشیدا دهێنە تێبرن.

راستییەکا حێبەتییە، هەر کیلۆگرامەکا ژ شانێن دوهنی پێدڤی ب سێ کیلۆمەترێن مولۆلەیێن خوینێ هەیە کو خوین د ماوێ واندا بچیت، و ئەڤە بارگرانییە ل سەر دلی، و ئەگەر مرۆڤەك ڤەبارێ خۆ دەھ کیلۆگرامان زێدە بکەت، ئەڤە بەلگەیە بۆ وێ چەندێ کو وی سێ سەد کیلۆمەترێن مولۆلەیێن خوینێ یێن زێدە هەنە! و زانا دبێژن: (فیزیۆلۆجیا ئافراندنا لەشان دخوازیتە هندێ کو ڤەدەغەکرنێ بکەن بۆ خوارنێ) بۆچی؟ ژ بۆ رێدانا کارێ ئێکێ و یێ دووێ، و ژ بۆ رێدانا دەلیڤێ بۆ کارێ کریارا سێیێ (مەرم پێ هەر سێ ڤۆناغێن هەرسکرنێنە)، رۆژی کریارا هەرسکرن و مێژتنا خوارنێ تەنا دکەت، و کریارا دووێ تەنا دکەت، کو ئەو ژی عومبارکرنا وییە، و ما کارێ سێیێ ئەو ژی ژ ناڤبرنا دوهنی و سۆتنا وان، و مەزاختنا دوهنا د ماسۆلکە و د خوینێدا، و ژ بەر کو رۆژی یا پێدڤییە بۆ هەمی مرۆڤان ئەڤ فەرزە ل سەر هەمی گەل و نەتەوەیان بوو، خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٨٣)) [البقرة]، (ئانکو: گەلی خودان باوەران، رۆژی ل سەر هەوە هاتە نڤێسین، هەر وەکی ل سەر یێت بەری هەوە هاتییە نڤێسین، بەلکی هوین پارێزکارییێ بکەن).

ئەڤ ڤەکۆلینا زانستی رامانێ ب تشتەکێ هویربین دکەت، ئەو ژی رۆژی پەرستنە، و نێزیکبوونە ژ خودێ، و پتر پەیوەندییە بۆ خودێ، و هەر کارەکێ مرۆڤ بکەت بۆ مرۆڤییە ب تنێ رۆژی نەبیت، کو ئەو دێ خەلاتێ مرۆڤی ب رۆژییێ دەت[1]، و

---

(١) زار ئەبی هورمیرە گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: ((قال الله تعالى: كل عمل ابن آدم له إلا الصيام فإنه لي وأنا أجزي به)) بوخاری (١٨٠٥)، و موسلم (١١٥١).

رۆژیگرتن هێزکرنه بۆ شیانا مرۆڤی، دا مرۆڤ هەست ب لاوازبوونا خۆ یا مرۆڤی بکەت، و ئەڤ ڤەکۆلینا زانستی ئارمانجا ئێکێ یا رۆژییێ کێم ناکەت کو ئەو ژی پەرستن و نێزیکبوونە، بەلێ فەرمانا خودێ یا جۆرە و جۆرە کو ئەو پەرستنە، و ئەو نێزیکبوونە، و ئەو قەدەغەکرنە، و ئەو پەیوەندی و پێدڤیبوونە، و زێدەباری ڤێ هەمییێ ژی ساخلەمییە.

# هندەك وەسیەتێن پێغەمبەری یێن ساخلەمییا پاشیڤێ و فتارەكرنێ

دێ بەحسێ هندەك ئاماژێن ساخلەمییێ كەین یێن پێغەمبەری ﷺ ئاماژە پێ كری بۆ رۆژیگران، ژ زارێ ئەنەسێ كورێ مالكی رضي الله عنه دبێژیت: پێغەمبەری (سلاڤ ل سەربن) گۆت: ((تسحَّرُوا فإنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً))[1]. (ئانكو، پاشیڤێ بخۆن، چونكی بەرەكەت یا د پاشیڤێدا).

و د ریوایەتا نەسائیدا: ((إنَّهَا بَرِكَةٌ أعطاكُمُ اللهُ إيَّاها فلا تدَعُوهُ))[2]. (ئانكو، ئەو بەرەكەتە خودێ دایە هەوە ژ خۆ نەكەن).

زانایێن فەرموودێ ئەڤ بەرەكەتە ب دو رامانان راڤە كر: یان ئەو بەرەكەتە د دنیایێدا، یان بەرەكەتە د ئاخرەتێدا، ئەوێ ژ خەو هشیار دبیت بۆ خوارنا پاشیڤێ، چێ دبیت ئەو نڤێژا سپێدێ ل مزگەفتێ بكەت، چێ دبیت گوهـ ل ئایەتەكێ بیت پشتی نڤێژا سپێدێ كاریگەرییەكا مەزن ل وی بكەت، چێ دبیت زكرێ خودێ ب دل سافی بكەت و چاڤێن وی تژی رۆندك ببن، چێ دبیت قورئانێ بخوینیت ببیتە بهارا دلێ وی، ئەڤ خێرە هەمی بۆ دهێن، ئەڤە هەمی بۆ دهێن ژ هشیاربوونا وی بۆ پاشیڤێ دا خوارنێ بخۆت، ئەڤە بەرەكەتا ئاخرەتێیە.

و بەرەكەتا دنیایێ، دەمێ رۆژیگری خوارنا پاشیڤێ خوار، و ئەڤ رۆژیگرە ژ وان كەسان بیت ئەوێن كارێن ب زەحمەت هەین دشێت بەردەوامییێ بدەتە رۆژیێ هەتا كارێ زێدە ب زەحمەت ژی، چونكی لەشێ مرۆڤی پێدڤی ب وزێ هەیە، و وزا وی خوارنە، و خوارنا پاشیڤی ژ سوننەتێیە.

---

(١) بوخاری (١٨٢٣)، موسلم (١٠٩٥)، ترمزی (٧٠٨)، نەسائی (٢٤٥٦)، ئیبن ماجە (١٦٩٢).

(٢) نەسائی (٢٤٧٢).

و دیسا گیرۆکرنا پاشیڤێ ژ سوننەتێیە، و ئەڤێ هەتا نیڤا شەڤێ دمینیتە هشیار، و پاشیڤێ دخۆت، پاشی دنڤیت، چێ دبیت نڤێژا سپێدێ ژێ بچیت، و سوننەتا گیرۆکرنا پاشیڤێ ژ دەست وی دچیت، و پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((لا تزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الإِفْطَارَ وَأَخَّرُوا السُّحُورَ))[1]، (ئانکو: ئوممەتا من دێ مینیت یا باش هندی ئەو پاشیڤێ گیرۆکەن، و لەزێ ل فتارەکرنێ بکەن).

تشتێ کو پێدڤییە بۆ هەوە دوپات بکەین، مرۆڤ دەمێ خوارنا پاشیڤێ دخۆت، و ئێکسەر دچیتە د نڤینێت خۆرا، چێ دبیت هەرسکرنا وی یا خوارنێ تێك بچیت، و چێ دبیت هندەك نەخۆشی بگەهنە ساخلەمییا وی یێن گرێدایی ب خوارنێڤە، پێدڤییە دەمەك هەبیت د ناڤبەرا خوارنا پاشیڤێ و نڤستنێدا، ئەڤ دەمە پێدڤییە ب خواندنا قورئانێ و نڤێژێ، و زکری بهێتە بۆراندن.

زار ئەنەسێ کورێ مالکی رضي الله عنه دبێژیت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((مَنْ صَلَّى الغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): تَامَّةٍ، تَامَّةٍ، تَامَّةٍ))[2]. (ئانکو: یێ نڤێژا سپێدێ ب جماعەت بکەت، پاشی روینت زکرێ خودێ بکەت هەتا رۆژ دهەلێت بۆ وی هندی خێرا حەجەکێ و عومرەکێیە، و پێغەمبەری ﷺ گۆت: یا تمام، یا تمام، یا تمام).

پێغەمبەر ﷺ فەرمانێ ل مە دکەت لەزێ د فتارەکرنێدا بکەین، ئانکو: دەمێ مەغرەب دبیت رۆژیگر فتارێ بکەت، خوارنێ بخۆت یان نەخۆت، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری ﷺ هندەك قەسب دخوارن، یان هەر تشتەکێ شرینێ ب سناهی، یان قورچەکا ئاڤێ، پاشی نڤێژا مەغرە بکەت، و پاشی خوارنێ بخۆت، و ل ڤێرە دێ برسا وی ب دویماهی هێت، و ئەندامێن وی دێ هەڤسەنگ بن، و شەکرا قەسپێ دێ چیتە د ناڤ خوینا ویدا، دێ توندیا برسا وی سڤك بیت، و دێ وەلێ کەت خوارنەکا ناڤنجی بخۆت، هەر وەکی

---

(١) ئەحمەد (٢١٣٥٠).

(٢) ترمزی (٥٨٦).

ئەو د فتارەکرنێدا، و دیسا ئەڤە ژی ژ سوننەتێیە، و ژ بەر وی کەسێ بڤێت نڤێژێ بکەت بەری خوارنێ بخۆت، بەلێ ئەگەر ئەڤە بۆ مرۆڤان یا ب زەحمەت بیت، یا ب ساناهیتر ئەوە د گەل کۆمێ بخۆت د دەمەکێ گۆنجایدا، بەلێ یێ بڤێت بۆ ساناهی بکەڤیت سێ قەسپا بخۆت، و نڤێژا مەغرەب بکەت، و پاشی خوارنێ بخۆت، ئەڤە ژ سوننەتێیە.

پێغەمبەری ﷺ نڤستنا نیڤرو (قەیلولە) یا کرییە سوننەت کو ئەم ب کار بینین بۆ رابوونێ، و پاشیڤێ بخۆین بۆ رۆژییێ، پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((قِيلُوا فإنَ الشَيَاطِينَ لَا تقِيلُ))[1]. (ئانکو: قەیلوولێ بکەن، چونکی شەیتان قەیلوولێ ناکەن).

ئەگەر مرۆڤ بشێت د رەمەزانێدا بنڤیت خۆ دەمژمێرەك ژی بیت د دەمێ قەیلوولێدا، چونکی د ڤێ قەیلوولێدا هاریکاریکرنەکە بۆ کرنا تەراویحان، رۆژی هەمی ژ بەر ڤێ نڤێژێیە، دا ئەڤ نڤێژە بهێتە کرن و تو یێ چالاك، و بەرهەمێ نڤێژێ ب دەست خۆ بێخی، و د قورئانێ بگەهی، و دا دلێ تە ب ڤیانا خودێ نەرم بیت، ل ڤێرە نڤێژە یا گونجای، و قەیلوولێ ب کار بینە.

ئەڤە هندەك ئامارێن ساخلەمییێ یێن پێغەمبەری بوون ﷺ.

---

(١) فیردەوس (٤٥٧٠)، أسنى المطالب (١٠١٠/١) تەفسیرا قورتوبی (٢٣/١٣)، فتح الباري (٧/١١) و إتحاف السادة المتقين (١٤٣/٥)، مجمع الزوائد (١١٢/٨)، الجامع الصغير ( ٦١٦٨) وهو حديث حسن عن أنس.

# پەیوەندی د ناڤبەرا رۆژێن سپی و رۆژیگرتنا وان یا ساخلەمییێ

ژ زارێ ئەبی زەر، دبێژیت: ((أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) أنْ نَصُومَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاثَةَ أيَّامِ البيضَ ثَلاثَ عَشْرَةَ وَأرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ))[1]. (ئانکو: پێغەمبەری ﷺ فەرمانا مە کر ئەم هەر هەیڤێ سێ رۆژییان بگرین ژ رۆژێن سپی ئەو ژی رۆژێن سێزدێ و چاردێ و پازدێ).

ئەوا د ڤێ فەرموودێدا هاتی دشێین بینینە دەر کو پێکڤە گرێدانەکا موکم د ناڤبەرا ڤێ فەرموودێ و راستییەکا زانستیدا یا هەی، ئەو ژی یاهاتییە دوپاتکرن کو پەیوەندییەکا هەی د ناڤبەرا بزاڤا مرۆڤی د ژیانێدا و خوّلا هەیڤێ، ڤەکۆلەرەك دهێت و بادەکێن دەزگەهێن پۆلیسان د رۆژێن دکەڤنە رۆژێن سپیدا کۆمکرن، بۆ دیار بوو رێژا رویدانان د ڤان رۆژاندا پترە ژ رۆژێن دی، دەمێ مرۆڤ سێ رۆژییان دگریت ژ هەر هەیڤەکێ، و نەخاسمە ئەو مرۆڤێن تۆرەیییا وان یا بلند، رۆژێن سپی، ئانکو سێزدێ، و چاردێ، و پازدێ، کارتێکرنا خۆ یا ل سەر وان هەی، ئەڤا بۆ پێغەمبەری ﷺ دهات وەکی هوین دزانن نە ژ شارەزاییا وی بوو، و نە ژ زیرەکییا وی بوو، و نە ژ رەوشەنبیرییا وی بوو، و نە ژ زانینا وی یا کەسایەتی بوو، بەلکو ئەو وەحییە ژ لایێ خودێڤە بۆ دهات، چێ دبیت پەیوەندییەك د ناڤبەرا خوّلا زڤرینا هەیڤێ و تێکچوّنا مرۆڤیدا هەبیت، و رۆژی تێکچوّنا دەروونی هێمن دکەت، و ژ تێکئاریانا وێ.

---

(١) نەسائی (٢٧٣٩).

# پشکا شەشێ

## دوگیانی و کۆرپەلە و ژ دایکبوون

١- بوماوەزانی ( علم الوراثة ) د سوننەتا پێغەمبەریدا

٢- ژ ئیعجازا قورئانێ کۆرپەلەزانی ( علم الأجنة )

٣- رێککەفتنا کۆرپەلەزانی د گەل فەرمووددا پێغەمبەری

٤- نە ب هەمی ئاڤێ بچویك چێ دبیت

٥- (ثُمَّ جَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَكِينٍ)

٦- هەر سێ قۆناغێن دوگیانیێ

٧- شلێ ئەمنیووسی

٨- هەڤالبچویك پەردەکا ب ئاقلە یان تەقدیرەکا خوداییە؟

٩- دوگیانی و راوەستانا خوین دیتنێ ( عادە )

١٠- کۆرپەلە ( الجنین ) و هەستێن وی

١١- تووندییا دەروونی د ماوێ دوگیانییێدا ئەگەرەکە د تێکچۆنا شێوەییێدا د کۆرپەلەیدا

١٢- ڤیانا دایکێ و شیرێ وێ

١٣- ئەگەرێ زانستی یێ بنەمایێ (يُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يُحَرِّمُ مِنَ النَّسَبِ)

# بوماوەزانی ( علم الوراثة ) د سوننەتا پێغەمبەریدا

پێغەمبەری ﷺ د هندەك فەرموودەیێن خۆدا ئەنجامێن كریاری دیاركرینە بۆ یاسایێن بوماوەزانییێ، وەكی دهێتە زانین كو هێكا پیتێنكری خانەكە كو ناڤك و بۆیاغ و جین یێن تێدا، و هژمارا زانیارییێن ل سەر جینان گەلەكن، و هەتا نوكە ب تنێ هەشت سەد جین یێن هاتینە زانین، ئەڤ جینێن د چپكا ئاڤا زەلامیدا دێ كارلێكێ د گەل جینێن د هێكێدا كەن، و دێ بیتە هێكەكا پیتێنكری ژ جینێن چپكێ و جینێن هێكێ، و ئەڤەیە یا خودێ دیار كری دەمێ دبێژیت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا (٢)﴾ [الانسان]، (ئانكو، ب راستی مە مرۆڤ ژ چپكەكا ئاڤا ژن و مێران یا تێكەل یێ چێ كری، دا بجەرببنین كا پاشی دێ چ كار و كریاران كەت، و مە ب گوه و چاڤ ئێخست).

زانایێن بوماوەزانییێ دبێژن: (مەهركرنا د ناڤبەرا نێزیكێن مرۆڤی ب پلە ئێك، خەلەتییان د جیناندا ڤەدگوهێزیت، یان لاوازییێ، یان نەخۆشییان، یان سالۆخەتێن نەسروشتی دێ هێنە ڤەگوهاستن بۆ نڤشێن دویڤدا ب رێژا پێنجی ژ سەدێ، و پلەیا دووێ ژ مەهركرنا نێزیكێن خۆ ب رێژا دوازدە ژ سەدێ، و پلەیا سێیێ شەش ژ سەدێ، ئەڤ راڤەكرنا زانستی ل دویڤ گۆتنا خودێیە: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ﴾ [النساء]، (ئانكو، ل سەر هەوە هاتە حەرامكرن و نەدورستكرن (ماركرنا) دەیكێت هەوە، و كچێت هەوە، و خویشكێت هەوە، و مەتێت هەوە، و خالەتێت هەوە، و برازایێت هەوە، و خوارزایێت هەوە، و دەیكێت هەوە یێت شیری، و خویشكێت هەوە یێت شیری).

نێزیکییا پله چار رێژا ڤەگوهاستنا خەلەتییێن د جیناندا کێمتره، و یا ژ عومەرێ کورێ خەتابی رضي الله عنه هاتییه ڤەگوهاستن: (إغتربُوا، لا تضنووا)[1]، (ئانکو: خزمانییا دویر و بیانی بکەن، پێچاره و لاواز نابن).

هەر چەند هەلبژارتنا هەڤژینییێ یا دویر بیت، دێ دویندەهـ یا ب هێز بیت.

و عومەرێ کورێ خەتابی رضي الله عنه دبێژیت: ((لا تنكِحُوا القَرَابَةَ القَرِيبَة، فإنَ الوَلَدَ يَخلَقُ ضَاوِيا))[2]، (ئانکو، نێزیکێن خۆ (مرۆڤێن خۆ) ماره نەکەن، ئەو زارۆکێ دبیت دێ یێ لاواز بیت). و پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((تخَيَرُوا لِنطَفِكُمْ، فإنَ النِّسَاءَ يَلِدْنَ أشْبَاه أخْوَانِهِنَ وَأخْوَاتِهِنَ))[3]، (ئانکو، یا باش بۆ خۆ هەلبژێن، چونکی ئەو زارۆکێن ژنێ دبیت ددەنە ب برایێن خۆڤە و خویشکێن خۆڤە).

و خەلك ب گشتی دبێژن: زارۆك وەکی خالێ خۆیە، یان خالەتا خۆ.

---

1) ئیبن حەجەر د (تلخيص الحبير)دا بەحس کرییه (١٤٦/٣)، دبێژیت: یا د (غریب الحدیث)دا هاتی یا ئیبن قوتەیبەی، کو دبێژیت: یا د فەموودێدا هاتی: (اغتربوا، لا تضووا)، و یا راڤەکری و دبێژت: (الضاوي) ئانکو: ئەوە یێ ژ لایێ لەشیڤە یێ لاواز، دبێژن: (أضوت المرأة) ئەوە دەمێ کورەکێ لاواز دبیت، و مەرەم پێ ئەوە ژ بیانییان مەهرە بکەن نە ژ نێزیکان)، و بەرێ خۆ بدە النهاية في غريب الحديث (١٠٦/٣)، د ڤێرەدا دبێژیت: (ئانکو هەڤژینییێ د گەل بیانییان بکەن نە ژ نێزیکان) چونکی ئەو زارۆکێ ژ یا بیانی دبیت دێ عەسل پاکتر و ب هێزتر بیت ژ یا نێزیك. و دەمێ دبێژن (ضوت المرأة) ئەوە دەمێ ژنێ زارۆکەکێ لاواز دبیت، و رامانا (لا تضووا): دا زارۆکێن لاواز نەبن، ئانکو: لاواز و بێ هێز، و ئێکا وێ دبیته (ضاو)).

(٢) النهاية في غريب الحديث (١٠٦/٣)، و بەرێ خۆ بدە (تلخيص الحبير لابن حجر (١٤٦/٣).

(٣) أخرجه ابن ماجه (١٩٦٨) بلفظ: ((تخيروا لنطفكم، وانكحوا الأكفاء، وأنكحوا إليهم))، والحاكم في مستدركه (٢٦٨٧)، والبيهقي في السنن الكبرى (١٣٥٣٦)، والدار القطني في السنن (١٩٨).

و د فەرموودەکا دیدا پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((أطلبُوا مَوَاضِعَ الأكْفاءِ لِنطفِكُم، فإنَّ الرَّجُلَ رُبَمَا أشْبَهُ أخْوَالَهُ))[1]، (ئانکو، وان هەڤژینان بۆ خۆ بینن ل دویڤ ئاستێ هەوە، بەلکی ئەو کورێ ژێ دبیت بدەته ب خالێن خۆڤە).

و ژ زار عائیشایێ دبێژیت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: ((تخَيَّروا لِنطفِكُم، وَانكِحُوا الأكْفَاءَ، وأنكِحُوا إلَيهِم))[2]، (ئانکو، یا باش بۆ خۆ هەلبژێرن، و یێن هێژا و کێرهاتی بۆ خۆ بینن).

و باشترکرنا دویندەهێ دهێته هژمارتن ژ باشترین زانستێن بوماوەزانییێ، ئانکو نفشێن بهێن خودان شیانێن عەقلێن بلند بن، و خودان ئاڤاکرنەکا لەشی یا ب هێز بن، و خودان دەروونەکێ ڤەکری بن، نە د لاواز و نەساخ بن، ئەڤەیە پێغەمبەری ﷺ مەرەم پێ هەی.

ژ بەر ڤێ چەندێ تە گەلەك ماف یێ ل سەر کورێ خۆ هەی، و وی مافێ ئێکێ و دەستپێکێ یێ ل سەر تە هەی، ئەڤ مافە ئەوە مرۆڤ هەلبژارتنەکا باش بکەت بۆ هەلبژارتنا دایکا وی، ئەڤە ئێکەم مافە ژ مافێن زارۆکێن تە ل سەر تە بەری ئەو بهێنە دنیایێ.

و بەری مرۆڤ هەڤژینەکێ بۆ خۆ هەلبژێریت، دایکا زارۆکێن خۆ، هەڤالا ژیانا خۆ، دڤێت ل سەر ڤێ هەلبژارتنێ ماوەکێ درێژ راوەستیت، دا سوننەتا پێغەمبەری ب جهـ بینیت: ((مَنْ تزَوَّجَ المَرأةَ لِجَمَالِهَا أذَلَّهُ اللهُ، وَمَنْ تزَوَّجَ لِمَالِهَا أفقَرَهُ اللهُ، وَمَنْ تزَوَّجَ لِحَسَبِهَا زَادَهُ اللهُ دَنَاءَةً، فعَلَيكَ بِذَاتِ الدِّينِ ترِبَتْ يَدَاك)). (ئانکو، یێ ژنێ بینیت ژ بەر جوانییا وێ خودێ دێ وی رەزیل کەت، و یێ بینیت ژ بەر مالێ وێ دێ خودێ وی هەژار کەت، و یێ بینیت ژ بەر رهـ و ئویجاخا وێ دێ خودێ وی بێخێر کەت، پێدڤییە ل سەر بنیاتێ ئایینی هەلبژێری).

---

(١) بەرێ خۆ بدە كشف الظنون (٩٦٠)، و(٢٩١٧)، و أخرجه أحمد (٢٤٦٥٤) بلفظ: ((إذ علا ماؤها ماء الرَّجُل أشبَهَ أخْوالهُ وَإذا علا مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَها أشبَهَهُ)).

(٢) أخرجه ابن ماجه (١٩٦٨)، والبيهقي في سننه (١٣٥٣٦).

# ژ ئیعجازا قورئانێ كۆرپەلەزانی (علم الأَجِنَّة)

ژ بەلگەیێن ئیعجازا قورئانا پیرۆز گۆتنا خودێیە: (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣)) [المؤمنون]، (ئانكو، و ب سویند مە مرۆڤ ژ هێڤێنێ هەرییێ چێكرییە. پاشی مە ئەو كرە چپكەك، و د مالبچویكیدا خۆجە كر)، هویربینییێ بكەن د پیتێن (عطف)ێدا، خودێ دبێژیت: (ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ)، و (القرارُ المكينُ) رەحمێ ژنێیە، (ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً) [المؤمنون:١٤]، (ئانكو، پاشی مە ئەو چپكە كرە خوینپارە (خوینەكا قەرسی و پێكڤە)، پاشی مە ئەو خوینپارە كرە گۆشتپارە)، پاشی پیتا (ف) دهێت د گۆتنا خودێدا: (فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا) [المؤمنون:١٤]، (ئانكو، پاشی مە هەستی ژ گۆشتپارەی دا، و مە هەستی ب گۆشتی كراس كر و نخافت).

و ژ خوینپارەی بۆ گۆشتپارەی ب پیتا (ف) یا (عطف)ێ یا هاتی، و دیسا ژ گۆشتپارەی بۆ هەستییان، و ژ هەستییان بۆ گۆشتی، بەلێ ژ چپكێ بۆ خوینپارەی (عطف) یا هاتی ب (ثُمَّ)، و پاشی پیتا (ف) ل سەرێ پەیڤێن ل دویڤدا هاتی، بۆ زانین كو (ثُمَّ) پیتا (عطف)ێیە بۆ سستی و گیرۆبوونێیە (التراخي) د زمانێ عەرەبیدا، بەلێ (ف) پیتا (عطف)ێیە بۆ ل دویڤێك و دویچۆنێ.

نویترین زانیاری د زانستێ كۆرپەلەیدا ئەوە ماوەكێ دەمی یێ هەی د ناڤبەرا قۆناغا چپكێ و قۆناغا خوینپارەیدا، ئەڤ ماوە پترە ژ دو حەفتییان، د ڤی ماوەیدا گەشەبوونا كۆرپەلەی یا هێدی هێدییە؛ چونكی ئەڤ قۆناغە قۆناغا جێهگربوون و پێڤەنسیانا چپكێیە ب دیوارێ رەحمیڤە، و كۆرپەلە د ڤێ قۆناغێدا گەشە نابیت، بەلێ رێكێن مێژتنا خۆ بۆ خوارنێ دڤەوژێریت و خۆجە دكەت، و د ڤێ قۆناغێدا ب تنێ وەكی تلپەكییە (قرص) ژ خانەیێن رێكخستی ل سەر شێوێ دو رێزێن هەمبەری ئێك، و ئەڤ

سستييه د قوّناغا گەشەبوونا كوّرپەلەيدا د حەفتييا دووێ و سێييێدا ژ پيتێنێ .يا هێكێ خودێ ب پيتا (ثُمَّ) دەربرين ژێ كر، و ژ خوينپارەى بوّ گوّشتپارەى خودێ دبێژيت: (فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا)، و د ئێك قوّناغدا خودێ دبێژيت: (ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً).

د ماوێ دو حەفتييياندا ئەڤ هێكا پيتێنەكرى ئەوا بوويە سەد خانە بەرەڤ گەشەبوونێ ناچيت، بەلكو بەرەڤ خوّجهكرن و موكمكرنێ دچيت ب ديوارێ رەحميڤە، ژ بەر ڤێ چەندێ گەشەبوون هێدى هێدى چێ دبيت، قورئان هات كو ئاخفتنا خودێيە ئەڤ راستييا زانستى ب پيتا (ثُمَّ) دەربرى، خودێ دبێژت: (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ (١٤)) [المؤمنون].

ئەڤە گوّتنا خودێيە، ئەڤە گوّتنا ئافرێنەرێ گەردوونانە، و نيشانێن ئيعجازا قورئانێ ب دويماهى ناهێن، و هەر چەند زانست بەرەڤ پێش بچيت روويەك ژ روويێن ئيعجازا قورئانا پيروّز ئاشكەرا دبيت.

# رێککەفتنا کۆرپەلەزانی د گەل فەرموودا پێغەمبەری

کۆرپەلەزانی، زانستەکە دیرۆکا وی یا نوییە، و زانستێ چێبوونا زارۆکی د رەحمێ دایکێدایە، ئەڤ زانستە ل ڤان سالێن دویماهییێ پێشکەفتنەکا مەزن ب خۆڤە دیتییە، هەتا د شیانێن نوژدار و زانایاندایە زارۆکی د زکێ دایکێدا وێنە بکەن د قۆناغێن گەشەکرنا وی و ومرارا ویدا، زارۆکی د زکێ دایکێدا وێنەکێ تایبەت یێ هەی د هەر حەفتییەکێدا، وێنەکێ د حەفتییا سێیێدا و ئێکێ دی د یا چارێ و پێنجێ و شەشێدا، و تشتێ ئەم دێ بەحس ل سەر کەین د ڤان وێنەیان هەمیاندا وێنێ زارۆکییە د رەحمێ دایکێدا د دەستپێکا حەفتییا شەشێدا، ئەم چ دبینین؟

دبینن دفن د گەل دەڤی یا تێکەلە، و د گرێداینە ب چاڤانڤە، و دێ دەستی بینین وەکی دەستکەکێ کورت یێ گەمییێ، و سەر یێ ب لنگانڤە، ئەڤە وێنێ زارۆکییە د دەستپێکا حەفتییا شەشێ، و دەمێ ئەڤ حەفتییە ب دویماهی دهێت دێ سەر ژ لنگان دویرکەڤیت، و دێ جهێن چاڤا دیار بن و دیسا دەڤ و دفن، و وێنێن دەست و پێیان، ئەڤە وێنێن دویماهییا حەفتییا شەشێنە، و حەفتی وەکی ئەم دزانین حەفت رۆژە، ئەگەر ئەم حەفت لێکدانی شەشێ بکەین، دێ ژمارە چل و دو (٤٢) دەرکەڤیت.

ژ زار عەبدولایێ کورێ مەسعودی دبێژیت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((إِذَا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً، بَعَثَ اللهُ إِلَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَهَا، وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرِهَا وَجِلْدُهَا وَلَحْمُهَا وَعِظَامُهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ، أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى فَيَقْضِي رَبُّكَ مَا شَاءَ، وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! أَجَلُهُ؟ فَيَقُولُ رَبُّكَ مَا يشاءَ، وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! رِزْقُهُ؟ فَيَقْضِي رَبُّكَ مَا شَاءَ، وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَخْرُجُ الْمَلَكُ بِالصَّحِيفَةِ فِي يَدِهِ، فَلَا يَزِيدُ عَلَى أَمْرٍ، وَلَا يَنْقُصُ))(١)، (ئانکو، دەمێ چل و دو رۆژ ل سەر چێکا ئاڤا زەلامی د رەحمێ ژنێدا

---

(١) موسلم (٢٦٤٥)، تەبەرانی د (المعجم الكبير)دا (٣٠٤٤)، بەیهەقی د (سنن الكبرى)دا (١٥٢٠١).

دبۆرن، دێ خودێ ملیاکەتەکی ڤرێ کەت دێ وێنە کەت، گوه و چاڤ و چەرم و گۆشت و هەستیێن وی چێ کەت، پاشی ملیاکەت دێ بێژت: هەی خودا، یێ نێرە یان مێیە؟ دێ خودێ وی تشتی کەت یێ وی بڤێت، پاشی دێ ملیاکەت نڤێسیت، پاشی دێ بێژیت: هەی خودا عەجەلێ وی؟ دێ خودێ وی تشتی کەت و بێژیت یێ وی بڤێت، و دێ ملیاکەت نڤێسیت، پاشی دێ ملیاکەت دەرکەڤیت ب وێ نڤێسینێڤە یا د دەستێ ویدا، و چو تشتا نە زێدە دکەت و نە کێم).

بەرێ خۆ بدێ چاوا ئەڤ فەرموودە رێك دکەڤیت ب رێککەفتنەکا گەلەك هویربین د گەل وان وێنێن بۆ کۆرپەلەی (زارۆکێ د زکێ دایکا خۆدا) دهێنە کێشان، کو ئەو د دویماهییا حەفتییا شەشێدا، خودێ دبێژیت: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)) [النجم]، ئانکو، ئەو (بەحسێ پێغەمبەرییە)، ژ دەڤ خۆ و ژ دلخوازییا خۆ نائاخڤیت. و نائاخڤیت ئەگەر ژ وەحییێ نەبیت (ئانکو قورئان ژ وەحییێ پێڤەتر نینە).

# نە ژ هەمی ئاڤێ زارۆك چێ دبیت

ژ بەلگەیێن پێغەمبەرییا موحەممەدی ﷺ: کو وی ل سەر هندەك تشتا ئاخفتییە زانستێ نوکە ئەو تشت ئاشکرا کرینە، د فەرموودەکا سەحیحدا پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَد، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٍ))[1]، (ئانکو، نە ب هەمی ئاڤا زەلامی زارۆك چێ دبیت، و ئەگەر خودێ ڤیا تشتەکی چێ کەت چو تشت نابنە رێگر ل بەر وی).

و زانستێ نوکە دبێژیت: هژمارا سپێرمێن زەلامی د ئاڤا ویدا د ئێك جاردا دەمێ گەهشتنا ژن و مێران پترن ژ سێ سەد ملیۆنان، و هەر سپێرمەکێ سەر و مایتۆکۆندریا (حەفك) و کوری یێن هەین، و د ناڤ شلەکێدا دخۆن و بزاڤێ دکەن، و ئەڤ شلە بزاڤا وان ب سناهی دئێخیت، و ئەڤ هژمارا مەزن یا سپێرمان ـ سێ سەد ملیۆن ـ بەر ب هێکێڤە دچن کو ب تنێ ئێك ژ وان ڤێ هێکێ دپیتێنیت (تلقیح) دکەت ژ سێ سەد ملیۆن سپێرمان، چاوا ئەڤ چەندە پێغەمبەری زانی، ژ کیژ تاقیگەهێ ئەڤ پێزانینە وەرگرتینە؟ ژ کیژ ڤەکۆلینا زانستی ئەڤ راستییە وەرگرتییە؟ و چاوا گەهشتییە ڤێ چەندێ؟

ئەڤە هەمی پێکڤە (سێ سەد ملیۆن سپێرم) دگەهنە هێکێ، و دێ هێك ب تنێ سپێرمەکێ هەلبژێریت.

چاوا ئەڤ سپێرمە دچیتە د ناڤ هێکێدا؟ تشتەکێ نەشیاندارە! ئەو ژی دەمێ ئەڤ سپێرمە ب دیوارێ هێکێ دکەڤیت دێ پەردێ وێ درینیت، دێ کەرستەکێ تیر ژ سەرێ سپێرمێ دەرکەڤیت، کو یێ پەردەپۆش کرییە ب تیفلەکێ، ژ جۆرێ کورنیا چاڤی، دێ دیوارێ هێکێ حەلکەت و چیتە د ناڤدا، و ئەو جهێ تێڕا دچیت دێ هێتە گرتن.

---

(١) موسلمی ڤەگوهاستییە (١٤٣٨)، و ئەحمەد (١١٤٥٦) ژ زارێ ئەبی سەعیدێ خودری.

ئەڤ هێکە خانەیە، و چیپك ژی خانەیە کو نافك یا تێدا، و دیسا کەرستە و پەردە یێن تێدا، و ل سەر چیپکێ (سپێرم) و نافکا هێکێ زانیاری یێن هەین، زانا دبێژنێ جین، ژمارا وان پتره ژ هندەك ملیۆن زانیارییان د چیپکەکێدا، و دیسا د هێکێدا ژی هەمان زانیارینە، و ئەڤ ژمارە یا حێبەتییە، کو ئەڤ زانیارییە د پرۆگرامکرینە، و د دەمەکێ دەستنیشانکریدا کارا دبن.

و هەر زانیارییەك دەمەکێ دەستنیشانکری بزاڤێ دکەت، ل وی دەمێ دەنگێ گەنجی ستویر دبیت، دێ ئەڤ زانیارییە بزاڤێ کەت، دەمێ رهێن وی دهێن، و دیسا دەمێ سینگێ کچێ گەشە دبیت.

چەند ملیۆن زانیاری یێن نڤێسینە ل سەر نافکا چیپکێ، و ل سەر نافکا هێکێ، و پشتی هێك دهێتە پیتێنەکرن ب چیپکێ (سپێرمێ)، ئەڤ هێکا پیتێنەکری دێ پارچە پارچە بیت.

ئەڤ هێکا پیتێنەکری دابەش دبیتە سەد پشکان، دەمێ ئەو د رێکا خۆدا بەر ب رەحمیڤە دچیت، و پاشی دگەهیتێ، ل ڤێرە زانستەکێ تایبەت یێ هەی، دبێژنێ کۆرپەلەزانی (علم الأجنة)، چو رۆژ و حەفتی و هەیڤ تێرا ڤەکۆلینا هویربینییێن وی ناکەن، خودێ دبێژیت: (إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا (٢)) [الانسان].

# ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ

ل سەدێ هەژدێ زایینی دەمێ جیهانا رۆژئاڤا رێکا زانستی گرتی، و پشتی تلسکۆپ چێ کری، ئەڤ هزرە د مێشکێ زانایاندا جێهگر بوو کو مرۆڤ یێ ژ ئاڤا زەلامی ب تنێ هاتییە ئافراندن، پاشی ئەڤ بیردۆزە هاتە گوهۆرین، گەهشتنە وێ باوەرێ کو بچویك ب تنێ ژ ئاڤا ژنێ چێ دبیت، کو ئاڤا زەلامی ب تنێ هۆشدارییەکە بۆ ڤێ چەندێ، و زانا ل هەردو سەدێن هەڤدێ و هەژدێ زایینی کەفتبوونە د ناڤ بیردۆزاندا، بەلێ دەمێ پسیار ژ پێغەمبەری هاتییە کرن بەری چاردە سەدەیان، ئەڤ پسیارە: مرۆڤ ژ چ چێ دبیت؟ بەرسڤەك دا ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا وینە، ژ زارێ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی ﷺ دبێژیت: ((مَرَّ يَهُودِي بِرَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يُحَدثُ أصحابه، فقالت قريش: يا يهودي، ان هذا يزعم أنه نبي، فقال: لأسألنه عن شئ لا يعلمه الا نبي، قال: فجاء حتى جلس، ثم قال: يا محمد، مم يخلق الانسان؟ قال: يا يهودي، من كل يخلق، من نطفة الرجل ومن نطفة المرأة، فأما نطفة الرجل فنطفة غليظة منها العظم والعصب، وأما نطفة المرأة فنطفة رقيقة منها اللحم والدم، فقام اليهودي، فقال: هكذا كان يقول من قبلك))[1]، (ئانکو: جوهییەك د بەر پێغەمبەرێرا ﷺ بۆری، دەمێ پێغەمبەر د گەل هەڤالێن خۆ دئاخفت، ئینا قورەیشییان گۆتە ڤی کەسێ جوهی: ئەڤە (موحەممەد) یێ دبێژیت: ئەز پێغەمبەرم، ئینا یێ جوهی گۆت: ئەز دێ پسیارا تشتەکی ژێ کەم کەس نوزانیت ب تنێ پێغەمبەر نەبن، ئینا ئەڤ کەسێ جوهی چۆ دەڤ پێغەمبەری و روینشت، پاشی گۆت: هەی موحەممەد: مرۆڤ ژ چ چێ دبن؟ ئینا پێغەمبەری گۆت: هەمی مرۆڤ ژ چپکا ئاڤا زەلامی و ئاڤا ژنێ چێ دبن، و ئاڤا زەلامی ئاڤەکا ستویرە، هەستی و دەمار ژێ چێ دبن، و ئاڤا ژنێ تەنکە خوین و گۆشت ژێ چێ

(١) ئەحمەد (٤٤٣٨).

دبن، ئینا ئەڤ کەسێ جوهی رابوو، و گۆت: ئەڤە ئەوە یا بەری تە دگۆت (ئانکو پێغەمبەرێن بەری تە). هۆسا پێغەمبەری ﷺ بەرسڤ دا.

و ئەوا دهێتە زانین کو زانستێن نوی ئاماژێ ددەن هاتنا ئاڤا زەلامی ب تنێ جارەکێ پتر سێ سەد ملیۆن سپێرم ژێ دەردکەڤن، و ئێك سپێرم ب تنێ دێ هێکا ژنێ پیتێنیت، و ژ زارێ ئەبی سەعیدێ خودری گۆت پێغەمبەرێ خودێ ﷺ دبێژیت: ((لَيسَ مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، إِذَا أَرَادَ اللهُ أَنْ يَخْلُقَ شَيْئاً لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ))(١)، (ئانکو، نە ب هەمی ئاڤا زەلامی زارۆك چێ دبیت، و ئەگەر خودێ ڤیا تشتەکی چێ کەت چو تشت ل بەر وی نابنە رێگر)، ئەرێ مانە موحەممەد ﷺ پێغەمبەرێ خودێیە؟ ئەرێ بنیات و ڤەکۆلینێن زانستی یێن وی سەردەمی (سەردەمێ پێغەمبەری) تێرا هندێ دکر بۆ زانینا ڤان راستییان؟

تشتەکێ دی، خودێ د بێژیت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣)﴾ [المؤمنون]، (ئانکو، ب سویند مە مرۆڤ ژ هێڤێنێ هەرییێ چێ کرییە. پاشی مە ئەو کرە چپکەك، و د مالبچویکیدا خۆجە کر)، (القرار المكين) مەرەم پێ رەحمە، دکەڤیتە نیڤا ئەندازەیا تمام د لەشێ ژنێدا، ئەگەر هێلەکا نیڤا درێژییێ وەرگرین، و هێلەکا نیڤا پانییێ وەرگرین دێ جهێ رەحمی کەڤیتە ئێکتربرینا هەردو هێلا.

رامانا دووێ: بۆچی ناڤێ رەحمی کریە (قرار)؟ چونکی رەحم کەرستەکێ چڕ بەرددەت دەمێ هێکا پیتێنەکری دچیتە رەحمی، ب دیوارێن رەحمیڤە دنویسیێت، دێ رەحم بیتە جهێ خۆجهبوونێ بۆ وێ هێکێ، و د رەحمیدا هژمارەکا لۆلەیێن خوینێ یێن هەین، و ئەڤ هەمی لۆلەیێن خوینێ خوینێ ددەنە هێکێ دا کۆرپەلە ب خوارن بکەڤیت. و دا ب لەزاتییەکا وەسا گەشێ بکەت کو دهێتە هژمارتن ب لەزترین شانە د زێدەییا وی و دابەشبوونا وی د لەشێ مرۆڤیدا.

---

(١) موسلمی ڤەگوهاستییە (١٤٣٨)، و ئەحمەد (١١٤٥٦).

تشتەکێ دی؛ ئەڤ زارۆکێ د زکێ دایکێدا ب پەردەکا تەنك یێ نخافتییە، و ئەڤ پەردا تەنك یا گرێدایە ب سەرێ رەحمیڤە، و ئەو شلەیێ ل دۆرماندۆری زارۆکی هەمی ڤێککەڤتنان دمێژیت، و تشتێ ژ ڤێ سەیرتر ئەوە رەحم ب هەمیڤە یێ گرێدایە ب حەوزا ژنێڤە ب رێکا هندەك بەندکان بۆ تیرێن حەوزێ، و رەحم یێ جودایە و کۆرپەلە ژێ یێ جودایە، و د ناڤبەرا رەحمی و کۆرپەلەیدا شلەیەك یێ هەی هەمی ڤێککەڤتنان دمێژیت، ئەڤ شرۆڤەکرنە هەمی رێك دکەڤیت و دکەڤیتە ژێر گۆتنا خودێ: (ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣)) [المؤمنون].

هندەك زانایێن هەستییان دبێژن: ((هەستییێ حەوزا ژنێ رەقترین هەستییە د لەشێ مرۆڤیدا، و ئەڤە ژ بەر بەرسینگگرتنا ڤێککەڤتنان))، خودێ دبێژیت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣)) [فصلت]، ئانکو ئەڤ قورئانە ئاخفتنا خودێیە، و ئەو موعجیزەکا هەروهەرا زیندییە، و هەر چەند زانست بەرەڤ پێشڤە بچیت دێ روویەکی ژ ئیعجازا وێ (قورئان) یا زانستی ئاشکرا بیت.

# هەر سێ قۆناغێن دوگیانیێ

خودێ د قورئانا پیرۆزدا دبێژیت: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا) [البقرة:٢٣٤]، (ئانکو، ژ هەوە ئەوێت د مرن و ژنان ب پاش خۆڤە دهێلن، دڤێت (ئەڤ ژنە بەری شوی بکەت) چار هەیڤ و دەه رۆژان خۆ بگرن).

مرۆڤ حێبەتی دبیت ڤێ ژمارا هندە یا دەستنیشانکری (چار هەیڤ و دەه رۆژ)، بۆچی نەگۆتییە چار هەیڤ، یان پێنج هەیڤ، یان شەش هەیڤ، یان دو هەیڤ یان سێ هەیڤ؟ زانایێن نوژداری دبێژن: (ژنا دوگیان د سێ قۆناغانرا دبۆریت؛ قۆناغا ئێکێ: ئەڤە قۆناغا گۆمانێیە، خوین دیتن (عادە) د ڤێ قۆناغێدا دراوەستیت و دبیتە نیشان کو ژن یا ب دوگیانە، ئەرێ ئەڤ نیشانە بەلگەکێ ڤەبڕە؟ نەخێر، هندەك ئەگەرێن دی ژی یێن هەین بۆ راوەستانا ڤێ خوینێ، وەکی تێکچۆنێن دەروونی، یان هۆرموونی، یان تێکچۆن دکەڤیتە کۆئەندامێ زێدەبوونێ ل دەڤ ژنێ، ئەڤ هەمییە دکێشنە هندێ کو دیتنا خوینا هەیڤانە راوەستیت، ل ڤێرە راوەستانا خوین دیتنێ نابیتە بەلگەکێ ڤەبڕ ل سەر دوگیانیێ، و پشتی ڤێ قۆناغا گۆمانێ دچیتە قۆناغا دووێ، ئەو ژی قۆناغا پێشکەفتیتر ژ گومانێ، د ڤێ قۆناغێدا نیشانێن دەروونی دیار دبن وەکی هەست ب خەمگینییێ (داماییێ) دکەت، و هندەك نیشانێن دی یێن هەرسکرنا خوارنێ وەکی عێلنجی و ڤەرەشیانێ، و حەز دکەت یا ب تنێ بیت، ئەڤ نیشانێن هەرسکرنێ و دەروونی خەلك دبێژنێ ژان برن، ژ بەر پتر گۆمان بۆ هندێ دچن کو ژن د ڤێ قۆناغێدا یا ب دوگیانە، ئەرێ ئەڤ قۆناغە دبیتە بەلگەکێ ڤەبڕ بۆ دوگیانیێ؟ بەرسڤ: نەخێر! ژ بەر کو هندەك نیشانێن هەین دبێژنێ نیشانێن دوگیانییا درەو، چونکی دێ بینین هندەك جارا ژ نیشکەکێڤە ژنێ خوین دیت، و یا ب دوگیان نینە.

بەلێ د رۆژا (١٢٦)ێدا، ئانکو چار هەیف و دەه رۆژ وەکی قورئانا پیرۆز دیار کری، ب دویماهی هاتنا ڤی ماوەی دلێ کۆرپەلەی دەست ب لێدانێ دکەت، و د گەل لێدانا دلێ وی دلڤیت، و دایك هەست ب لڤینێ دکەت، ل ڤێرە دایك دێ چیتە د قۆناغا سێیێدا ژ دوگیانییێ، دبێژنە ڤێ قۆناغێ، قۆناغا پشت راستبوونێ، ژ بەر کو لڤینا زارۆکی د زکێ دایکێدا بەلگەیەکێ ڤەبرە بۆ دوگیانییێ، خودێ دبێژت: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍوَعَشْرًا).

ئەڤ راستییێن نوژداری ب شێوەکێ حیبەتی رێك دکەڤن د گەل قورئانا پیرۆز، دێ بینین د رۆژا (١٢٦)ێدا دلێ کۆرپەلەی دەست ب لێدانان دکەت، و د گەل لێدانێن دلێ وی دلڤیت، و ژن دچیتە د قۆناغا سێیێدا، ئەو ژی قۆناغا پشت راستبوونێیە.

# شلەیێ ئەمنیووسی

خودێ د پەرتۆکا خۆ یا پیرۆزدا دبێژیت: (يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ) [الزمر:٦]، (ئانکو، هەوە د زکێت دەیکێت هەوەدا، چێکرن ل دویڤ چێکرنێ د سێ تاریستانان‌دا چێ دکەت).

زانایان راڤەکرنێن جودا یێن هەین بۆ پەیڤا تاریستانان (ظُلُمَاتٍ)، هندەك ژ وان دبێژن: (تاریستانا زکییە، و تاریستانا رەحمییە، و تاریستانا وان پەردانە یێن ل دۆر زارۆکی د زکێ دایکێدا)، و هندەکێن دی دبێژن: (زارۆك یێ دۆرپێچدایە ب سێ پەردا، چێ دبیت ئەڤە ژ ئیعجازا قورئانێ یا زانستی بیت).

دێ ل سەر پەردا ئێکێ راوەستین؛ ئەو ژی پەردا ئەمنیووسییە. ئەڤ پەردە پەردەکا ناڤەکییە ژ لایێ کۆرپەلەیڤە، و ل دەوروبەرێن زارۆکی یێ دۆرپێچ دایە ژ هەمی لایانڤە، و تویرکەکێ پەردەیێ تەنگ و گرتییە، و د ناڤ پەردا گرتیدا شلەیەك یێ هەی د گەل گەشەکرنا زارۆکی زێدە دبیت دبێژنێ ئەمنیووس، قەبارێ وی دگەهیتە لیترەك و نیڤا د هەیڤا حەفتێدا، پاشی دزڤریتە لیترەکێ کێمەکێ بەری ژ دایکبوونێ.

کی ژ مە باوەر دکەت ئەگەر ئەڤ شلە نەبا زارۆك د زکێ دایکێدا ژ مرنێ رزگار نەدبوو؟

ئێکەمین: ئەڤ شلە خوارنێ ددەتە زارۆکی، کو کەرستێن شرین و سویر یێن نەئەندامی یێن تێدا.

دویەمین: ئەڤ شلە زارۆکی ژ ڤێککەفتنان دپارێزیت، و ئەڤ چەندە گەشتیگەلێن ئەسمانی جێبەجێ کر، ژ بەر کو د ناڤبەرا کەبسولا ئەوێن د ناڤ گەشتیگەلێدا و لەشێ گەشتیگەلێ شلەیەك یێ هەی ژ بۆ مێژتنا ڤێککەڤتنان، و دەمێ ڤێککەڤتنەك دگەهیتە لایێ کۆرپەلەی، کو هێزا وێ (٤) کیلۆ بیت ل سەر سەنتیمەترەکا دوجایی بۆ نموونە دێ ئەڤ شلە ڤێ هێزێ دابەش کەتە سەر هەمی روی، دێ ئەڤ فشارە نیڤ مللیمەتر بیت، و

نویترین رێك بۆ مێژتنا ڤێککەڤتنان ئەوە کو د ناڤبەرا وی تشتێ ژێ دترسی و دەوروبەری شلەیەك هەبیت.
دیسا د مێشکیدا ژی شلەیەکێ وەکی ڤی یێ هەی، کو مەژی یێ پێچایە ب شلەکێ وەناکەت زیان ب ڤێککەڤتنان بگەهیتە مەژی، ژ بەر کو ئەڤ شلە هەمی ڤێککەفتنان دمێژیت هەر چەند یا مەزن بیت.
و ئەڤ شلێ ئەمنیووسی ئەڤەیە زارۆکی د زکێ دایکێدا دپارێزیت ژ ڤێککەفتن و کەفتن و لڤینێن توند ئەوێن تووشی ژنا دوگیان دبن، ئەڤ شلە هەر دربەك و ڤێککەفتنەکێ دمێژیت، و دابەش دکەت ل سەر هەمی پەردێ ل دۆر زارۆکی دا کارتێکرن ل سەر زارۆکی نەبیت.
سێیەمین: ئەڤ شلە دبیتە رێخۆشکەر بۆ زارۆکی کو لڤین و بزاڤەکا ئازاد یا سڤك بکەت، وەکو یا دیار هەمی لەش د شلەیدا بزاڤا وان گەلەك ب سناهیترە دەمێ نە د شلەیدا.
چارەمین: مفایەکێ دی یێ ڤی شلەی ئەوە ئەڤ شلە ئامویرەکێ گونجاندنێیە، کو گەرماتییا وی یا جێهگرە، نە کێم دبیت و نە زێدە، ب تنێ د پشکێن ئێك پلەدا نەبیت، ئانکو رێژەکا گەلەکا کێم، و کێش و هەوایێ ژ دەرڤە ب چ شێوە ژی بیت، یێ گەرم بیت یان یێ سار، ئەڤ شلەیە گەرمییا جێهگر بۆ کۆرپەلەی دابین دکەت کو دبیتە هاریکار بۆ گەشەبوونا وی.
پێنجەمین: ئەڤ شلە وەناکەت زارۆك ب پەردا ئەمنیووسیڤە بمینیت، و ئەگەر پێڤە نویسیان دورست بوو، دێ کێماسی د سروشتێ چێبوونا زارۆکیدا پەیدا بن.
شەشەمین: ئەڤ شلە ب خۆ زارۆکبوونێ ب سناهی دئێخیت، و ئەڤە دبیتە هاریکار بۆ حولیبوون و بەرفرەهکرنا وی جهێ کو دێ زارۆك تێدا هێت.
حەفتەمین: بەری زارۆك بهێتە سەر دنیایێ، جهێ هاتنا زارۆکی پاقژ دکەت، دا کۆرپەلە تووشی ژەهریبوونێ نەبیت، ژ پاقژکرنا جهێ هاتنا زارۆکی، و ب سناهیکرنا بوونێ، و ژ نەهێلانا پێڤەنویسیانا زارۆکی ب پەردا ئەمنیووسیڤە، و ژ دابینکرنا گەرمایەکا جێهگر، و ژ دابینکرنا لڤینەکا ئازاد یا سڤك، و ژ پاراستنا زارۆکی ژ دربان و

ڤێککەفتنان، و ژ دانا خوارنێ بۆ زارۆکی، ئەڤ شلێ ئەمنیووسی خودێ یێ کرییە د ناڤ رەحمیدا، و د ناڤ پەردا ئێکێدا کو زارۆك تێدا دهێت و دچیت، ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ: (يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ) [الزمر:٦]،

خودێیە زانایێ نهینی و ئاشکرایان، و ئەوە یێ زێدە چێکەر و زێدە زانا، ئەوە خودایێ مەرد.

خودێ دبێژیت: (أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى (٣٦) أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى (٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى (٣٨) فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى (٣٩) أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى (٤٠)) [القيامة]، (ئانکو: ئەرێ مرۆڤ هزر دکەت، هەما دێ هۆسا مینیت، بێی حسێب د گەل بێتە کرن. ما نە چیکەکا ئاڤێ بوو، کەفتییە د مالبچویکیدا؟. پاشی بوو خوینپارە، پاشی چێ کر و دورست کر، دەست و پێ و چاڤ و گوه دانێ. و ژن و مێر هەر ژ وی چێ کرن (ئانکو کچ و کوڕ ب دویڤ ئێخستن). ئەرێ ما ئەوێ هوین هۆسا داین، نەشێت مرییان ساخ بکەتەڤە؟.

و خودێ دبێژیت: (قُتِلَ الْإِنْسَانُ مَا أَكْفَرَهُ (١٧) مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ (١٨) مِنْ نُطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ (١٩) ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ (٢٠) ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ (٢١)) [عبس]، (ئانکو، وەی بۆ مرۆڤی، چەندێ بێ نان و خوێیە و چەند یێ ژ ڕێ دەرکەفتییە. خودێ ژ چ چێ کرییە (بیرا وی دئینیتە بنەتارێ وی، دا خۆ مەزن نەکەت و ب خۆ نەخرپێت، و خۆ ل سەر سەرێ بەنیییێت خودێ مەزن نەکەت). ژ چیکەکێ بێ کێماسی و ئەو یێ تەکووز چێ کری. پاشی ڕێکا بوونێ بۆ ساناهی ئێخستی (و ژیان بۆ ساناهی کر و هەردو ڕێك بۆ ئاشکەراکرن، ڕێکا باشی و باوەرییێ و ڕێکا خرابی و گاورییێ، کا وی کیژ بڤێت بلا بۆ خۆ وێ بگریت).

# هەڤالبچویك پەردەكا ئاقلە یان تەقدیرەكا خودابییە؟

هەڤالبچویك تلپەكێ (قرص) مەزنە د گەل كۆرپەلەی د رەحمێ دایكێدا، ئەڤ هەڤالبچویكە دهێتە ژێڤەكرن پشتی بوونێ، و دو زڤرۆكێن خوینێ یێن د هەڤالبچویكیدا هەین، و پەردەكا تەنك یا د ناڤبەرا هەردو زڤرینانداا هەی دبێژنێ هەڤالبچویك، ئەو هەردو زڤرۆك ژی زڤرۆكا خوینا دایكێ و زڤرۆكا خوینا كۆرپەلەینە، و وەكو دهێتە زانین جۆرێ خوینا دایكێ نە ژ جۆرێ خوینا كۆرپەلەیە، ژ بەر كو هەر خوینەكێ جۆرێ خۆ یێ هەی، و ئەڤ هەردو زڤرۆكە دهێنە ژێكڤەكن د هەڤالبچویكیدا، كو پەردەكا تەنك یا د ناڤبەرا واندا هەردوویاندا ژێك جودا دكەت، ڤێ پەردا تەنك موعجیزەكا تمام یا تێدا، كو خوینا دایكێ و كۆرپەلەی ژێك جودا دكەت، و رێكێ ددەت خوارنا پاقژ و ژێگرتی ژ خوینا دایكێ بۆ كۆرپەلەی بچیت، ئەڤە پەردەكا ئاقلە، ژ بەر كو كۆرپەلە پێدڤی ب پوتاسێ هەیە، و دیسا كلسێ و ژ بلی ڤان و ئەڤ پەردە وەدكەت تشتێ پێدڤی ژ خوارنێ بۆ كۆرپەلەی بچیت، دهێتە پاقژكرن ب رەنگەكێ هەرە باش دا ب كێر كۆرپەلەی بهێت، و دا هاریكارییا وی بكەت بۆ گەشەكرنێ، و دیسا ئەڤ پەردە وەدكەت ئۆكسجینا د ناڤ خوینا دایكێدا بۆ كۆرپەلەی بچیت، ئەو ژی دەمێ دایك ئۆكسجینێ هەلدكێشیت، و ئەڤ ئۆكسجینە دچیتە د ناڤ خوینا كۆرپەلەیدا د ماوێ ڤێ پەردێدا، و دیسا د ماوێ ڤێ پەردێدا كەرستێن بەرگرییێ ژ ئێشان و نەخۆشییان دچن بۆ وی، ئانكو بەرگرییا لەشی یا دایكێ یا د ناڤ خوینا زارۆكیدا، و دیسا د ماوێ ڤێ پەردێدا كەرستێن ژەهراوی، و ئەنجامێن بەرمایكێن دەربرینا خۆراكی وەكی دوان ئۆكسیدێ كاربۆن ($CO_2$) یێن ژ ئەنجامێ كریارێن ئاڤاكرن و هەرافتنێ چێ بوویی ژ خوینا كۆرپەلەی دهێنە ڤەگوهاستن د ماوێ ڤێ پەردێدا بۆ ناڤ خوینا دایكێ، ژ بەر كو

ئەو بەرمایکێن کۆرپەلەی یێن د ناڤ خوینا ویدا دهێنە ڤەگوهاستن د ماوێ ڤێ پەردێدا بۆ ناڤ خوینا دایکێ، ل ڤێرە ئەڤ پەردە دهێلیت خوارنا پاقژ و ئۆکسجین و کەرستێن بەرگرییێ بۆ کۆرپەلەی بچن، و ناهێلیت بارا پترى میکرۆب و نەخۆشییان بگەهنە کۆرپەلەی، و دهێلیت بەرمایکێن ژ ئەنجامێ دەربرینا خۆراکی د خانێن لەشێ کۆرپەلەیدا بچن، ئەڤە چ پەردەیە؟

ئەڤ چەندە هەمی چێ دبن بێی خوینا کۆرپەلەی و یا دایکێ تێکەل ببن، چونکی خوینا دایکێ یا جودایە، و خوینا کۆرپەلەی ژى یا جودایە، و ئەڤ پەردە دبیتە ناڤبر د ناڤبەرا واندا، ئانکو ژێکڤە دکەت، ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ یێن دبنە بەلگە ل سەر مەزناهییا وى، خوینا دایکێ جۆرەکە و یا کۆرپەلەی جۆرەکێ جودایە، و کۆرپەلە ئۆکسجینی و کەرستێن بەرگرییێ و خوارنا پاقژ وەردگریت، و بەرمایك و پیساتییان د ماوێ ڤێ پەردێدا دەردکەت، و ئەڤ پەردە وەناکەت میکرۆب و پیساتی بچن بۆ کۆرپەلەی، و ئەگەر دایك تووشی نەخۆشییەکا میکرۆبی بوو، ئەڤ نەخۆشییە باراپتر ناهێتە ڤەگوهاستن د ماوێ ڤێ پەردێدا بۆ کۆرپەلەی د زکێ وێدا، ئەڤە پەردەکا ئاقلە، هۆسا زانایێن نوژدارى دبێژنێ تەقدیرەکا خودایی یا ئاخڤتنکەرە ب دلۆڤانییا خودێ و یا جوانە ب کەرەم و دلۆڤانییا وى، پەردەکە دهێلیت هەر تشتێ کۆرپەلە پێدڤی بۆ بچیت، و دهێلیت هەر تشتێ زیانێ بگەهینیتە کۆرپەلەی دەر بکەت، و ناهێلیت تشتێ زیان بۆ کۆرپەلەی بچیت، و ئەو تشتێ بۆ کۆرپەلەی زیان تێدا هەبیت ب رێکا دەرکرنێ ژ خوینا کۆرپەلەی بۆ خوینا دایکێ دچیت، و ئەوێن نە ب زیان ناهێلیت ب رێکا خوینا دایکێ بۆ وى بچیت، ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا وى.

هندەك زانایان ب کورتی کارێ هەڤالبچویکی یێ دیار کرى: ئەڤ پەردە ئۆکسجینی ددەت و دوان ئۆکسیدێ کاربۆنی ($CO_2$) وەردگریت، ب کارێ سیهێ رادبیت، سیها کورپەلەی یا د هەڤالبچویکیدا و خوارنا حەلکرى ل دویڤ پێدڤییا کورپەلەی ددەتێ، و زانایان دویڤچۆنا ڤێ خوارنێ کر د ماوێ چەند هەیڤاندا وان دیت ئەڤ هەڤالبچویکە خوارنەکا پیڤەرکرى یا رۆژانە ددەتە کۆرپەلەی، ل دویڤ گەشەبوونا وى، ل ڤێرە هەڤالبچویك ب

کارێ کۆئەندامێ هەرسکرنێ رادبیت، و دیسا ئەڤ هەڤالبچویکە هۆرمووْنان دهنێریت دا کۆرپەلە ب رەحمیڤە خۆجھ ببیت، و هۆرمۆونان دهنێریت دا سینگێ دایکێ گەشێ بکەت وەك بەرهەڤکرنەك بۆ شیردانێ، ئەگەر مرۆڤی ئەو سالۆخەت و کار و هویربینیێن د ناڤ هەڤالبچویکیدا زانیبان دا ئەنیا خۆ بۆ خودێ ب ئەردی ڤەنیت، ئانکو دا بۆ خودێ چیتە سوجدێ.

## دوگیانی و راوەستییانا خوین دیتنێ ( عادە )

ئەگەر پشت راستی د وێ ئێکێدا بیت کو دوگیانی نابیت د گەل خوین دیتنێ، و خوین دیتن د گەل دوگیانییێ نینە، پا بۆچی خودێ فەرمان یا کری ئەو ژنا بەردایی خۆ سێ هەیڤان (سێ خوین دیتنان) بگریت، ئەرێ ما خوین دیتنەك بەسی وان نینە، دەمێ ئەو نە یا ب دوگیان؟

دێ بێژین: نەخێر، ب تنێ جارەکێ خوین دیتن و راوەستیانا خوین دیتنێ نەبەلگەیە ل سەر نەبوونا دوگیانییێ، چونکی هندەك کاودانێن کێم یێن هەین ژن د دەستپێکا دوگیانییێدا جارەکێ یان دو جاران یا سێ جاران خوینێ دبینیت ژ بەر گەلەك ئەگەران، ئەڤ ئایەت یا هاتی دا رەحمێ ژنێ ب هەمیڤە یێ پاقژ بیت و چو گۆمان تێدا نەبیت، خودێ دبێژیت: (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَنْ يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِنْ كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) [البقرة:٢٢٨]، (ئانکو، ژنێت بەردایی، دڤێت بەری شوی بکەن، سێ ژڤانان (بێ نڤێژییان، یان پاقژییان) خۆ بگرن، و بۆ وان نەدورستە تشتێ خودێ د مالبچویکێ واندا چێ کری ڤەشێرن، ئەگەر (راست) باوەرییێ ب خودێ و رۆژا قیامەتێ دئینن).

ژ بەر کو دا بزانین ئەڤ یاسایە (شەریعەت) ژ دەڤ چێکەرێ گەردوونییە، و دا بزانین کو ئەڤ کاودانێن کێم یێن دەڤ ژنان دهێنە دیتن، و دا نوژدار باش بزانن، نەخاسمە ئەو نوژدارێن تایبەتمەند ب نەخۆشییێن ژنانڤە، ئەڤ کاودانێن کێم ڤێ ئایەتێ پاشگوه نەهاڤێتییە؛ ژ بەر ڤێ چەندێ رەحمێ ژنێ ژ پاقژکرنێ ب دویماهی ناهێت ئەگەر پشتی سێ خوین دیتنان نەبیت، چونکی پشتی ڤێ چەندێ دوگیانی ب شێوەکێ بەرچاڤ دیار دبیت، ژ لایێ زەلامی ب چاڤ دهێتە دیتن، یان ژ لایێ دایکێ، یان ژ لایێ ژنێ ب خۆ.

# کۆرپەلە ( زارۆکێ د زکێ دایکێدا ) و هەستێن وی

ژ ڤەکۆلینێن زانستی یێن نوژداری کو دهێتە هژمارتن ئێک ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهیا خودێ ئەو ژی کۆرپەلەیە، ب دیتنا نوژداریا کەڤن زیندەوەرەکە د کێمترین ئاستێ ژیانێدایە، پەرتۆکێن نوژداری ژیانا وی وەسا سالۆخەت دکر وەکی ژیانا بەرکەکێ فاسۆلییێ د ناڤ ئاخێدا، کو پێك دهێت ژ (رشیم، و رهك و قورمك و پاراستنکەرا خوارنێ) کو شەه و رۆناهی دگەهیتێ و ئەڤ (رشیم)ـە شین دبیت و گەشێ دکەت. و بزاڤێن کۆرپەلەی ب تنێ بەرسڤدانە بۆ وان کاریگەرییێن دگەهنە وی د زکێ دایکا خۆدا، بەلێ نوژداریا نوی د ماوێ پێشکەفتنا رێکێن تێبینیکرنێ و دیتنێ، و گەهشتنا نوژدارییێ بۆ ناڤ لەشێ مرۆڤیدا، و ب کارئینانا بەرێخۆدانێ، و وێنێن تێلەڤزیونی، و تۆمارکرنا دەنگی و رۆناهییێ، د ماوێ ڤان رێکێن گەلەك پێشکەفتیدا رێك بۆ نوژدارییێ ڤەکر کو بگەهنە کۆرپەلەی، زانین و شارەزایی وەرگرت ل سەر ژیانا وی یا ئەندامی، و رەوشتێ وی یێ دەروونی، نوژدارییێ راستییێن حێبەتی ئاشکەرا کرن، دایکەکا دوگیان د هەیڤا شەشێدا، یا فێری جگارەکێشانێیە، نوژداری داخواز ژێ کر جگارەکێشانێ بهێلیت بۆ ماوەکێ درێژ، پاشی جگارەك دایێ، دەمێ جگارە بەردایێ و دەست ب کێشانێ کری، پیڤەری ئاماژە دا و دیار کر دلێ زارۆکی د زکێ وێدا تێك چۆ، گۆتن: ئەڤە بەروڤاژی مەرجییە، و ئەڤە جۆرەکە ژ جۆرێن فێربوونێ، ئەڤ کۆرپەلە د هەیڤا شەشێدا د زکێ دایکا خۆدا زیان ژ لایێ دایکێڤە گەهشتێ دەمێ جگارە کێشای.

ئەگەر دایك کەفتە د ڤەیرانەکا دەروونیدا وەکی تۆرەبوونێ دێ کۆرپەلە تووشی هەمان کاریگەری بیت ئەوا گەهشتییە دایکا وی، و ئەگەر دایك د شادی و کەیفخۆشییەکێدا بوو، دێ زارۆك ئارام و بێ دەنگ بیت، و دێ لێدانێن دلێ وی و ئەندامێن وی د رێکخستی بن، و ژ ڤێ سەیرتر ئەوە کۆرپەلە د زکێ دایکێدا دهێتە راکێشان بۆ دەنگێ بابێ خۆ، و وەردگریت، و ئەڤە پشتی ژ دایکبوونێ دوپات دبیت.

و پێکڤەگرێدان، ئانکو گرێدانا کۆرپەلەی ب دایکا خۆڤە، دەمێ دایک یا رازی بیت ب دوگیانییا خۆ، و ب زارۆکێ خۆ یا خۆش بیت، دێ زارۆك ژی هەمان هەست دەتێ، و دێ یێ ئارام بیت، و دێ ڤی هەستێ خۆش ب لڤینان د زکێ دایکا خۆدا دەربریت، و چو تخویب نینە ڤێ خۆشییێ ل بەر دلێ دایکێ، بەلێ ئەو دایکا حەزا دوگیانییێ نەبیت، و دوگیانییا وێ نەڤیان بیت ژ لایێ وێڤە، ل ڤێرە پێکڤەگرێدان دێ هێتە برین، دێ زارۆك ژیانەکا ژێکڤەبووی ژیت ژ دایکێ، کو تێکچۆن و ڤەقەتاندن تێدا بیت، و دێ هەڤسەنگییا وی تێك چیت، و دێ زارۆك هەستێن خۆ دەربریت ب لڤینا پێیێن خۆ د زکێ دایکێدا، هەر وەکی یێ دەربڕینێ دکەت بەرامبەر وێ نەڤیانا د گەل وی دهێتە کرن، و پشتی ژ دایکبوونێ، ژ بەر کو د بنیاتدا دایکێ هەبوونا وی د زکێ خۆدا رەتد کر، دێ بینین هەلگرتنا وی ژ لایێ دایکێڤە رەت دکەت، و دیسا شیرخوارنا سینگێ دایکا خۆ ژی دێ رەت کەت، دێ شیرێ هەر ژنەکا دی ل دەڤ ڤی زارۆکی یێ پەسەند بیت، ئەگەر چاڤێن وی ژی بگرن و دایك شیرێ خۆ بدەتێ دێ رەت کەت؛ چونکی د بنیاتدا یێ رەت کری، دێ کۆرپەلە د ژیانەکا دەروونیدا ژیت، و ئەڤ فێربوونە دەست پێ دکەت هێژ ئەو د زکێ دایکا خۆدا.

هندەك دبێژن: چێ دبیت نفستنا دایکێ هندەك تایبەتمەندییێن دەستنیشانکری هەبن، ئەو دایکا گەلەك دنڤیت، دێ زارۆکێ وێ ژی گەلەك نڤیت، ل ڤێرە کارتێکرنا دایکێ ل سەر زارۆکێ وێ دیار دبیت بەری بوونا زارۆکی، و بەروڤاژی.

و ژ ڤێ هەمییێ سەیرتر ئەوە دەمێ ژنا دوگیان ژانا دبەت ئەگەر مرۆڤەکا نێزیکی وێ یا ب دلۆڤان ب رەخڤە بیت، ئەڤ مرۆڤا نێزیك و دلۆڤان رۆلەکێ مەزن دێ هەبیت د ساناهیکرنا ژدایکبوونێدا، و رژتنا خوینێ دێ زێدە بیت د رەحمیدا و دێ کۆرپەلە یێ ب خوارن بیت، و دێ کۆرپەلە ب گەشە کەڤیت د ماوێ ژانێن ژ دایکبوونێدا، و بەرمایکێن کێمبوونا ئۆکسجینی کێم دکەت، ئەڤ کێمبوونە چێ دبیت تووشی گیرۆبوونا عەقلی بکەت، یان تێکچۆنا دەروونی، بەرێ خۆ بدە وێ دایکا حەز و ڤیان د دوگیانییێدا هەی، دایکا کەیفخۆش، دایکا د گەل زەلامێ خۆ ب تەناهی دژیت، ئەڤ چەندە

**کارتێکرنەکا ئەرێنی یا ساخلەمیا لەشی و دەروونی دکەتە سەر کۆرپەلەی، و ئەو دایکا ب رەخ کچا خۆڤە دەمێ زاڕۆك بوونێ ئەڤە هاریکاریا بوونەکا ب سناهی دکەت، و دێ یا دویر بیت ل سەر توندیێن کێمیا ئۆکسجینی کو هندەك جاران ب پاشڤەمانا عەقلیڤە گرێدایی، یان ب نەخۆشیا (صرع)ێڤە، یان ب تێکچۆنا دەروونی، بەرێ خۆ بدە حیکمەتا خودێ، هەتا ئەو سالۆخەتێن دایك تێدا دژیت د ماوێ دوگیانییێدا بارا پتری وان سالۆخەتان کارتێکرنێ دکەنە سەر کۆرپەلەی د زکێ وێدا.**

**دەمێ ئەم ژ نەخشەکێشانا خودایی دویر دکەڤین ژ وێ چێکرنا خودێ چێ کری، و ئەم رێبازەکا دی د ژیانێدا وەردگرین، ئەڤ چەندە دێ بیتە پێچەوانی ل سەر ساخلەمیا زاڕۆکێن مە، و ل سەر گەشەکرنا وان، و ل سەر ساخلەمیا دەروونێن وان.**

# توندییا دەروونی د ماوێ دوگیانیییێدا ئەگەرەکە د تێکچوّنا شێوەیێ کۆرپەلەیدا

راستییەکا دیار و بەرچاڤ دبێژیت: دەمێ ژنا دوگیان تووشی گڤاشتنێن دەروونی یێن توند دبیت، و هەتا ماوێ بەری دوگیانیێ ژی، چێ دبیت ژ هۆکارێن دیاربوونا تێکچوّنا زارۆکی بیت د زکێ دایکێدا ژ لایێ نەسروشتییا شێوێ زارۆکیڤە، چونکی ئێك ژ ئەگەرێن نەسروشتییا کۆرپەلەی تێکچوّنێن هەستینە ئەوا ژن تێدا دژیت.

ئەز رەوانبێژییێ ناکەم ئەگەر بێژم: سەدان بابەتێن هەین دوپات دکەن کو گڤاشتن و توندییێن دەروونی ئەگەرەکە بۆ نەخۆشییان چو گۆمان تێدا نینە، و توندییا دەروونی چارەسەرییا وێ باوەرییە ب خودێ، و پەرستنا وی، و بیرئینانا وی، و گرێدانا د گەل وی، و وەفاداری بۆ وی، و مرۆڤێ باوەردار یێ دویرە ژ توندییا دەروونی، ژنا باوەردارا دەهمەن پاقژ و یا گوهدارا زەلامێ خۆ، ئەو یا دویرە ژ ڤێ توندییا دەروونی.

زانا دبێژن: گڤاشتنێن دەروونی یێن ب هێز د ماوێ دوگیانیێدا، وەکی ژ دەستدانا کارمەندییێ، یان بەردانێ، یان جودابوونا ژن و مێران، یان خەم ل سەر مری، چێ دبیت ئەڤە کاودانێن نەسروشتی د کۆرپەلیدا دورست بکەن، و نەسروشتییێن د هەستەوەراندا دورست دبن وەکی (الشرم)[1]، و شەقبوونا لێڤێ، و گەورییێ، و ژ بلی ڤان.

---

(١) ئیبن مەنزوور د (لسان العرب)دا بۆ پەیڤا (شرم) دبێژیت: (الشرم والتشريم): بڕینا تمبلکێ دفنێ و پالییا حێشتێ، ئەڤ چەندە ب تایبەتی بۆ ڤان هەردویان یا هاتییە گۆتن، حێشترەکا (شرم و شريم و مشرومة)، و (رَجُلٌ أشْرَمُ بَيِّن الشَرَم): ئانکو ئەوێ رەخەکێ دفنا وی بڕی، و ژ بەر ڤێ چەندێ دگۆتێ (أبرَهة الأشرمُ)، و (أذنٌ شَرماءُ ومُشَرَمَة): ئانکو تشتەکێ کێم یێ ژ سەرێ گوهێ وی هاتییە بڕین.

و زانا ڤێ دیاردێ شرۆڤە دکەن، دبێژن: (گڤاشتنا دەروونی ئەگەرەکە بۆ بلندبوونا هۆرموونێ کۆرتیزون کو ئەڤە دکێشیتە بلندبوونا رێژا شەکرێ د ناڤ خوینێدا، و رێژا ئۆکسجینی د شانەندا کێم دبیت، و ئەڤە دو هۆکارن دبنە ئەگەرێ شێواندنا شێوێ کۆرپەلەی.

گرێدانا دەروونی ب جەستەیڤە کارەکێ حێبەتییە، ئەگەر دەروون یێ ساخلەم بیت دێ جەستە ژی یێ ساخلەم بیت، و ئەگەر دەروون یێ ساخلەم بیت دێ دل ژی تەنا و ئارام بیت، و ئەگەر دەروون یێ ساخلەم بیت دێ هەمی تشت ساخلەم و دورست بن، و چارەسەرییا ئێکانە بۆ مە ئەوە ئەم گرێدانێن خۆ د گەل خودێ موکم بکەین، و تۆبە بکەین بۆ وی، و ئەم گوهدانا فەرمانێن وی بکەین، و ل دویڤ سوننەتا پێغەمبەری ﷺ بچین.

# ڤیانا دایکێ و شیرێ وێ

خودێ دلۆڤانی یا کرییە د دلێ دایکاندا، زێدەباری دلۆڤانییا دایکان بۆ زارۆکێن وان، کو ئەڤە د راستیدا دلۆڤانییا خودێیە بۆ وان، سینگێ دایکێ وەلێ کرییە جۆرەکێ تایبەتێ شیری ژێ بهێت.

و شیرێ دایکێ وەکی زانا دبێژن: (تشتەکێ حێبەتییە، هێز و زانینا مرۆڤان نەشێت دورست بکەت ژ پێکهاتی و سالۆخەتێن وی، و چێکرنا وی د شیانێن مەزنترین کارگەهاندا ژی نینە).

و تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە ئەڤ زارۆکێ خودێ ئافراندی ترشێن هەرسکرنێ ب رێژەکا کو د گەل شیرێ دایکێ ب گونجیت پێن کرینە د زارۆکیدا، و ئەگەر ئەم شیرێ چێلێ بدەینە زارۆکی، و ئەگەر یێ نوی ژی بیت، یان یێ هشك کری بیت دێ زارۆك ب زەحمەت هەرس کەت، و دێ چەندییێن مەزن ژ کەرستێن ڤەلەوییێ مینن، و دیسا پرۆتین و ترشێن ئەمینی بێی کو هەرس بکەت، ژ بەر ڤێ چەندێ دێ بینین ئەو زارۆکێ شیرێ چێلێ ددەنێ هەردو گورچیسکێن وی دوەستییێن ژ هاڤێژتنا کەرستێن ڤەلەو، و ترشێن ئەمینی و پرۆتینان کو نەشیایە هەرس بکەت، چونکی ترشێن هەرسکرنێ ل دەڤ زارۆکی رێك دکەڤن د گەل شیرێ دایکێ، و د گەل شیرێ چێلێ رێك ناکەڤیت، چونکی د شیرێ چێلێدا چار جارکی هندی شیرێ دایکێ ترشێن ئەمینی پێن تێدا.

زانا دبێژن: (بلندییا رێژا ترشێن ئەمینی د خوینێدا بۆ زارۆکی دبیتە ئەگەرێ کێماسییێن عەقلی، و نەخۆشییێن دلی، و لۆلەیێن خوینێ، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ، و مێلاکێ، و نەخۆشییێن بەردەوام کو د گەل مرۆڤی دمینن ب درێژاهییا ژیانا وی).

و پێکهاتێن وی (شیرێ دایکێ): پێکهاتێن وی د گوهۆرینەکا بەردوامدانە ل دویڤ پێدڤییێن زارۆکی و داخوازییێن وی، و ل دویڤ شیانێن ئەندامێن وی، و شیرێ دایکێ پتر یێ گونجایە و کێمترین زیانە، و تەناترین رێکە بۆ خوارنێ ژ لایێ پاقژییێڤە، چونکی ئێکسەر ژ سینگێ دایکێ دهێتە وەرگرتن بێی تووشی پیساتییا میکرۆبی ببیت، و گەرماتییا وی یا جێهگرە، د ماوێ ئێك شیردانێدا، و یا ب زەحمەتە مرۆڤ ڤان مەرجان د شیردانا چێکریدا (فۆدیکا) ببینیت، و د سەر ڤێ چەندێرا گەرماتییا وی یا ناڤنجییە ل هاڤینێ، و یێ گەرمە ل زڤستانێ، و یێ ب سناهییە بۆ هەرسکرنێ، ماوێ هەرسکرنا وی ژ دەمژمێرەك و نیڤا نابۆریت، بەلێ ماوێ حەلبوونا شیرێ چێکری ژ سێ دەمژمێران پترە، و زارۆکێ شیرێ دایکێ دخۆت دێ بەرگرییا لەشێ وی یا ب هێز بیت دژی هەمی نەخۆشییان، چونکی د شیرێ دایکێدا کەرستێن هەڤدژێن هەین بۆ کولبوونا رویڤیکان و هەناسێ، زێدەباری کو شیرەکێ ئابۆرییە، و کێمترین مەزاختنە.

باراپتر کاودانێن بێنتەنگییێ (رەبوو) ل دەڤ زارۆکان، و کویفکۆییا رویفیکان، و ژ بلی هندەك نەخۆشییێن دی یێن بەربەلاڤ ئەو زارۆکێ شیردانا سروشتی (دایکێ) دهێتە شیردان ژ ڤان رزگار دبیت.

و د شیرێ دایکێدا کەرستێن هەین وەناکەن میکرۆب ب دیوارێن رویڤیکانڤە بنویسن، و دیسا کەرستێن ترش یێن هەین بۆ نەهێلانا میکرۆبان، و شیردانا سروشتی زارۆکی ژ نەخۆشییێن کۆلێرا و زکچۆنێ و ژ نەخۆشییێن فالنجا زارۆکان و وان نەخۆشییێن ژ سەرمایێ پەیدا دبن دپارێزیت، چونکی بەرگرییا دایکێ هەمی یا د شیرێ وێدا هەی، و ئەڤە دایکێ دپارێزیت ژ وەرمتنێن پیس یێن سینگێ دایکێ، و ئەڤ دیاردە یا بەربەلاڤە ل بارا پترێ جهێن جیهانێ (پەنجەشێرا سینگێ ژنێ) و شیردانا دایکێ بۆ زارۆکی دێ وێ پارێزیت ژ وەرەمتنێن سینگێ وێ، و شیرڤەکرنا زوی د سەر رێداچۆنێن رەوشتی ل دەڤ زارۆکی پەیدا دبن.

و شیرێ دایکێ ب شەڤ و رۆژ یێ هەی، و بەردەوام یێ ئامادەیە ب وێ گەرما پێدڤی، و د گەشتان و د مالدا؛ ب وێ پاقژییا نموونەیی، و ب ساناهییە بۆ هەرسکرنێ، و ژ بەر کو

بەرگرییا لەشی یا د ناڤدا زاڕۆکی ژ گەلەك نەخۆشییان دپارێزیت، خودێ دبێژیت: (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي كَبَدٍ (٤) أَيَحْسَبُ أَنْ لَنْ يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ (٥) يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُبَدًا (٦) أَيَحْسَبُ أَنْ لَمْ يَرَهُ أَحَدٌ (٧) أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ (٩) وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ (١٠)) [البلد]، (ئانکو: ب راستی مە مرۆڤێ چێکری ژ کەڤت و رەفت و نەخوشییێ. ئەرێ مرۆڤ هزر دکەت کو کەس نەشێتێ. ب شانازیڤە دبێژیت: من گەلەك مال یێ مەزاختی (و من گەلەك مال یێ هەی). ما هزر دکەت کەس وی نابینیت، ئانکو یا ژ ویڤە، خودێ وی نابینیت و پسیارێ ژێ ناکەت (کا ئەو مال ژ کیڤە ئینایە، و د چدا مەزاختییە؟!)، دیارییەکە ژ لایێ خودێڤە، ئیبن عەباس دبێژیت: (النَّجْدَانِ) بەحسێ هەردو لایێن سینگێ ژنێیە[1].

و زانایێن دەروونی دوپات دکەن کو دەمێ زاڕۆك دبیت چو شیانێن زانینێ نینن، بەلکو ئەو هەمی یێن ل دەڤ مرۆڤێ پێگەهشتی (الراشد) هەین ژ شیانان و دیتن و شارەزاییان و ئامادەکارییێن وەرگرتی، ژ ئەنجامێ تێککارکرنا وییە د گەل ژینگەهێ، و ئەڤە ناڤەرۆکا ڤێ ئایەتا پیرۆزە: (وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٧٨)) [النحل]، (ئانکو: خودێ هوین ژ زکێت دەیکێت هەوە دەرئێخستین (بچویك و لاواز) هەوە چو نەدزانی، و گوه و چاڤ و دل دانە هەوە، دا هوین سوپاسی و شوکرا خودێ بکەن (دا هوین هەر ئەندامەکی ژ ڤان د جهێ وی یێ دورستدا بکار بینن).

بەلێ بەروڤاژییەك ـ وەکی زانایێن دەروونی ددەنە دیارکرن ـ د گەل زاڕۆکی دبیت، و پێدڤی ب فێرکرنێ نینە، ئەو ژی بەروڤاژییا مێژتنێییە، چونکی ئەگەر ئەڤە نەبا چو مرۆڤ ل سەر روییێ عەردی نەدبوو ل هەمی کیشوەران، ئەو زاڕۆکێ ژ نوی ژ دایك بوویی نەشێت ئاراستەکرن و شیرەتێن بابێ خۆ وەرگریت د پێدڤییا گرتنا سینگێ دایکا خۆ، و دورست گرتنا سنگێ دایکا خۆ، پاشی کێشانا هەوای، دا شیر بۆ بهێت، نەشێن ڤان ئاراستەکرنان تێ بگەهیت، زێدەباری ب جهئینانێ.

---

(١) ئیبن کەسیر (٥١٣/٤).

ئەو دلۆڤانییا زارۆك ژ دایکا خۆ دبینیت و وەردگریت د دەمێ شیرخوارنێدا ئەڤ زارۆکە دلۆڤانییەکێ د دلێ خۆدا وەردگریت کو کاریگەرییێ دکەتە سەر پەیوەندییێن وی ژ دەوروبەرێن وی د پاشەرۆژا ویدا، ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ [البقرة:٢٣٣]، (ئانکو: دەیکێت بچویك شیر (ئەوێت بەردایی) دێ دو سالێت دورست شیری دەنە بچویکێت خۆ، ئەڤە بۆ یا دڤێت شیردانا خۆ تمام بکەت).

زانا دبێژن: (کێمترین ماوێ شیردانا دایکێ شەش هەیڤن، و راددێ تمامتر دو سالێن تمامن).

و جۆرێ پەیڤا (يُرْضِعْنَ) ب (خبر)ی یا هاتی د نیشاندانا فەرمانی، ئانکو: گەلی دایکان زارۆکێن خۆ شیردان بکەن، و هەر فەرمانەکا د قورئانێدا هاتی دبیتە ئەرك ئەگەر چو قەرینە نەبن بەروڤاژی وێ چەندێ.

خالەکا هویرببینە: دەمێ رویدانەك چێ بوو شیردان هاتە راوەستاندن ژ لایێ دایکێڤە، ل ڤێرە زانا دبێژن: (پێدڤییە بۆ زارۆکی ل داییەنەکێ (شیردەرەکێ) بگەرن، نە ب شیرێ چێلێ بهێتە شیردان، خودێ دبێژیت: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ [البقرة:٢٣٣]، (ئانکو، ئەگەر هەوە ڤیا داییەنان بۆ بچویکێت خۆ بگرن، چو گونەه ل سەر هەوە نینە)، و شوینا شیرێ دایکێ نە شیرێ چێکرییە، بەلکو لێگەریانا داییەنانە (شیردەر)، و ئەڤ داییەنە دڤێت ساخلەمییا وێ یا باش بیت، و خودان عەقلەکێ مەزن بیت، و رەوشتەکێ بلند بیت).

و باراپتر حکومەتێن دەولەتان کارگەهێن چێکرنا شیری نەچارکرییەنە ل سەر هەر کیس و قوتیکەکا شیری بنڤێسن: (چو تشت جهێ شیرێ دایکێ ناگرن).

و ڤەکۆلینەك ل وەلاتەکێ پێشکەفتی هاتە کرن، ڤەکۆلەران ئاستێ زیرەکییا (فطري) ل دەڤ هژمارەکا زارۆکان هەلسەنگاند ژ گەلێن جودا جودا، سەبارەت شیردانا سروشتی و پیشەسازی، ئەنجامێن حێبەتی ژ ڤێ ڤەکۆلینێ دەرکەفتن؛ ژ بەرکو زارۆکێن گزیرتێن

(باسيفيك)[1]، خودان بلندترين ريژێن زيرەكييێ بوون د ناڤبەرا كۆما زارۆكاندا ئەوێن بۆ ڤەكۆلينێ ب كار ئينايين، و ئەڤ چەندە ژى ب ئەگەرێ هندێيە كو زارۆكێن ڤان گزيرتان شيردانا پيشەسازى (چێكرى) ب هەميڤە نوزانن، خودێ راست گۆتييە: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ [البقرة:٢٣٣]،

ئەڤە رێبازا خودێيە، ئەڤە زانيارييێن چێكەرينە، ئەو ج تشتە مرۆڤى ژ گوهدانا خودێ ددەتە پاش؟ و ج تشتە نەهێليت مرۆڤ پێ باوەردار بيت، ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ [البلد:١٠]، ژ بەر ڤێ چەندێ هندەك زانا و شارەزا دبێژن:

| | |
|---|---|
| تداركْتنا باللطفِ في ظلمةِ الحشا | وخيرَ كفيلٍ في الحشا قد كفَلْتنا |
| وأسكنتَ قلبَ الأمهات تعطفاً | علينا وفي الثديين أجريتَ قوتنا |
| وأنشأتنا طفلاً، وأطلقتَ ألسناً | تترجمُ بالإقرارِ أنك ربُنا |
| وعرَّفتنا إيّاكَ، فالحمدُ دائماً | لوجهِك إذ ألهَمتنا منك رُشدَنا |

خودێ دلۆڤانى يا كرييە د دلێ دايكاندا، و شير كرييە د سينگێ واندا، ئەڤە (دلۆڤانييا دايكێ) دلۆڤانييەكا ورەييە، و شيرێ وێ خوارنەكا سروشتييە.

---

(١) كۆمەكا گزيرتانە دكەڤنە د زەريايێ هێمندا، چەندين دەولەتان پێك دئينن (ئەو دەولەتێن ئاسيا يێن دكەڤنە ناڤ زەريا هێمن). وەرگێر.

## ئەگەرێ زانستی یێ بنەمایێ (يُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يُحَرِّمُ مِنَ النَّسَبِ)

خودێ د پەرتۆکا خۆ یا پیرۆزدا دبێژیت: (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا (٢٣)) [النساء]، (ئانکو: ل سەر هەوە هاتە حەرامکرن و نەدورستکرن (مارەکرنا) دەیکێت هەوە، و کچێت هەوە، و خویشکێت هەوە، و مەتێت هەوە، و خالەتێت هەوە، و برازایێت هەوە، و خوارزایێت هەوە، و دەیکێت هەوە یێت شیری، و خویشکێت هەوە یێت شیری، و خەسوییێت هەوە، و نەڤسییێت هەوە یێت د مالا هەوەدا مەزن بووین، ژ وان ژنێت نڤین د ناڤبەرا هەوە و واندا چێبوویی، و بویکێت هەوە یێت کوڕێت هەوە یێت دورست، و (دیسا حەرامە) هوین د ناڤبەرا دو خویشکان د مارکرنێدا کۆم بکەن، ئەو نەبیت ئەوا بەری ڤێ فەرمانێ کربیت، ب راستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە).

(عن عائشة رضي الله عنه أنها قالت: جاء عمي من الرضاعة، فاستأذن علي فأبيت أن اذن له، حتى أسأل رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، فجاء رسول الله فسألته عن ذلك، فقال: ((انه عمك فأذني له)) قالت: فقلت: يا رسول الله إنما أرضعتني المرأة، ولم يرضعني الرجل، قالت، فقال رسول الله: ((إنه عمك فليَلِج عليكِ))، قالت عائشة: وذلك بعد أن ضُرِبَ علينا الحجاب، قالت عائشة: يَحْرُمُ مَنَ الرَّضاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الوِلادَةِ)[1]، (ئانکو: زار عائیشایێ ﵂ گۆت: مامێ من یێ شیری هات، دەستویری ژ من وەرگرت، من دەستویری نەدایێ هەتا من پسیار ژ پێغەمبەری کری، و پێغەمبەر هات، و من پسیار

---

(١) بوخاری (٤٩٤١)، و موسلم (١٤٤٥)، و ترمزی (١١٤٨)، و ئیبن ماجه (١٩٤٨)، و مالك (١٢٥٤).

ژێ کر، و وی گۆت: ((ئەو مامێ تەیە دەستویرییێ بدەیێ))، عائیشایێ گۆت: ئینا من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ژنێ شیر یێ دایە من نە زەلامی، ئینا پێغەمبەری گۆت: ئەو مامێ تەیە بلا بێتە ژۆر، عائیشا دبێژیت: ئەڤە ژی پشتی فەرمانا حیجابکرنێ ژ مە کری، عائیشا دبێژیت: ((يَحرُمُ مَنَ الرَّضاعَةِ مَا يَحرُمُ مِنَ الوِلادَةِ)).

د ڤان هەردو دەقێن ـ ئایەت و فەرموودێدا ـ دیار دبیت، کو شیردان ب مەرجێن خۆ یێن بەرنیاسڤە ئەو زارۆکێ شیرێ ژنەکێ دخۆت ئەو ژن دبیتە دایکا وی، و دبیتە برایێ وی ئەوێ شیرێ ڤێ ژنێ دخۆت، و نێزیکیا ژ شیردانێ جێهگر دبیت، و دویندەهێ ڤەدگوهێزیت، وەکی زانستێ نوی دیار دکەت د ئەندازەیا بۆماوەییدا (الهندسة الوراثية) کو ئەڤە نویترین ڤەکۆلینا نوژدارییە.

ئەندازەیا بوماوە دوپات دکەت شیردان هندەك جینا ژ وێ ژنا شیری ددەت بۆ وی زارۆکی دچن یا شیری ددەتێ.

و ئەڤ نێزیکییە پێغەمبەری ﷺ د سوننەتێدا وەکی نێزیکیا دویندەهێ لێ کرییە، و دیسا قورئانێ ژی، ئەڤ نێزیکییە ئەگەرێ وێ یێ زانستی ئەوە جین دهێنە ڤەگوهاستن ژ شیرێ وێ ژنێ بۆ وی زارۆکێ شیری ددەتێ، ئەڤ جینە دچنە د خانەیێن زارۆکیدا، و جینێن وان پێکڤە کۆم دبن د زنجیرا جینانداا ل دەڤ زارۆکێ ب شیر.

و زانا دبێژن: (د شیریدا پتر ژ جۆرەکێ خانەیان یێ تێدا هەی، و کۆئەندامێ بوماوەیێ زارۆکێ ب شیر جینێن بیانی دهێنە ڤەگوهاستن بۆ وی، و پەسەند دکەت؛ چونکی نەیێ پێگەهشتییە، ئەگەر ژنەکێ شیر دا زارۆکەکی ئەو جینێن د شیرێ ڤێ ژنێدا دێ چنە د ناڤ خانەیێن لەشێ زارۆکیدا و دێ تێدا جێهگر بن، و دێ گەهنە کۆئەندامێ وی یێ بۆماوە).

ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((يَحرُمُ مَنَ الرَّضاعَةِ مَا يَحرُمُ مِنَ الوِلادَةِ)). پێغەمبەر ﷺ ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت، بەلکو ئەوا بۆ دهات ئەو وەحی بوو ژ دەڤ خودێ، هەر تشتێ د قورئان و سوننەتا دورستدا هاتی بنیاتەکێ زانستی یێ هەی، و زانایێن بۆماوەزانی نوکە زانییە کو ئەڤ شیرە پێك دهێت ژ کۆمەکا خانەیان د شانێن

کۆرپەلەیدا دچیتە خوار بۆ جینێن وی یێن سەرەکی، و تێدا کۆمڤە دبن، و کۆئەندامێ وی یێ بۆماوەزانی هەمی تشتێ غەریب پەسەند دکەت هەتا وەلێ دهێت هەر وەکی پشکەك ژ وی.

و دەمێ پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((یَحرُمُ مَنَ الرَّضاعَةِ ما یَحرُمُ مِنَ الوِلادَةِ))[1].

ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت ب تنێ وەحی نەبیت ئەوا خودێ بۆ دهنارت.

(١) سبق تخریجه ص١٨٧.

# پشکا حەفتێ
# پەیکەرێ هەستی

١- وَانْظُرْ إِلَى الْعِظَامِ
٢- پەیکەرێ هەستییێ مرۆڤی
٣- هەستی و هەستییێن دەستێ مرۆڤی
٤- پێکڤەگرێدانا هەستییێ رانی ب هەستییێ کماخێڤە
٥- ماسۆلکە

# وَانْظُرْ إِلَى الْعِظَامِ

**خودێ د قورئانا پیرۆزدا دبێژیت: (وَانْظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنْشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا) [البقرة:٢٥٩]، (ئانکو، بەرێ خۆ بدە هەستییان ئەم چاوا ددەینە ئێک و پاشی ب گۆشتی کراس دکەین).**

**زانا دبێژن: (هەستی ژ کەرستەکێ بنەرەتی پێک دهێت ئەو ژی کالسیۆمە، بەلێ لێکڤەکرنا ڤی کەرستەی د گەل تامکەرێن وی ب شێوەکێ دیترن، هەشتێ و پێنج ژ سەدێ کالسیۆما فۆسفاتییە، و دەھ ژ سەدێ کالسیۆما کاربۆنییە، و سێ ژ هزارێ کالسیۆما کلۆریدییە، و دو ژ هزارێ کالسیۆما فلۆریدییە، و ئێک و نیڤ ژ سەدێ فۆسفاتا مەگنیسیۆمییە، ئەڤە رێژێن کالسیۆمی د گەل تامکەرێن وی د هەستیدا، و نۆت و نەھ ژ سەدێ کالسیۆما لەشێ مرۆڤی یا د هەستیدا، کالسیۆم ژ رویڤیکان ناهێتە مێژتن ئەگەر ب هەبوونا هۆرموونەکێ نەبیت کو رژێنەکا گەلەکا بچویک دەردکەت کو یا ب رەخ رژێنا پەریزادێڤە، و ئەگەر ئەڤ رژێنا بچویک ژ کار کەفت رویڤیکێن زیندەوەاران نەشێن کالسیۆمێ بمێژن).**

**تشتەکێ دی، هەبوونا کالسیۆمێ د هەستیدا پێدڤی ب ڤیتامین (د) هەیە، و ئەگەر ئەڤ ڤیتامینە د هەستیدا نەبوو دێ زارۆک تووشی پێتیبوونا هەستییان بیت، یان دێ تووشی نەرماتییا هەستییان بیت، شێوێ هەستییێن مرۆڤی ب شێوێ ستریانە، و ئەڤ سترییە د ناڤێکدا چۆینە، و دەمێ د ناڤێکدا دچن دێ لەشەکێ گەلەکێ رەق دورست کەن، و هەستییێ رانی دشێت نێزیکی دو سەد و پێنجی کیلۆیان راگریت، ئەڤ**

**سالۆخەتێن موکومییێ و هێزێ د هەستیدا تشتەکێ حێبەتییە، خودێ دبێژیت: (وَانْظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنْشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا) [البقرة: ٢٥٩].**

**(نُنْشِزُهَا): ئانکو یێن وەلێ کری ب شێوێ ستریییێن د ناڤێکدا چۆیی، دا گەلەك موکوم و ب هێز بن.**

**هێژ ئەم د رژدین کو لەشێ هەر ئێك ژ مە گەلەك نیشانێن بەلگە یێن تێدا هەین ل سەر مەزناهییا خودێ، خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) [الذاريات: ٢١].**

## پەیکەرێ هەستییێ مرۆڤی

ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ، ئەڤ پەیکەرێ هەستییە کو ئەو بنیاتێ راوەستانا لەشێ مەیە، و یێ موکومە، هەستی بەرگرییا هێزا توند دکەت و دیسا بەرگرییا هێزا فشارێ دکەت، ئەڤ کەرستێ ب هێز یێ د ناڤ لەشێ مەدا (هەستی) ئێك ژ کارێن وی یێن مەزن ئەوە کۆئەندامێن لەشێ مە دپارێزیت، وەکی مێشکی کو یێ د ناڤ تەپەکا هەستییاندا، و ستریە مەژی د ناڤ برِبرِا پشتێدا، و دل مەترسیترین ئەندامە د لەشیدا یێ دانایە د قەفەسا سینگیدا، و رەحم جهێ وی یێ د هەستییێ حەوزێدا، و جهێ چێکرنا تەپکێن سۆرێن خوینێ د ناڤ هەستیاندایە، ئەگەر کۆئەندامێ هەستییان نەبیت دا مرۆڤ کۆمەکا ژ پیستی و گۆشتی بیت چو شێوە بۆ نەبن.

ئەڤ کۆئەندامە ژ دو سەد پارچێن هەستییان پێك دهێت، بنیاتێ وی یێ موکوم و رەقە و باش یێ لێکدایە ژ لایێ دەرڤە، و ژ ناڤدا یێ کونکونە و ئیسفەنجییە، و ئەگەر ناڤخۆیا هەستی وەکی یا ژ دەرڤە با، دا کێشا هەر ئێکی ژ مە چار جارکی هندی کێشا وی یا سروشتی بیت، بۆ نموونە: ئەگەر کێشا کەسەکی حەفتێ کیلۆ بیت، دا بیتە دو سەد و هەشتێ کیلۆ.

زانا ڤێ ئاخڤتنا جوان دبێژن: (د بنیاتێ هەستیدا باشترین ئەنجامان دورست دکەت، و باشترین پێدڤییان، ل ڤێرە هەڤسەنگییەکا باش یا د هەستیدا هەی د ناڤبەرا چێکرییا بەرگرییێ و کێشا وی یا سڤکدا).

ئەو فرۆکا ئەم لێ سویار دبین کێشا وێ سەد و پێنجی تونە، و سۆتەمەنییا وێ ژی سەد و پێنجی تونە، تێرا وێ هەیە کو چاردە دەمژمێران بفریت، ئەگەر هاتبا چێکرن ژ سێ سەد تونێن ئاسنی دا پێدڤی ب سێ سەد تونێن سۆتەمەنییێ بیت.

ئەگەر كێشا مە چار جاركى هندى يا نوكەبا، ل ڤێرە دا ئارێشێن جوانییێ هەبن، و دیسا دا هەدەردانا وزێ هەبیت بێی ب دورستی هاتبا ب كارئینان.
تشتێ سەیرتر د ڤی كۆئەندامیدا ئەوە كریارێن هەرافتنێ و ئاڤاكرنێ د بەردەوامن (كریارێن ژ ناڤچۆنا خانەیان و دورستبوونا خانەیێن نوی یا بەردەوامە)، چونكی مرۆڤ پێنج جارا د ژییەكێ ناڤنجیدا پەیكەرێ خۆ یێ هەستی دگوهۆریت، ئانكو هەر پێنج یان شەش سالان پەیكەرێ هەستییێ مرۆڤی ب هەمیڤە دهێتە گوهۆرین ب كریارا هەرافتن و ئاڤاكرنێ.
هەرافتن و ئاڤاكرنا بەردەوام دبیتە ئەگەرێ خۆلێكدان و چێبوونا شكەستنێن هەستی، و ئەڤە ژ ڤەنجییێن مەزنێن خودێنە بۆ مە، و هەر هەرفاندن و ئاڤاكرنێن بەردەوامن وەل هەستی دكەن ببیتە كۆگەهەك بۆ كلسێ، ئەگەر دایكێ تێرا زارۆكێ د زكێ خۆدا خوارن نەبیت بۆ دورستبوونا هەستییێن زارۆكی ژ كلسێ، دێ زارۆك ژ هەستییێ دایكێ وەرگریت بۆ دورستبوونا هەستییێ خۆ، و كریارا هەرافتنێ و ئاڤاكرنێ یا بەردەوام ژ بەر هندێیە دا هەستی ببیتە كۆگەهەك بۆ كلسا یەدەك.
هندەك هۆرموونێن هەین گەشەكرنا هەستییان رێك دئێخن و راوەستانا گەشەكرنا وی ژی هەتا رادەكی رێك دئێخن، و ئەگەر ئەڤ هۆرموونە نەبان دا مرۆڤ یێ بەژن كورت بیت یان دا گەلەك درێژ بیت، و كورتترین مرۆڤ درێژاهییا وی پێنجی و پێنج سەنتیمەترن، و كێشا وی پێنجی كیلۆیە، ژییێ وی بیست و سێ سالن، و درێژترین مرۆڤ دو مەتر و چل سەنتیمەترە، ل ڤێرە درێژی و كورتییێ پەیوەندی یا ب ڤی هۆرموونیڤە هەی، و ئەڤە تشتەكێ هویربینە.
تشتێ دی، دورستبوونا هەستی ئەوە گوهۆرینا كركركێیە بۆ هەستی و ئەڤە د ژیانا كۆرپەلەیدا دەست پێ دكەت، و بەردەوام دبیت پشتی ژ دایكبوونێ هەتا ژییێ تەمامبوونا گەشەكرنا درێژییێ، ژ هەڤدە سالییێ بۆ بیست و ئێك سالییێ، و رەخ و دۆرێن هەستییان تەخەكا كركركێ دمینیت، ئەڤە ژ لایێ زانایێن میكانیكیڤە مێژتن و پاراستنەكە بۆ ڤێككەفتنا تشتەكێ ب هەستی، وەكی پارچێن د ناڤبەرا پارچێن ئاسنیدا،

و د ناڤبەرا هەردو بربرەیاندا ژ بربرێن پشتێ تلپەکێ کرکرکێ یێ هەی کار دکەت بۆ مێژتنا ڤێککەڤتنان، دا مرۆڤ ژیانەکا ئارام ببەت.

تشتەکێ دی یێ حێبەتی: شلەکێ چر و کزی یێ د ناڤ گەهاندا هەی، ژ بەر کو د دەمێ لڤیناندا دا لڤینا گەهان ب سناهی بکەڤیت، و ئەڤ شلە دەم بۆ دەمی ئەو ب خۆ نوی دبیتەڤە، ئەڤ هەستییە پەیکەرە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ کو دبیتە بەلگە ل سەر مەزناهییا وی.

# هەستی و هەستیبێن تبلێن دەستێ مرۆڤی

دەستێ مرۆڤی ژ وان نیشانانە کو دبیتە جهێ حێبەتیێ، و مەزناهییا خودێ دیار دبیت، بۆ ڤی دەستێ مە زانا دبێژن: (دەستێ مرۆڤی ژ پێنج تبلا پێك دهێت، و هەر تبلەك ژ سێ هەستییان پێك دهێت، ب تنێ تبلا بەرانی نەبیت ژ دو هەستییان پێك دهێت)، و ل ڤێرە نهێنییە.

چێ دبیت هندەك باوەر نەکەن کو ئەو شارستانییا مرۆڤی دورست کری یا گرێدایە ب ڤێ تبلا بەرانیڤە، و تبلا بەرانی مرۆڤی جودا دکەت د گەل ئافراندییێن دی.

ل سەر هەستییێ دووێ ل تبلا بەرانی ژەهەك (داڤ) د گەل ماسۆلکەکا درێژ د ڤی هەستی ئالاندییە، ئەڤە وەل تبلا بەرانی دکەت لڤینا وێ بەرامبەر تبلێن دی یا ب سناهی بیت و د گەل وان یا گونجای بیت بۆ گرتنا تشتان، ب ڤێ چەندێ مرۆڤ ب سەر هەمی زیندەوەرێن دی کەڤتییە.

ژ ئەگەرێ هویربینییا چێکرنا دەستی ئەڤ دەستە ب ڤی شێوەی یێ هاتییە چێکرن دا کارێن پێدڤی و گرنگ ئەنجام بدەت.

ئەگەر تبلا بەرانی نەبا، تبلێن دی چو بها نەدبوو، ئەگەر مرۆڤ تاقی بکەت کو بنڤێسیت بێی تبلا بەرانی، یان درواریێ بکەت بێی وێ، یان جلکێن خۆ بکەتێ بێی وێ، یان تو کارەکی ل سەر ئامویرەکی بکەی بێی ئەڤ تبلە، تو نەشێی چ بکەی، ئەڤە چێکرنا خودێیە یێ موکوم و بنەجە چێ کری: (صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ) [النمل:٨٨]، (ئانکو، ئەڤە چێکرنا خودێیە، ئەوێ هەمی تشت موکوم و بنەجە چێکرین، و خودێ ئاگەهـ ژ وێ هەیە یا هوین دکەن).

تبلا بەرانێ رۆلێ سەرەکی دگێریت بۆ لڤینێ بۆ هەمی لایانڤە دزڤریت، گەها وێ یا بازنەیی نەرماتییێ ددەتە تبلا بەرانی، و هەردو هەستییێن وێ پتر ژ پێنج شریتێن

بەستەر یێن هەین کو ئەڤە لڤینەکا باش ددەنێ ب هەمی لایانڤە، دەمێ ڤەکرنێ و مچاندنێ و گرتنێ و ژێك دویرکرن و زڤراندن و راستکرنێ.

ئەگەر کەسەك شەش دەمژمێران ل سەر کۆمپیوتەری بیت و دگمێن وی لێ بدەت دێ ئەڤ تبلا بەرانی زەحمەتێ بەت هەمبەری چۆنا چار کیلۆمەتران ل سەر پێیان، و ئەو نوزانیت.

ئێك ژ زانایێن رۆژئاڤا دبێژیت: (ئەڤ تبلا بەرانی یا حێبەتی بۆ مە ئەڤ جیهانا حێبەتی یا ڤەکری)، نیاسینا مە بۆ خودێ زێدە کر، و دیسا مەزناهی و ئێکانییا وی، ب راستی ئەڤ ئامویرێ حێبەتی - دەست - کۆمەکا هەستی و شریتێن بەستەر و ماسۆلك و دەمار و خوینبەر و خوینهێنەر و رهێن لیمفی یێن تێدا.

و بیست و حەفت هەستی یێن د دەستیدا، و بیست و هەشت گەه، و سیه و سێ ماسۆلکە.

و هەستییێن ڤەفتکێ حەفتن، و ئەڤ کۆما هەستییان دیسا بزاڤ و لڤینێ ددەنە دەستی بۆ هەمی لایان بزڤریت، و ئەگەر هەستییێن ڤەفتکێ نەبان دەستی چو رامان نەدبوون، و ئەگەر دەست ب تنێ بۆ لایەکی زڤریبا دا باراپتر سالۆخەتێن خۆ ژ دەست دەت.

تۆرەکا تەربوونێ یا خویناوی د دەستیدا دچیت کو ژ وان داهێنانێن مەزن یێن خودێ چێ کری، و ئەڤ تۆرە درژیتە دو رویبارێن مەزن ل هەردو لایێن ڤەفتکێ، وەکی دو سویلاڤێن ب رەخ ئێکڤە ڤەهاندی، و تۆرەکا گەلەکا هویر ژ خوینهێنەر و خوینەبەری د دەستیدا دابەش دبیت، ژ بەر کو ل هەر جهەکێ د دەستی تو دەرزیکێ لێ بدەی دێ خوین ژێ هێت، رامانا ڤێ چەندێ ئەوە تۆرەکا گەلەکا هویر یا هەی.

و رێکخستن کو تۆرەکا دەماری یا موکومە، ژ سێ بەندکێن ناڤنجی و زەندی و هەستییێ کاچکێ، هەستکرنێ وەرگرن و ئاراستێ لڤینێ دکەت، و سیستەمەکێ خۆویست یێ هەی، و سیستەمەکێ نەخۆویست و سیستەمێ خۆویست یێ گرێدایە ب کارێ بەروڤاژی یێ مەرجی، ئەگەر ئەم ڤەکۆلینا ڤی دەستی بکەین دێ بینین نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ.

ئەڤ شارستانییەتە، و ئەڤ پیشەسازییە، و ئەڤ ئامویرە، چو رامان نەدبوو بێی دەست، و ئەڤ دەستە بۆ مرۆڤی رێزگرتنەکە ژ لایێ خودێڤە بۆ وی، و ئەڤە - دەست - نێزیکترین نیشانە بۆ مە، خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) [الذاريات: ٢١].

# پێکڤەگرێدانا هەستییێ رانی ب هەستییێ کماخێڤە

خودایێ پر زانا و شارەزا دبێژیت: (نَحْنُ خَلَقْنَاهُمْ وَشَدَدْنَا أَسْرَهُمْ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَا أَمْثَالَهُمْ تَبْدِيلًا)[1] [الانسان:٢٨]، (ئانکو، مە ئەو (ژ چونەیییێ) ییێت چێکرین، و مە ئەندامێت وان ییێت موکوم کرین. و ئەگەر مە بڤێت دێ وان ب هندەکێت ژ وان چێتر گوهۆرین).

و د هندەك پەرتۆکێن نوژداریدا هاتییە: هەستییێ رانی حەفك یا هەی، و ئەڤ حەفکە هێزا فشارا پتر ژ دوسەد و پێنجی کیلۆگرامان رادگریت، ئانکو مرۆڤ ب هەردو هەستییێن خۆ یێن رانی، نەخاسمە حەفکا هەستییێ رانی کو یا گرێدایە ب کماخێڤە نێزیکی پێنج سەد کیلۆگرامان رادگریت، ئەڤ پشکا هەستی دهێتە هژمارتن رەقترین پشك د کۆئەندامێ هەستییێن لەشێ مرۆڤیدا.

و رێکا گرێدانا هەستییێ رانی ب هەستییێ کماخێڤە، تشتەکە جهێ حێبەتییێیە.

ئەڤ پێکڤەگرێدانە وەکی تەپەکا سفرییە و ئەم بکەینە دو پشك و پاشی ب موکومی بگرین، و ژ هەوای ڤالا بکەین، و هەر لایەکی چار هەسپ بکێشن، نەشێن هەردو پشکێن ڤێ تەپێ ژێکڤە بکەن، بۆچی؟ چونکی یا ڤالا کری ژ هەوای، و ژ بەرکو فشارا دەرڤە هێزێ دکەتە سەر، و ب ڤێ رێکا موکوم هەستییێ رانی یێ گرێدایە ب کماخێڤە؟

دورستکرن و پێکهاتێن لەشێ مرۆڤی ب موکومی و سیستەماتی یێ هاتییە چێکرن، نەخاسمە پەیکەرێ هەستی ب شێوەکێ گەلەك هویربین و موکوم، ب رێکا ماسۆلکان، و بەندکان و شریتان و پیستی و گونجاییا سەرێن هەستییان د گەل خلۆلاهییێن وان، ئەگەر بابەکی کورێ خۆ ب دەستی و ب شێوەکێ توند هەلگرت ژ بەر گرێدانا هەستییێ

---

(١) پەیڤا (الأسر) پێکڤەگرێدانە، ژ بەر هندێ دبێژنە ئێخسیری (أسیر) د زمانێ عەرەبیدا چونکی دەستێن وی یان دەست و پێن وی دهێنە گرێدان یان کەلامچەکرن، و رامانا (وَشَدَدْنَا أَسْرَهُمْ): ئانکو: مە پێکڤەگرێدانا وان موکم چێ کرییە.

باسکی ب خلۆلاهییا ملی گرێدانەکا موکومە، خۆ ل بەرگرتنا چەند جاری یا کێشا زاڕۆکی دکەت.

هەستییا موکومییەکا حێبەتی یا هەی، و خۆ ل بەر گرتنەکا حێبەتی بۆ هێزا فشارێ یا هەی، و گرێدانا هەستییان پێکڤە تشتەکە سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت، و چێ دبیت ئەڤە ئاماژەك بیت بۆ رامانەکێ ژ رامانێن ڤێ گۆتنا خودێ: (نَحْنُ خَلَقْنَاهُمْ وَشَدَدْنَا أَسْرَهُمْ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَا أَمْثَالَهُمْ تَبْدِيلًا (٢٨)) [الانسان].

# ماسۆلکە

دەمێ مرۆڤ ژ جهەکی دچیتە جهەکێ دی، و دەمێ تشتەکێ گران رادکەت، یان کارەکی ئەنجام ددەت، نهێنییا ڤێ بزاڤێ چییە، و نهێنییا ڤی کاری چییە؟ نهێنی و ئەگەرێ ڤێ چەندێ ماسۆلکەنە، دەمێ تو ل دەڤ گۆشتفرۆشەکی راوەستی، و گۆشتی دکری، ئەڤ گۆشتێ تە کری ماسۆلکەنە، خودێ ب زانین و شارەزاییەکا مەزن ئەڤ ماسۆلکە چێکرینە کو ژ ملیۆنەها رویشالان پێك دهێت، ئەگەر تو گۆشتی ژێکڤەکەی دێ بینی یێ پێکهاتییە ژ داڤا و هەر داڤەکێ رویشالەك یا هەی، و هەر رویشالەکێ دویماهییا وێ دەمارەکە، ئەگەر فەرمانەك ژ مێشکی هات، یان د کۆئەندامێ دەماری بۆ ڤێ رویشالێ، ئەڤ رویشالە دێ تێك چیت و کورت بیت، ئانکو دێ درێژاهییا وێ شێست ژ سەدێ کێم بیت ژ درێژاهییا بەرێ، دێ چل مینیت، و ئەگەر درێژاهییا رویشالێ دەه سەنتیمەتر بن دێ بنە چار ل دەمێ تێکچۆنێ.

و گڤاشتنا ماسۆلکێ ـ و ماسۆلکە یا گرێدایە ب هەستیڤە ـ دێ کێشیتە هندێ کو هەستی بلڤیت، ئەگەر ئەڤ تایبەتمەندییە نەبا ئەوا خودێ کرییە د ماسۆلکاندا دا مرۆڤ وەکی پارچەکا درێژکری یا داری بیت ل سەر عەردی، کو چو بزاڤ نەدبوون، و لڤینا ماسۆلکان یا شیاندار وەکی لڤینا دەست و پێیان، و زڤراندا سەری، و یا دەستی، ل ڤێرە بنیات و ئەگەرێ ڤێ لڤینێ کۆئەندامێ هەستییە، هەر هەستییەکی دو ماسۆلکە پێڤە گرێداینە، ماسۆلکەك هەستی بۆ لایێ راستێ دزڤرینیت بۆ نموونە، و ماسۆلکەك بۆ لایێ چەپێ هەستی دبەت، ئانکو ماسۆلکەك یا مچیایە، و یا دی یا ژێکڤەکرییە (ڤەبوویی)، ئەڤە چ نهێنییە؟

هەتا نوکە ژی نەهاتییە زانین ئەو رێکا گوهۆرینا خوارنێ د خانەیێن ماسۆلکاندا بۆ کاری، یان بۆ لڤینەکێ؟ ئەڤ نهێنییە هێژ نەهاتییە ئاشکەراکرن، ماسۆلکەکە دویماهییا

دەماری یا هەی، دەمێ فەرمانەکا دەماری دهێت دلڤیت و دێ تێك چیت، و دەمێ تێك چۆ دێ هەستی د گەل لڤیت، و دێ مرۆڤ لڤیت، چێ دبیت تو یێ روینشتی بی و تو دێ کورێ خۆ یێ بچویك بینی یێ نێزیکی سۆپێ دبیت، هەر زوی دێ رابی، ژ بەر هەبوونا مەترسییێ، ل ڤێرە وێ دیار دکەت کو فەرمانەك ژ مێشکی بۆ ماسۆلکان دهێت، دێ ماسۆلکە لڤن، دێ بەرەڤ وی چن، پاشی دێ ب دەستێ خۆ هەلگری، و ژ سۆپێ دویرکەی، ئەڤ تشتێ ئەم دکەین، و هزرکرنێ تێدا نەکەین کریارەکا گەلەکا ئالۆزە.

زانا دبێژن: (د هەر ماسۆلکەکا ناڤنجیدا دەھ ملیۆن رویشال یێن تێدا، و د لەشێ مرۆڤیدا شەش سەد ماسۆلکە یێن تێدا، پێنج سەد ژ وان یێ د بن شیان و کۆنترۆلا مرۆڤیڤە، و سەد ژ وان نە دبن شیانێن مرۆڤیدانە)، ئەگەر مرۆڤ د ژۆرەکا تاریدا بیت، پاشی گلۆپ بهێتە هەلکرن، و مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتە چاڤێن خۆ د خۆدیکێدا، دێ بینی رەشکا چاڤی یا تەنگ بوی، ئەرێ مرۆڤ دشێت ئەڤە هەر بمینیت وەکی بەرێ؟ ئەرێ ئەم دشێین وەنەکەین تەنگ ببیت؟ نەخێر، ئەڤ رەشکا چاڤی ماسۆلکەیە، بەلێ نە د بن کۆنترۆلا مرۆڤیدایە.

و لڤین و کارکرنا هەردو سیهان، و لڤینا رویڤیکان، و کۆئەندام دلڤن، و تو نوزانی، ئەڤ چێکرنا ب موکوم و رێك و پێك، چێکرنا خودێیە، ئەو خودایێ هەمی تشت ب موکومی و بنەجھ چێکرین، ئەرێ ما نە هەژی پەرستنێیە؟ ما نە هەژی گوهدارییێیە؟ مرۆڤ ب رێڤە دچیت، و دەمێ ژ ڤاتەکی سەرکەڤت بۆ ڤاتێ دی چێ دبیت لەشێ وی یێ حەفتێ کیلۆ سێ مەتران بلند کر، ئەڤە یەکسانی د وێ هێزا هاتییە لڤین کێشا نێزیکی هەسپەك و نیڤایە، چونکی ئەو هێزا هاتییە مەزاختن یا هەمبەری ڤێ ژمارێ تشتەکێ گەلەك نەشیاندارە (إعجاز)، دەمێ مرۆڤ دلڤیت یان بزاڤێ دکەت، و دەمێ دخۆت، و دەمێ خۆ درێژ دکەت، و دەمێ ب رێڤە دچیت، و دەمێ تشتەکی دهەلگریت، دڤێت ئەم هزرا خۆ د ڤێ چەندێدا بکەین، خودێ دبێژیت: (خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ (٦) يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ (٧)) [الطارق]، (ئانکو: بلا هەر کەسەك برێنتێ، کا ژ چ هاتییە چێکرن. نێ یێ ژ ئاڤەکا هلپەری (بلقە) چێ بووی. ئەڤ ئاڤە ژ مۆرکێت پشتا مێران و ژ

هەستییێ سینگێ ژنان دزێت). (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤) ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ (٥)) [التين]، ئانکو: ب راستی مە مرۆڤ ل سەر باشترین رەنگ و وێنە دورستکرییە و چێکرییە. پشتی هنگی مە ئێخستە د پەیسکا ژ هەمییان نزمتردا (نزمترین جهـ).

ب هزرکرنێ د بابەتێ ماسۆلکان بتنێدا بەسی هندێیە تو باوەرییێ ب خودێ بینی، چونکی ئەگەر ماسۆلکە نەبا خودان کاران چو کار نەدبوون، و ئەگەر ماسۆلکە نەبا ئەڤ ئاڤاهییێن ئەم تێدا دژین و دبینین نەدهاتنە ئاڤاکرن، و چو تشت ژ چێکرنێن مرۆڤان ل سەر عەردی نەدبوون، و خودێ کار و بزاڤ پێن ب ڤی کۆئەندامێ ماسۆلکەییڤە گرێداین یێ کو دهێتە ئێك ب کارتێکرنا دەماری، بەلێ چاوانییا گوهۆرینا خوارنێ بۆ کاری ئەڤە هەتا نوکە نەهاتییە زانین.

# پشکا هەشتێ

## مێشك

١- مێشك و ڤەنجیيا هشیاربوون و هیبوونێ

٢- مەژیك

٣- جێهگرییا خانەیێن مێشکی

٤- ژ جوانیيێن نیعمەتێن خودێ... تیڤلێ مەژییە

٥- ئەو کەرستێ ژ مێشکی دەردکەڤیت ژ بۆ نەهێلانا ئێشانێ ( دەرگەهێن ئێشانێ )

٦- بیردانك

# مێشك و ڤه نجبیا هشیاربوون و هیبوونێ

خودێ دبێژیت: (وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا) [ابراهیم:٣٤]، (ئانكو: ئەگەر هوین نیعمەت و كەرەمێت خودێ بهەژمێرن هوین نەشێن بهەژمێرن)، نەگۆت: (نعم الله)، گۆت: (نِعْمَةَ اللَّهِ)، ئانكو ڤەنجییەك ب تنێ، ئەگەر ئەم هەمی ژییێ خۆ باشییێن وێ ڤەنجییێ بهژمێرین ئەم خلاس ناكەین، و ئەگەر هوین د هژمارتنا باشیێن ئێك ڤەنجیدا د بێ شیان بن، هوین ژ سوپاسییا وێدا بێ شیانترن.

كی ژ مە باوەر دكەت كو د مێشكێ مرۆڤیدا چەندین تایبەتمەندی یێن هەین، ئەگەر ئەم ئێك ژ ڤان تایبەتمەندییان ژ دەست بدەین دێ ژیانا مە هەمی تێك چیت و نەخۆش بیت، ژ وان تایبەتمەندییان: تایبەتمەندییا هشیاربوونێ، و تایبەتمەندییا هیبوونێ، دو تایبەتمەندییێن پێچەوانن د گەل ئێك، و هشیاربوون ئەوە مرۆڤ تیژكرنا (تركیز) هزرا خۆ بدەتە سەر تشتەكی ب تنێ، و د ئێك دەمدا.

و وەكی تاقیكرنەكا سادە، ئامویرێ تۆماركرنێ دانە سەر پەنجەرا دكەڤیتە لایێ جادێ، و د گەل هەڤالەكێ خۆ روینە، و د گەل باخڤە ل سەر بابەتەكێ گرنگێ هویربین بۆ ماوێ نیف دەمژمێرێ، و پشتی هینگێ بێژە: ل دەرڤە (جادێ) چ رویدا دەمێ تو ئاخڤتی؟ دێ بێژیت: من های ژ چو نەبوو، ئامویرێ تۆمارێ (مسجل) ڤەكە دێ های ژ دەنگ و رویدان و حەوارییان بی، ڤان هەمی دەنگان تو گوه لێ نابی، راڤەكرنا ڤێ چەندێ چییە؟ دەنگ دهێتە د ژۆرێڤە، و دگەهیتە پەردە تەبلەی، و پەردە تەبلە دهژییێت، و دەنگ دهێتە ڤەگوهازتن بۆ مێشكی، و تە های ژێ نەبوو! ڤێ دیاردێ دبێژنێ هشیاربوون، ئانكو مرۆڤ تیژاتییا هشیاربوونا خۆ دئێخیتە سەر تشتەكی (تێگەهەكێ) ب تنێ د دەمەكیدا، و هۆسا زانا دبێژنە ڤێ دیاردێ هەستا ژێكگرتی،

چونکی مێشك هەمی جهێن زانیارییان دگریت ئەوێن پەیوەندی ب وی تشتێ تیژاتییا هزرا مرۆڤی کەڤتییە سەر، جهێ گوهلێبوون و دیتنێ، و هەستپێکرنێ، ئەڤ هەمی جهە دهێنە گرتن، و ب تنێ ئەو بابەتێ تیژاتییا هزرا مرۆڤی کەڤتییە سەر دێ مێشك رێکێ بۆ ڤەکەت بچیتە ژۆر.

چاوا مێشك هەمی رێکێن زانیارییان دگریت، و ب تنێ دهێلیت بۆ زانیارییێن پەیوەندی ب وی بابەتیڤە هەی یێ تیژاتییا هزرا مرۆڤی کەڤتییە سەر، ئەڤەیە دبێژنێ هەستپێکرنا ژێکگرتی.

و زانا دبێژن: (کاودانەکێ دی یێ هەی ژ ڤێ ئالۆزترە، ئەو ژی تیژاتییەکا هزری یا بەردەوام، بۆ نموونە ئەو دایکا شیری ددەتە زارۆکێ خۆ یا هشیارە بۆ دەنگێ زارۆکێ خۆ یێ ب شیر د ناڤ بلندترین دەنگاندا، هشیار نابیت ب تنێ ب دەنگێ زارۆکێ خۆ نەبیت، چێ دبیت دەرگەهـ بهێنە پێڤەدان، و قەرەبالغ بهێتە کرن و ئەو یا نڤستی و هشیار نابیت، بەلێ دەمێ دەنگێ گرییا زارۆکێ خۆ یێ ب شیر گوهـ لێ دبیت دێ ئێکسەر هشیار بیت و رابیت)، راڤەکرنا ڤێ چەندێ چییە؟ راڤەکرنا ڤێ رویدانێ ب شێوەکێ زانستی گەلەکا ب زەحمەتە، چونکی دەنگەکێ توندتر وێ هشیار ناکەت، دبێژن: ئەڤە کاودانەکێ دییە، دبێژن: تیژاتییا هزرا بەردەوام، هەر مرۆڤەکێ ل دویڤ زانیارییێن وی، بۆ نموونە، هندەك جارا هەستەکێ نەخۆش ل دەڤ شوفێری دورست دبیت دەمێ ژ نیشکەکێڤە دەنگەك د ترومبێلا ویدا پەیدا دبیت، ئەڤە چ هەست پێکرنە؟ ئانکو ل ڤێرە تیژاتییەکا هزری بەردەوام یا هەی ل سەر هندەك بابەتان، دایك ژ بەر دەنگێ زارۆکێ خۆ هشیار دبیت، و خودانێ ئامویرەی ب دەنگەکێ سەیر د ئامویرەیدا هشیار دبیت، ڤێ دیاردێ دبێژنێ هشیاربوون، ئەگەر ئەڤە نەبا ئەم نەدشیاین هزرکرنەکا دورست بکەین، قوتابی د پۆلێدا تیژاتییا هزرا وان بۆ مامۆستایێن وان دچیت، چێ دبیت دەنگ ژی ل دەرڤەی پۆلێ هەبن، ئەڤە ژی ژ بەر وێ قەنجییا خودێیە ژ تایبەتمەندییا هشیاربوونێ کو کرییە د مرۆڤیدا.

بەروڤاژی ڤێ چەندێ، دەمێ کرێکارەك د کارگەهێدا کار دکەت، و ئەگەر دەنگێن کارگەهێ هشیاربوونەکا بەردەوام هەبوو، دێ سەروبەرێ وی گەلەك نەخۆش بیت، و نەدشیا خۆ راگریت، و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ بۆ نموونە خودانێ فڕنێ هی دبیت ل سەر هشیاربوونێ دەمێ فرن دراوەستیت، ئەڤ دیاردە هیبوونە، و هەتا ڤێ دەمژمێرێ ژی زانا نوزانن چاوا هشیارکرنێن دەنگی گیرۆ دبن و پویچ دبن بێی بگەهنە مێشکی، کەس نوزانیت، ئەڤێن د وان کارگەهێن دەنگەکێ بلند هەی کار دکەن، ئەوێن د فرۆکخانانـدا کار دکەن، یان ئەوێن خانیێن وان ل سەر جادێن ب قەرەبالغ، چاوا ئەڤە دنڤن؟ تایبەتمەندییەکا د مێشکیدا هەی ڤان هشیارکرنا گیرۆ دکەت و پویچ دکەت، و ناگەهنە مێشکی، کو مەلبەندێ هشیارکرنێیە، ڤێ دیاردێ دبێژنێ: هیبوون، ئانکو دەنگ ژ لایێ هشیارکەریڤە دهێتە پاشگوە هاڤێتن پشتی دەمەکێ دەستنیشانکری، زێدەباری بەردەوامیيا دەنگی.

ئەڤ هەردو دیاردە د مێشکیدا (هشیابوون و هیبوون) ئەگەر نەبان دا ژیانا مە بیتە دۆژەه، خودێ دبێژیت: (وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا) [ابراهیم: ٣٤].

ڤەنجیيا مێشکی، هزرکرنێ، دیتنێ، بیرئینانێ، زانینێ، هەستپێکرنێ، و ڤەنجییێن هشیارکرنێ ئانکو تیژاتیيا هزرکرنێ و هیبوونێ ئانکو پاشگوە هاڤێتن، ئەڤ هەردو نیعمەتە ژ ڤەنجییێن خودێنە داینە مە.

# مەژيك

بابەتەكە كێم دهێتە سەر هزرا مرۆڤی، بابەتێ مەژيكييە.

ئەگەر هوين بەرێ خۆ بدەنە مەژيكی، دێ بينن ژ كۆمەكا داڤان پێك دهێت، سەنگا وی ژ سەد و پێنجی گرامان نابۆريت، بەلێ رۆلەكێ مەزن يێ هەی د ژيانا مەدا، و زانايان كارێ وی وەسا زانييە د ماوێ هندەك تاقيكرناندا، د گۆتنێ: مەلبەندێ رێككەفتن و گونجاندنا بزاڤێن لەشی، و مەژيك مايتێكرنێ د كارێن هش و بيراندا ناكەت، چونكی ئەڤە ژ تايبەتمەندييا تيڤلێ مێشكييە.

ئەگەر مێشكی فەرمانەك دا كو مرۆڤ تێلەفۆنێ راكەت، يان دەرگەهێ ترومبێلێ ڤەكەت، كی دێ بڕەيا (ڤەبارەيێ) وێ زەحمەتێ دەستنيشان كەت ئەوا پێدڤی ڤی كاری؟ ئەو ژی مەژيكە، كا چاوا ئەندازيارێ ئاڤاكرنێ نەخشەكی بۆ ئاڤاهييەكی ددانيت، و چاوا ئەندازيارەكێ مەدەنی ژمێرياريێن هويربين دكەت، ژمێرياريیا چيمەنتۆی، و يا ئاسنی، مەژيك ژی هۆسا ئەندامەكێ گەلەكێ ئالۆزە، ژمێرياريێن هويربينێن مێشكی دكەت، ژ بۆ ب جهئينانا وان كارێن مێشكی فەرمان پێ دايی، ژ بەر كو مەژيك ناڤەندا رێككەفتن و پێكڤەگرێدانا بزاڤێن لەشييە، دەمێ تو ل سەر پێيێن خۆ دراوەستی نيعمەتەكە، و گەلەك مرۆڤ چو هزرا بۆ ڤێ ناكەن.

هندەك زانا دبێژن: (راوەستانا ل سەر پێيان بزاڤەكا پەهلەوانی يا حێبەتييە، چاوا؟ كۆئەندامەكێ هەی د ناڤ گوهيدا، دبێژنێ كۆئەندامێ هەڤسەنگييێ، سێ كەنالێن نيڤ بازنەيی يێن تێدا، كارێ ئاراستەكرنێن بۆشايان رادبيت، شلە و تەنولكە يێن تێدا، هەست ب لڤينا شلەی دكەت، و ئەڤ كۆئەندامێ هەڤسەنگييێ فەرمانا چاوانييا راوەستانا لەشی ددەتە مەژيكی، كا يێ راستە، يان يێ خوارە؟ يان يێ روينشتييە، يان نڤستييە، كی دبێژيتە مێشكی كا راوەستانا لەشی يا چاوايە؟ ئەڤ كۆئەندامێ هويربين،

کۆئەندامێ هەڤسەنگییێ د گوهیدا، ئەڤ کۆئەندامە دێ زانیارییان دەت، و دیسا دەمار، و ماسوولکە، و گەهـ، و هەستییان، دێ بۆ مەژیکی رەوش و سەروبەرێ وان دیارکەت، دێ مەژیك ڤان زانیارییان، و ڤان بزاڤا هەمییان د گەل ئێك گونجینیت؛ ژ بەر ڤێ چەندێ زانا دبێژن: (راوەستانا سادە دهێتە هژمارتن بزاڤەکا پەهلەوانی یا حێبەتی)، ب بەلگە مرۆڤێ مری نەشێت ل سەر پێیێن خۆ راوەستیت، چونکی راوەستانا مرۆڤی کۆمەکا حێبەتی یا کۆئەندامان هاریکارییێ د ڤێ چەندێدا دکەن، تو راوەستی ل سەر پێیێن خۆ و تو ب رێڤە بچیی، و تو خۆ خوار بکەی، و رابی، و روینی، و خۆ خوارکەی لایێ راستێ یان چەپێ، ئەڤ هەمی کارە گەلەك د ئالۆزن.

ئەگەر ئەم پشکەکا هندی قەبارێ کەتا نیسکێ ژ مەژیکێ بالندەکی ڤەکەین، دێ هەر زوی کەڤیت، ئەڤ بالندە نەشێت بفریت، ئەگەر پشکەکێ ژ مەژیکێ مرۆڤی ژی ڤەکەین، ل ڤێرە مرۆڤ نەشێت ل سەر پێت خۆ راوەستیت، لەوا نوژدار وەسا دیار دکەن کو تێکچۆنەك یا د مەژیکیدا هەی، ب زانینا رێکا رێڤەچۆنا نەخۆشی، کو ئەڤە هەردو پێیێن خۆ ژێك فرێ دهاڤێت، ئەڤ رێڤەچۆنا نەخۆشی دیار دکەت کو تێکچۆنەك یا د مەژیکێ نەخۆشیدا هەی، ل ڤێرە دێ بێژنە نەخۆشی سەرێ تبلا خۆ دانە سەر دفنا خۆ، بەلێ نەشێت، زانا دبێژن: (ئاڤێ ڤێ لەرزینا ب مەرەمە)، دەمێ مرۆڤ پەرداغەکێ ئاڤێ ددەتە ڤی نەخۆشی دەستێن وی دلەرزن دەمێ پەرداغی دگریت، ل ڤێرە دیار دبیت کو تێکچۆنەك یا د ناڤەندا رێکخستنا هەڤسەنگییێدا هەی د بزاڤێن لەشیدا.

و ئەگەر ئەم پشکەکێ ژ مەژیکی خراب بکەین دێ دیتنا مرۆڤی تێك چیت، و مرۆڤ نەدشیا دیتنەکا تیژ ل سەر رێزەکا خواندنێ بکەت، ڤێ نەخۆشییێ زانا دبێژنێ لەرزینا چاڤی، و ئەگەر ئەم هندی دندکەکا نیسکێ مەژیکی خراب بکەین یان ژێڤەکەین، دێ رێڤەچۆنا مرۆڤی تێك چیت، و دێ تووشی کاودانەکی بیت دبێژنێ (ataxia)[1] دێ وەکی مرۆڤێ سەرخۆش ب رێڤە چیت، و دیسا دێ ئاخفتنا مرۆڤی ژی تووشی تێکچۆنێ

---

(١) ئاماژەکا دەمارییە ژ نەبوونا پێکڤەگرێدانا شیاندار بۆ لڤینا ماسوولکان پێك دهێت. وەرگێر.

بيت، كو دێ تووشی تورتوری و گرانییا ئاخفتنێ بیت، کی ژ مه هزرا ڤی کۆئەندامێ گرنگ و مەترسی دکەت کو دکەڤیتە د ناڤ کولۆخکێ سەریدا؟ زانا دبێژنێ مەژیك، کێشا وی ژ سەد و پێنجی گرامان نابۆریت، وەکی داڤێن تۆرێ، ئەوە (مەژیك) کو پێکڤەگرێدانێ چێ دکەت، و رێژا وان شیانێن هویربین یێن پێدڤی حسێب دکەت، ژ بەر کو دەمێ تو پەرەکێ پەرتۆکێ ڤەددەی، و دەمێ تو تویرکەکێ تژی وەردگێڕی کو کێشا وی پێنجی کیلۆ بیت، ئەرێ زەحمەتا ڤان هەمیان وەکی ئێکە؟ ل ڤێرە مێشك فەرمانەکێ ددەت ب وەرگێرانا ڤی تویرکی، یان ڤەدانا ڤی پەڕی، کییە ب دورستی دەستنیشان دکەت کو ڤەدانا پەڕەکی پێدڤی ب شیان و زەحمەتەکێیە کو ژ چەند گرامان نابۆریت، د دەمەکیدا وەرگێرانا تویرکێ شەکرێ پێدڤی ب شیان و زەحمەتەکا مەزنە؟ هەر وەکی مێشك ئەندازیارەکێ بیناسازییە، و هەر وەکی مەژیك ئەندازیارەکێ مەدەنییە، مەترا و پێدڤییێن ئاڤاکرنێ دهەژمێریت، ژ چیمەنتۆیی و ئاسنی و رویبەرێن ستوینان و یێن وەکی ڤان.

گەلەك نیشانێن مەزن یێن د ناخێ مرۆڤیدا هەین خودان عەقلان بێ شیان دکەت، خودێ دبێژیت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)﴾ [الذاريات].

دەمێ تو ب رێڤە دچی، ئەرێ تو دزانی ئەڤە نیعمەتەکە، ئەگەر تە ئەڤە ژ دەست دا دێ بهایێ وێ زانی؟ تو ل سەر پێیێن خۆ ب رێڤە بچی، تو راوەستی و روینی و خۆ بچەمینی، و نڤێژێ بکەی، رکوعێ و سوجدێ ببەی و خۆ بگری د روینشتنا دویماهییێدا (تحیات)، ئەڤ هەمی لڤین و بزاڤە گەلەك هویربین و ئالۆزە، و ئەگەر مەژیك نەبا تو نەدشیای راوەستی، و روینی و خۆ خوار بکەی و د جهدا بمینی و خۆ درێژکەی و باخڤی و بەرێخۆدانێ بکەی، ڤان کاران هەمییان تو دکەی، چونکی مەژیك مەلبەندێ رێکخستن و گونجاندنا هەمی بزاڤێن لەشێ مرۆڤییە ب هەمی جۆرێن خۆڤە، خودێ دبێژیت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)﴾ [الذاريات].

ئەگەر مەژیك نەبا تو نەدشیای ل پایسکلێ سویاربی، چونکی دەمێ هاژۆتنێ تو خۆ خوار دگەی، فەرمانەك ژ مێشکی دهێت ب راستڤەکرنا ڤێ بزاڤێ، داکو هەڤسەنگی بزڤریتەڤە، ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ یێن مەزن.

و هندەك زانا دبێژن: (مێشك مەزنترین بوونەوەرە ل سەر رویێ ئەردی، مێشك بەرپرسە ژ بزاڤێن هۆش و بیران؛ و هزرکرنێ، و بریاردانێ، بەلێ مەژیك بەرپرسە ژ بزاڤێن ماسۆلکان).

# جيهگرييا خانەيێن مێشكی

جيهگرييا كەسايەتييا مرۆڤی نيعمەتە ب چو بهايان ناهێتە بەراوردكرن، و كێم كەسان ئاگەه ژێ هەيە، ژ بەر كو خانەيێن لەشی، خانەيێن هەستی، و ماسۆلكان، و كۆئەنداماں، هەتا موييان، و هەر خانەكا د لەشێ مرۆڤيدا، دهێنە گوهۆرين هەر پێنج سالان هەتا حەفت سالان جارەكێ، هەر وەكی مرۆڤ پشتی ڤی ماوەی دبيتە مرۆڤەكێ دی، ئانكو د لەشێ مرۆڤيدا پشتی ڤی ماوەی چو خانەيێن كەڤن نامينن، چونكی هەستييێ تە دهێتە گوهۆرين، و پيستێ تە، و كورتترين ژييێ خانێ د لەشێ مرۆڤيدا خانەيا رەخێن ناڤخۆيا رويڤيكايە، و مەميلە دهێنە گوهۆرين د هەر چل و هەشت دەمژمێراندا، ئانكو هەر چل و هەشت دەمژمێران مەميلەيێن نوی دورست دبن، و درێژترين ژييێ ڤان خانەيان حەفت سالن، يان پێنج سالان دژين، رامانا ڤێ چەندێ ئەوە هەر حەفت سالان تو ب هەميڤە دهێيە گوهۆرين ل دويڤ دورستترين گۆتنان، بەلێ ئەگەر خانەيێن مێشكێ تە هاتنە گوهۆرين چو تشت نامينە ل بيرا تە، ژ نياسينێ و پێزانينان و بيرهاتنان، ئانكو دێ تو بسپۆرييا خۆ ژ بير كەی، و كار و زانياری و زارۆك و شارەزاييێن خۆ و بيرهاتنێن خۆ و ژێدەرێ رزقێ خۆ و تو هەڤژينا خۆ نانياسی، ژ بۆ حيكمەتەكا مەزن خانەيێن مێشكی يێن جيهگر كرين، ئانكو ناهێنە گوهۆرين، چونكی ئەگەر هاتنە گوهۆرين دێ موسيبەتەكا (نەخۆشييەكا) مەزن بيت، و دێ مرۆڤ ل ڤی دەمی بێژيت: ب خودێ ئەز نوژدار بووم من بسپۆرييا خۆ يا ژ دەست دای، و ئێكێ دی دێ بێژيت ئەز ئەندازيار بووم، و ئەز گۆتاربێژ بووم، و ئەز بازرگان بووم، ئەگەر ئەڤ گوهۆرينە د مێشكێ مرۆڤيدا روی بدەن دێ مرۆڤ كەسايەتييا خۆ ژ دەست دەت، هندەك نيعمەتێن هەين ناهێنە هژمارتن، ئەم بێ ئاگەهين ژ وان، خودێ دبێژيت: ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ (١٠٥)﴾

[یوسف]، (ئانكو: چەند گەلەكن ئايەتێت خودێ د ئەرد و ئەسمانان‌دا ئەوێت ئەو د بەررا دبۆرن، و روییێ خۆ ژێ وەردگێرن). و خودێ دبێژیت: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ (١٠٦)﴾ [یوسف]، ئانكو: بارا پتر ژ وان باوەرییێ ب خودێ نائینن، ئەگەر ئەو هەر د وی وەختیدا هەڤپشكان بۆ خودێ چێ نەكەن).

# ژ جوانیێن نیعمەتێن خودێ... تیڤلێ مەژییە

تشتەکێ د مێشکیدا هەی دبێژنێ: تیڤلێ مەژی، ستویراتییا وی ژ دو ملییمان نابۆریت، د ڤی تیڤلێ مەژیدا چاردە ملیار خانەیێن رێکخستی یێن تێدا د شەش تەخێن ل دویڤ ئێکدا، و کێشا وی هەمی ژ سەد گرامان پتر نینە، خوار دیار دکەن ژ ئەنجامێ رێکخستنا وان ل سەر ڤی شێوەی، دبێژنێ (التلافیف)، ژ بەر کو دا روویبەران کێم بکەت.

و تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە د ڤی تیڤلیدا روپشالێن دەماری یێن تێدا درێژاهییا وی پترە ژ هزار کیلۆمەتران !!! ئەڤ تەخا گەلەکا تەنك کۆنترۆلێ ل سەر مەزنترین کار دکەت، ئەو ژی دەستنیشانکرنا رەوشتێ کەسی و حەزێن وی، و هاریکارییا وی دکەت بۆ ئاخفتن و رەوانکرنێ، و هاریکارییا مرۆڤی بۆ فێربوون و ژ بەرکرن و بیرئینان و داهێنان و هزرکرن و هەستکرن و لڤین و گوهلێبوون و دیتنێ دکەت، زانا تەخمین دکەن د ڤی تیڤلیدا پێنجی هەتا سەد ناڤەندێن هەین، و ئەڤە یێن هاتینە زانین هەتا نوکە؛ ئەو ژی ناڤەندێ بهیستنێ، و دیتنێ، و بیرئینانێ، بریاردانێ، و بزاڤێ، و کۆنترۆلا مەترسیترین کریار دکەت د هەستکرنێدا، و بەرسینگگرتنا هەستەوەرگرێن دەرەکی دکەت، و د لڤینێدا، و هەر وەکی هاتییە گۆتن:

تو هزر دکەی تو بوونەوەرەکێ بچویکی و د ناڤ تەدا جیهانا مەزنتر یا هەی

و خانەیێن مێشکی پترن ژ سەد و چل ملیار خانەیێن (استنادیە)، هێژ کارێ وان نەهاتییە زانین، و چێ دبیت بهێتە گۆتن: (ب راستی نە ب تنێ مێشك ئالۆزترین تشتە د مرۆڤیدا، بەلکو ئالۆزترین تشتە د گەردوونیدا، و بێژن: مێشك دشێت ب هژمارا گەردێن گەردوونی پێزانینان وەربگریت، و مەزنترین کەسێن زیرەك و داهێنەر مێشکێ خۆ ب تنێ پشکەکا کێم یێ ب کار ئینای، ئەڤ مێشکە ئەگەر ژ کار کەڤت، یان مە خەلەت ب کار ئینا نەوەکی وێ یا خودێ ڤیای کو ببیتە ئالاڤەك بۆ نیاسینا خودێ، ئالاڤەکە مە دگەهینتە پاراستنێ ل دنیایێ و شادییێ ل رۆژا قیامەتێ، ل ڤی دەمی دێ چەند خوسارەتی یا مەزن بیت دەمێ ئەم عەقلێن خۆ ژ کار دئێخین، و ل دویڤ دلچۆنێن خۆ دکەڤین.

# کەرستەکە ژ مێشکی دەردکەڤیت بۆ نەهێلانا ئێشانێ
## ( دەرگەهێن ئێشانێ )

زانایان یا ئاشکراکری د مێشکێ مرۆڤیدا کەرستەکێ بێهۆشکرنێ یێ هەی، دەمێ ئێشانا جهەکێ مرۆڤی دگەهیتە ئاستەکی مرۆڤ خۆ ل بەر نەگریت، ل ڤێرە دێ مێشک ڤی کەرستەی بەردەت، دێ ئێشانێ تەناکەت، ئەڤە ئەو دەمن یێن ئەم دبێژین های ژ خۆ نەما یان دلگرتی بوو، ئەڤە ژی ژ دلۆڤانییا خودێیە بۆ مە، و دیسا ئاشکرا کر کو هندەك دەرازینك یێن د کۆئەندامێ دەماریدا هەین ناهێلن ئێشان بگەهیتە مێشکی، و ڤان دەرازینکا هۆکارێن دەروونی کۆنترۆلێ ل سەر دکەن، و ئەگەر مرۆڤەك بزاڤێ بکەت بۆ رازیبوونا خودێ، و ئەو یێ دلخۆش بیت ب ڤێ بزاڤێ، هەستکرن ب ئێشانێ ناگەهیتە مێشکی.

گەلەك کاودان د دیرۆکێدا هاتینە، چاوا سەحابییەك د دەمێ شەڕیدا دەستێ وی یێ راستێ دهاتە بڕین، دا ئالای کەتە د دەستێ چەپێدا، و دەمێ ئەو ژی دهاتە بڕین دا ب هەردو زەندکا ئالای گریت، کا ئێشان؟ ئەڤ چەندە زانایان نوکە یا ئاشکرا کری، دبێژن: (دەرازینکێن ئێشانێ یێن ل سەر دەرۆکێن رێکا ئێشانێ هەین، و رێکا چەڤا دەماریدا کو ژ دویماهییێن دەمارینە بۆ ستریە مەژی، بۆ ژێرلاندکێ، بۆ مێشکی، ئەڤە رێکا ئێشانێیە، و ئەڤ رێکە هندەك جاران دئێنە گرتن، ناهێلن ئێشان بگەهیتە مێشکی، و ڤان دەرازینکان هۆکارێن دەروونی کۆنترۆلی لێ دکەن، وەکی باوەری و پشت راستبوون ب خودێ، و پشت راستبوون ب سەرکەفتنێ، و د سەر ڤێ چەندێڕا ئەگەر ئێشان گەهشتە رادەکی کو مرۆڤ خۆ ل بەر نەگریت دێ مێشك کەرستێ بێهۆشکرنێ بەردەت و ئێشانێ ناهێلیت).

لەوا ئەگەر باوەرییا مرۆڤی یا مەزن بیت، و ئارمانجا وی ماقویل بیت، و بزاڤا وی هاندانەك بیت بۆ خودێ، گوه نادەتە ئێشانێن ب ئەگەرێ وان زەلام پێ دكەڤن، چونكی باوەری هێزەكا مەزنە.

خەلیفێ موسلمانان ئەبو بەكر سەدیق سەركردێ لەشكەرێ خۆ خالدێ كورێ وەلیدی هنارتە جەنگەكێ د ڤەكرنێن موسلماناندا ل عیراقێ و شامێ، و خالدی داخوازا هاریكارییێ ژێ كر، چونكی هژمارا دژمنان سەد و سیە هزار بوون، و موسلمان نێزیكی سیە هزاران بوون، و خالد چاڤەرێی پێنجی یان سیە هزارێن دی بوو بۆ بهێنە هنارتن، بەلێ ب تنێ زەلامەك بۆ هات قەعقاعێ كورێ عەمروی بوو، و نامەك د گەل بوو، ئینا خالدێ كورێ وەلیدی گۆتێ: كا پشتەڤانی؟ قەعقاعی گۆت: ئەزم پشتەڤانی، خالدی گۆت: تو؟ ئینا نامە ڤەكر، تێدا هاتبوو: (ژ ئەبو بەكر سەدیق بۆ خالدێ كورێ وەلیدی، ئەز سوپاسییا خودێ دكەم ژ بۆ تە، نەمینە حێبەتی هەی خالد كو من بۆ تە سەربازەك ب تنێ هنارتییە، ئەز ب خودێ كەمە ئەو خودایێ چو خودێ ژ بلی وی نەی ئەو لەشكەرێ قەعقاعێ كورێ عەمرویێ تەمیمی د ناڤدا بیت ناهێتە شكاندن).

و د ڤی شەرێ ئێكلاكەردا موسلمان سەركەفتن ل سەر دەستێ قەعقاعی، چونكی زەلامەك ب باوەرییێ مینا هزار زەلامایە، و هزار زەلام بێی باوەری وەكی ئۆڤەكێنە (أف).

# بیردانك

خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات].

کەس ژ مە نینە ئەگەر بیردانك د مێشکێ ویدا نەبیت، کو رۆلەکێ گەلەك مەزن یێ هەی د ژیانا مەدا، و زانا د ڤێ ئایەتا قورئانێدا دیار دکەن و دەردئێخن: (وَلَوْ نَشَاءُ لَمَسَخْنَاهُمْ عَلَى مَكَانَتِهِمْ فَمَا اسْتَطَاعُوا مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ (٦٧) [يس]، (ئانکو: ئەگەر مە ڤیابایە دا وان د جهێ کرنا گونەهێدا گوهۆرین و کەینە تشتەکێ دی، کو وان نەشیابایە نە بچن، نە بزڤرنەڤە).

چاوا تو د زڤرییە مالا خۆ؟ چونکی تو جهێ وێ دزانی، چاوا تە جهێ وێ زانی؟ چونکی جهێ وێ یێ مایە د بیردانکا تەدا، و چاوا دوکاندارەك دزانیت کا هەر پارچەکا تشتی ل کیرێیە، چونکی جهێ ڤان پارچان دانایینە د بیردانکا ویدا، و دەمێ تو د مالدا دزانی جهێ هەر تشتەکێ پێدڤییێن تە ل کیرێیە، تە ل کیرێ ئەڤ کریارە دانایینە؟ و دەمێ تو ل خواندنگەهێ و تە هندەك پەرتۆك دخواندن، و ئەزموون دکرن، چاوا تە ئەڤ ئەزموونە دکر؟ ب رێکا وان پێزانینێن چۆینە د بیردانکا تەدا، و ئەگەر مرۆڤەك یێ بێ بیردانك بیت هەبوونا خۆ نامینیت، و مەحالە ئەو فێر ببیت، خودێ دبێژیت: (وَلَوْ نَشَاءُ لَمَسَخْنَاهُمْ عَلَى مَكَانَتِهِمْ فَمَا اسْتَطَاعُوا مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ (٦٧)).

ئەو گۆتارێن زانستی یێن ل سەر بیردانکێ ئاخفتین، دبێژن: (ئەگەر مرۆڤ شێست سالا ژیا، ئەو وێنێن د بیردانکا ویدا عومبار بووین دێ پتر بن ژ شێست ملیار پێزانینان! ئەگەر مە بڤێت ڤان پێزانینان د پەرتۆکاندا بنڤێسین دێ ژ هزارەها بەرگان بۆریت، هەمی پەرتۆکن پێزانینان عومبار دکەن کو هەتا نوکە جهێ وێ د مێشکیدا نوزانن، و هندەك بیردۆزێن نوی یێن هەین کو بیردانکێ چو جه د مێشکیدا نینن؛ و یا گرێدایە ب ژیانا دەروونیڤە.

ئەڤ پێزانینێن بۆ مرۆڤی دهێن هندەك ژ وان د جهەكێ نێزیكدا عومبار دبن دا زڤراندنا وان ب سناهی بكەڤیت، و هندەك د جهەكێ ناڤیندا عومبار دبن، و هندەك د جهەكێ دویردا، و هندەك ب ئێكجاری عومبار نابن، و دەمێ پێزانین دهێنە وەرگرتن دابەش دبن هەر ئێك ل دویڤ جۆرێ خۆ؛ بیردانكەك یا هەی بۆ بێهنان، و بیردانكەكا دی یا هەی بۆ دیتنان، و ئێكا دی بۆ روییێن تشتان، و ئێكا دی یا هەی بۆ رەنگان، و بیردانكەكا دی یا هەی بۆ ناڤان، و ئێكا دی یا هەی بۆ بێهنخۆشكەران، ئەڤە تشتەكێ گەلەكێ هویربینە، ئەگەر مە بڤێت تشتەكی بزڤرینینەڤە، یان تشتەكی بنیاسین، زانا دبێژن: (بیردانك دێ رێكا ئاماژەكرنێ ب كار ئینیت د دەمەكێ گەلەكێ ب لەزدا)، ئەگەر مرۆڤ بهێن بكەتە گولاڤەكێ، و د بیردانكا مرۆڤیدا نۆت و حەفت جۆرێن بێهنێن خۆشكەر یێن تێدا، ئەڤ گولاڤا مرۆڤی بهێن كرییێ، دێ د ناڤ هەمی ڤان جۆرێن بێهنێن گولاڤاندا بۆریت یێن د بیردانكا مرۆڤیدا، هەتا د گەل وی جۆرێ بێهنێ رێك دكەڤیت ئەوێ مرۆڤی بهێن كرییێ، دێ مرۆڤ بێژیت: ڤێ گولاڤێ ئەڤ جۆرێ بێهنێ ژێ دهێت، و ناڤێ وێ ئەڤەیە، ئەڤە ل سەر بێهنێن تشتان، و تامێن وان، و دیتنا تشتان، و جوداكرنا ناڤان و ژماران، و د هەمی تشتاندا، ئەڤ زانیارییێن ل سەر بیردانكێ هەین گەلەك كێمن، و د گەل هندێ ژی راستییێن د بیردانكێدا عەقلمەندان حێبەتی دكەن.

و یا هاتییە زانین ل دەڤ زانایان: (بیردانك فەرهەنگە، و وەرگێرانەكا د گاڤێدایە)، و تشتێ حێبەتی ئەوە خانەیا دەماری دابەش نابیت و نامریت، و ئەگەر دابەش ببان یان مربان دا مرۆڤ هەمی بیرهاتن و شارەزاییێن خۆ ژ دەست دەت، بۆ نموونە: ئەوێ چل سالان شارەزایی د نوژدارییێدا هەی، و ئەوێ پێنجی سالان د یاساییێدا هەی، و ئەو كەسێ چەندەهان سالان د پیشەسازییێدا هەی، هەمی ئەڤ شارەزاییە دكەڤنە سەرێك د گەل گەشەكرنا مرۆڤی، و ئەگەر بیردانكا خۆ ژ دەست دا دێ هەمی شارەزایی ب ئێك جاری ژ دەست چن.

ئەڤ بیردانكە ب تنێ نیشانەكا مەزنە ژ نیشانێن كو دبنە بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ.

# پشکا نەهێ

# هەر پێنج هەست

١- پاراستنا چاڤان ژ نەزەرێ

٢- پەردە تە پلە د گوهیدا

٣- إِنَّ السَّمْعَ والْبَصَرَ والْفُؤَادَ كُلُّ أُلَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُلاً

٤- کارێ چاڤان و گوهان

٥- هەستەوەرا بێهنێ و پێکهاتا وێ

٦- ناڤەندا تامێ د مێشکیدا

# پاراستنا چاڤان ژ نەزەرێ

دەمێ مرۆڤ بەرێ خۆ ددەتە ژنەکێ، و دوبارە بەرێ خۆ ددەتێ، ئەڤ بەرێخۆدانە وەکی گڤاشتنا ل سەر لەبلەبکێ چەکییە، ژ بەر ڤێ بەرێخۆدانێ هۆرموونێن جنسی د لەشیدا دگەرن، ئەڤ هۆرموونێن جنسی لێدانێن دلی دگوهۆرن، و خوینهێنەرێن دەوروبەر فرەهـ دکەن، و خوینبەرێن ناڤنجی و بچویك تەنگ دبن، و فشارا خوینێ دێ بلند بیت، ئەڤ هۆرموونێن جنسی دگەهنە پرۆستاتان، و دێ رێکا میزێ گرن، و دێ رێکا ئاڤا ژیانێ د هەردو گونان‌دا ڤەکەت، و دێ کەرستەکێ پاقژ ژێ دەرکەڤیت، و کەرستەکێ بهێنکەر، و کەرستەکێ (مغذية)، پاشی دێ گوهۆرین د کیمیایا خوینێدا چێ بیت، پێخەمەت دورستبوونا کریارا جوتبوونێ، و پاراستنێ ل سەر رەگەزێ مرۆڤایەتییێ دکەت.

بەلێ ئەگەر مرۆڤی ب درێژاهییا رۆژێ بەرێخۆدان (نەزەر) کر، دێ چ چێ بیت؟ گۆت: دێ هۆرموونێن جنسی بەردەوام ـ ب رێکا لۆلەیێن خوینێ ـ د لەشیدا گەرن.

خودێ دبێژیت: (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ) [النور: ٣٠]، (ئانکو، بێژە خودان باوەران، بلا چاڤێ خۆ ژ بەرێخۆدانا نەدورست و حەرام وەرگێرن، و بلا دەهمەن و نامویسا خۆ بپارێزن ئەڤە بۆ وان چێتر و پاقژترە (بکەڤنە د پیساتییا گونەهێدا).

زانا دبێژن: (أَزْكَى: ئانکو پاقژتر، و چێ دبیت رامانا وێ ببیتە ب مفاتر و باشتر)، یان (أَزْكَى لَهُمْ) دبیتە پاقژ ژ گونەهان، یان پاراستن ژ نەخۆشییان، و زار حوزەیفە ﵁ گۆت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((النَّظرَةُ سَهمٌ مِنْ سِهامِ إبلِيسَ مَسْمُومَةٌ، مَنْ تركَهَا مِن

خۆفِ اللهِ جَلَّ وَعَزَّ أثابَهُ اللهُ إيمَاناً يَجِدُ حَلاوَتَهُ فِي قَلبِهِ))[1]، (ئانكو، نەزەر تیرەكە ژ تیرێن ئبلیسی، ئەوێ ئەڤ چەندە ژ ترسا خودێ هێلا، دێ خودێ باوەرییەكا وەسا دەتێ شریناهییا وێ باوەرییێ د دلێ خۆدا ببینیت).

دەمێ تیر چۆ د لەشیدا دێ برینەكێ دورست كەت، چێ دبیت جهەكێ لەشی یێ دەستنیشانكری پویچ كەت، بەلێ دەمێ یێ ژەهركری بیت ئەڤ ژەهرە دێ چیتە د هەمی لەشیدا.

پێغەمبەری ﷺ بەری چاردە سەدان مەترسییا نەزەرێ یا دیاركری كو نەزەرەكا دی د دویڤدا دهێت، چونكی نەزەر وەكی گڤاشتنا لەبلەبكێ چەكییە، كو ب ئەگەرێ وێ زنجیرەكا كارلێكرنان دەست پێ دكەن، و هاڤێژتنێن هۆرموونی یێن جنسی یێن مژدار، كو كارتێكرنا وان ل سەر هەمی ئەندامان هەیە، بەلكو ل سەر هەمی خانەیان، و لەشی ئامادە دكەت بۆ پەیوەندییا جنسی، داكو كارێ خۆ یێ گرنگ ب جھ بینیت د بەردەوامییا دویندەهێدا، پێدڤییە ئەڤە هەمی چێ ببن د دەمەكێ دەستنیشانكریدا، بەلێ ئەگەر هاڤێژتنا ڤان هۆرموونان بەردەوام بوون د لەشیدا بێی ڤالاكرنا ڤێ دلچۆنا خۆ، ئەڤە دێ كێشیتە كێشێن مەترسی د لەشیدا.

ئەز ب سەر ڤەكۆلینەكا زانستی هەلبووم د جهەكێ زانیارییاندا و بیست سال ل سەر دەستپێكرنا ڤێ ڤەكۆلینێ دەرباز ببوون، و ئەڤ ڤەكۆلینە گەهشتبوو ڤان ئەنجامان:

ئەڤ هۆرموونێن كو د ناڤ لەشێ مرۆڤیدا دچن ب درێژاهییا رۆژێ و نەزەرێ ب چاڤێن خۆ دكەت، ج ئافرەتەك د نڤێسینگەهەكێدا كار بكەت، و ل جهەكێ دی رویساتی هەبیت، و ڤەرەستن هەبیت، و ل جهەكێ دی خۆدیاركرنا ژنان هەبیت، و خۆڤەدەركرن ل جهەكێ دی هەبیت، و ئاخڤتنەكا جنسی ل جهەكێ دی هەبیت، یان ب رێیا گۆڤارەكێ... هتد.

---

([1]) أخرجة الحاكم في المستدرك (٧٨٨٥) ژ زارێ حوزەیفەی، و دبێژیت: ئەڤە فەرموودەكا سەحیحە ژ لایێ (إسناد)ێڤە، و تەبەرانی د (المعجم الكبير)دا ژ زارێ ئیبن مەسعودی.

پێغەمبەر ﷺ ژ دەڤ خۆ نەدئاخفت، فەرمانا دانەپاشییێ یا کری ژ دویڤچۆنا نەزەر بۆ نەزەرێ، دیسا ژ رویساتییا ئافرەتان، و ژ وێ ئافرەتا دەمێ ژ مال دەردکەڤیت یا گولاڤکری بیت، و ژ مانا ڤەدەر د گەل بیانییەکێ، و ژ چۆنا دەستی، و ژ نەچۆنا ژنێ ل سەر نڤینا زەلامێ خۆ، ئەڤە هەمی ژ بەر پاراستنێیە ژ نەخۆشییان کو ناهێنە هژمارتن.

**نوکە بەرەف هویربینییان:**

چاوا دەمێ مار ب مرۆڤەکی ڤەددەت چێ دبیت بمریت، ئەگەرێ زانستی یێ ڤێ چەندێ ئەوە ژەهر لۆلەیێن خوینێ فرەهـ دکەت بۆ پلەیەکا نەیا پەسەند، دێ پەستان هێتە خوار، و دێ مرۆڤ مریت، نوکە ژەهرا ماری دئینن و دکەنە دەرمانەکێ کاریگەر بۆ فرەهکرنا خوینبەر و خوینهێنەران، ل ڤێرە دەمێ خوینبەر و خوینهێنەر فرەهـ دبن ب بەفرەهبوونەکا ژ راددەی دبۆریت، ئەڤە چێ دبیت بکێشیتە مرنێ، ڤان هۆرموونان ڤەکۆلەر دبێژنێ (ژەهراوی)، ژەهر ب رێژەکا دەستنیشانکری دەرمانە، بەلێ ب رێژەکا بەرفرەهـ دەردە (مەترسییە).

چ روی ددەت؟ ئێکەم دیاردە بێهنەکا گەلەك نەخۆش ژ بنکەفش و پێیان دهێت، ژ بەر کارتێکرنا زڤرینا ڤێ ژەهرێ ب درێژییا رۆژێ، ژ بەر کو مادەم بەرێخۆدانا حەرام هەبیت، و رۆژنامان، و بەرێخۆدانا فلمان، و ئافرەتێن رویس، و مانا ڤەدەر د گەل بیانییان، و ئاخفتنا جنسی، ئەڤە دکێشیتە زڤرینا ڤان هۆرموونان ب درێژاهییا رۆژێ، و چەندییا وێ زێدە دبیت، و درێژبوونا زڤرینا وێ دبیتە ژەهر.

ئێکەم دیاردە دیاربوونا بێهنەکا نەخۆش ژ بنکەفش و پێیان، کونێن رژێنێن خوهێ و دوهنی د هەردو کاباندا فرەهـ دبن، و بنێ هەردو پێیان و د کماخێدا، و ئەڤە دێ بیتە ئەگەرێ هندەك باوەسیران، و کونێن دوهنی ل دێمێ مرۆڤی فرەهـ دبن، و ئەڤە دێ بیتە ئەگەرێ پرسکێن گەنجا (حب الشباب) ژ زڤرینا هۆرموونان، زڤرینا ڤان هۆرموونێن جنسی، کو ئەڤە وەکی ژەهرێیە، و نەخاسمە دەمێ پتر دئارییێت ژ رادێ ناڤنجی دبیتە

ئەگەرێ نەخۆشییا شەقە سەرێ، یان سەرئێشا رەخەکێ سەری کو هەتا نوکە چارەسەرییا وێ نەهاتییە زانین.

تشتێ مەترسی ئەوە ئێشان یا د هەمی گەهاندا، و نەخاسمە د گەهێن مەزندا، گەها چۆکی و گەها گۆیی، دیارە ئەڤ هۆرموونە چڕاتییا وی شلێ د ناڤبەرا هەستییاندا کێم دکەن، و ئەڤە دبیتە ئەگەرێ هشکبوونا ئەڤی شلەی، پاشی تێکهوسینا هەستییان، پاشی ئێشانێن گەهی کو شیانێن خۆ ل بەرگرتنێ نینە.

و د جڤاکێن رۆژئاڤادا، و د ژییەکێ بچویکدا ژ ڤێ دیاردێ دنالن، ژ ئەگەرێ زڤرینا ڤان ژەهران د لەشیدا ب درێژاهییا رۆژێ، دو کارمەندێن (سیرک)ێ ل بریتانیا، د ژییێ سیه سالییێدا تووشی کاودانێن توند بوون د گەهێن خۆدا، و چو ئەگەرێن جهێ باوەرییێ نەبوون ژ بلی ئاراندنا جنسی یا بەردەوام.

و د بوارێ دلی و لۆلەیێن خوینێدا، ژ بەر بەردەوامبوونا ڤان هۆرموونان (ژەهراوییان) دێ لێدانێن دلی ئینیتە خوار، و زڤرۆکا خوینێ سست دبیت، چێ دبیت جەلتەکا خوینهێنەرییێ دورست بیت، و خوینبەر بەردەوام فرەهـ دبن، دێ بیتە ئەگەرێ ژ دەستدانا نەرماتییا وان، و ل ڤێرە د گەل گوهۆرینا کیمیایی یا خوینێ ئەڤە دکێشیتە رەقبوونا خوینبەران، و ئەڤە نەخۆشییا ئێکێ یا سەردەمییە، و ئەڤ نەخۆشییە د جڤاکێن سەربەرداییدا (المتفلتة) بەربەلاڤن.

پاشی ئەڤ ژەهرێن د لەشیدا دگەرن، دێ بنە ئەگەرێ جەلتەکا دوهنی؛ دەمێ د جهەکێ دەستنیشانکریڤە مان کوراتی دویڤرا دهێت، یان نەخۆشییا نەرمبوونا هەستی و خواربوونا وان، یان فالنج، یان دیناتی، یان ژ دەستدانا بیردانکێ.

و ئەڤ ژەهرە ئەگەر ب درێژاهییا رۆژێ ڤەکێشا، دێ بیتە ئەگەرێ گرانبوونا ئەزمانی، و لڤینا ئەزمانی دێ ب زەحمەت کەڤیت د ناڤ دەڤیدا، دیسا دێ بیتە ئەگەرێ قەڤسبوونێ، و پێنجی نەخۆشی ژ قەڤسبوونێ چێ دبن، و ئەڤێ ب درێژاهییا رۆژێ بەرێ وی ل ئافرەتێن جوان، ئافرەتێن خۆ بهێنخۆش کری بیت، و بەرێخۆدانا زنجیرێن تەلەڤزیۆنی

دکەت، و دروینتە خوار د روینشتنێن خودێ ژێ نەرازی، ئەڤە هەمی نیشانن تووش دبنێ.

و هندەك شوینەوارێن نەرێنی د بەردەوامبوونا زڤرینا ڤان ژەهران د زراڤیدا چێ دبن، ئەڤە ژی دیسا ژ ئەنجامێن زڤرینا ڤان ژەهرانە د لەشیدا، و دیسا د هندەك کاودانان‌دا کو ژ رادێ بەرئاقل دبۆرن ل ڤێرە دێ پرۆستات گەلەك مەزن بن.

ئەڤە ئەنجامێن ڤەکۆلینەکا نوژدارەکی بوون د دامەزراوەکا زانستی یا دەولەتەکا عەرەبی، د جهەکێ پێزانینان‌دا ب دەست من کەڤت، بەلێ ئەڤە راستگۆیەکا گۆتنا پێغەمبەرییە ﷺ: ((النَّظرَةُ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ إِبْلِيسَ مَسْمُومَةٍ، مَنْ تَرَكَهَا مِنْ خَوْفِ اللهِ جَلَّ وَعَزَّ أَثَابَهُ اللهُ إِيمَاناً يَجِدُ حَلاوَتَهُ فِي قَلْبِهِ))[1].

ب راستی شیرەتکرن و ئاراستەکرنا پێغەمبەری ﷺ ژ دەڤ وی نینە، (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)) [النجم]، (ئانکو، ئەو (پێغەمبەر) ژ دەڤ خۆ و ژ دلخوازییا خۆ نائاخڤیت. و نائاخڤیت ئەگەر ژ وەحییێ نەبیت (ئانکو قورئان ژ وەحییێ پێڤەتر نینە).

مەحالە خودێ تشتەکی حەلال کەت یان تشتەکی حەرام کەت کو ئەنجامێن مەزن تێدا نەبن، یێ ب سەر هەلبوو دێ زانیت، و یێ پاش گوه هاڤێت نوزانیت، ئەم وەك باوەردار فەرمانا خودێ ب جه دئینین بێی د حیکمەتا ب جهئینانا وێ بگەهین، بەلێ دەمێ بۆ مە حیکمەتا وێ ئاشکەرا دبیت باوەرییا مە زێدە دبیت ب مەزناهییا ڤێ یاسایێ، خودێ دبێژیت: (لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ) [الفتح: ٤]، (ئانکو، دا د سەر باوەرییا وانرا باوەرییا وان پتر لێ بێت).

و خودێ دلۆڤانییێ ب وی ببەت یێ گۆتی:

يا رامياً بسهام اللحظِ مجتهداً     أنتَ القتيلُ بما ترمي فلا تصب
وباعثَ الطرفِ يرتادُ الشفاء لهُ  احبس رَسُولَكَ لا يأتيكَ بالعَطبِ

---

(١) سبق تخريجه ص ٢٢٧.

# ته‌پله‌ په‌رده‌ د گوهیدا

خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات].

د ناڤ ته‌ ب خۆدا نیشانێن هه‌ین کو ناهێنه‌ هژمارتن، ژ وان په‌رده‌ ته‌پله‌یه‌، و هه‌ر ئێکی په‌ردا ته‌پلا گوهێ وی ب رێکخستن کار دکه‌ت، په‌رده‌ ته‌پله‌ په‌رده‌کا ته‌نکه‌، ستویراتیبیا وێ ناگه‌هیته‌ نیڤ مللیمه‌ترێ، و تیرا وێ ناگه‌هیته‌ نه‌هـ مللیمه‌تران - ئانکو کێمتر ژ سه‌نتیمه‌تره‌کێ - یا ب هێزه‌ وه‌کی هه‌ستیێ پشتێ، و یا نه‌رمه‌ وه‌کی مه‌تاتی، گه‌له‌کێ چالاکه‌ بۆ ڤه‌گوهاستنا ده‌نگان، ئه‌گه‌ر ئه‌ڤ په‌رده‌ ژ کار که‌فت دێ مرۆڤ گوهلێبووناخۆ ژ ده‌ست ده‌ت، ژ به‌ر ڤێ چه‌ندێ خودێ وه‌سا یێ چێ کری کو یێ پاراستی بیت ژ پویچبوونێ و کرییه‌ د ناڤ دویماهییا چاله‌کا چه‌میایی کو ته‌نگتره‌ ژ تبلا قلیچا مرۆڤی، دا چو تشتێن بچویك تێرا نه‌چن.

خودێ وه‌ل گوهێ ناڤین کرییه‌ - و ئه‌ڤه‌ ژ حیکمه‌تا خودێیه‌ - کو یێ گرێدایی بیت ب که‌ناله‌کێڤه‌ بۆ گه‌ورییێ، و ده‌مێ فشاره‌کا ب هێز هات تێرا هندێ بکه‌ت تێرا بچیت، دێ فشارا هه‌مبه‌ری ڤێ چه‌ندێ ژ ده‌ڤی هێت، دێ هه‌ردو فشار هه‌ڤسه‌نگ بن، ل ڤێره‌ دێ په‌رده‌ ته‌پله‌ هێته‌ پاراستن ژ دڕاندنێ، چونکی ده‌نگێن ب هێز دشێن په‌رده‌ ته‌پله‌ی بدرینن.

ئه‌ڤ په‌رده‌ یا گرێدایه‌ ب چار هه‌ستیکانڤه‌ کێشا وێ ژ پێنجی و پێنج مللی گرامان نابۆریت، و درێژاهییا وێ ژ نۆزده‌ ملیمه‌تران زێده‌تر نینه‌، ڤان هه‌ستیکان کاره‌کێ گه‌له‌کێ باش یێ هه‌ی، ده‌نگێن نزم ده‌هـ جارکی مه‌زن دکه‌ت، هه‌تا بیست جارکی، و ده‌نگێن مه‌زن یێن ب زیان نزم دکه‌ت، ئه‌ڤه‌ کۆئه‌ندامه‌که‌ کار دکه‌ت بۆ مه‌زنکرنا ده‌نگی، و نزمکرنا ده‌نگی، و ئه‌ڤه‌ د سه‌ر شیانا مرۆڤیدایه‌، ژ به‌ر کو کۆئه‌ندامه‌که‌ کار

دكەت ل سەر بلندكرنا ئاستێ دەنگی، و نزماتییا وی، ئەڤە ژ نیشانێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا خودێ.

ئەو دەنگێن ژ بیست دیسبلان دبۆریت ـ كو ئەڤە یەكا پیڤانا دەنگایە ـ دشێت زیانێ بگەهینیتە گوهی، و كریارەكا دەماری یا مژدار یا هەی دەنگی نزم دكەت، و دەمێ تە های ژ دەنگێ كەسەكی نەبیت دێ بێژییێ: دوبارە بكە، من گوه لێ نەبوو، دێ هندەك لڤینێن دێمێ وی كارتێكرنێ كەنە سەر دەمارەكا هەڤپشك د ناڤبەرا دێمێ وی و ماسۆلكەكا گرێدایی ب هەستییێ ركێڤفە، ئەڤە دشێت هەستدارییا گوهی زێدە بكەت، ئانكو دەمێ دێمێ تە دهێتە گوهۆرین، و دەمی تە های ژ ئاخفتنێ نەبیت، ل ڤێرە سیستەمەكێ گەلەكێ مژدار یێ هەی دەنگی ڤەدگوهێزیت د ماوێ دەمارا گوهلێبوونێڕا بۆ ماسۆلكەكێ دێ هەستدارییا گوهی زێدەكەت.

دەنگ لەرزاندنەكە دهێتە ڤەگوهاستن د ماوێ ناڤبەرەكا نەرمدا، و ناڤبەرا نەرم مەبەست پێ هەوایە، بەلێ ناڤبەرێ رەقاتییا وی یا توند، دەنگی ب لەزتر ڤەدگوهێزیت، و ناڤبەرێ شل دەنگی بلەزتر ڤەدگوهێزیت، و ب هویرترین ئاست، ژ بەر ڤێ چەندێ دەنگ دهێتە ڤەگوهاستن بۆ پەردە تەپلەی د ماوێ هەوایدا، و پەردە تەپلە دەنگ ژ ڤی پەردەی دهێتە ڤەگوهاستن د ماوێ چار هەستیكانڕا، پاشی د كەنالێ كو بنیاتێ وی شلەیە.

چونكی دەنگ دهێتە ڤەگوهاستن جارەكێ د ماوێ هەوایدا، و پشتی پەردە تەپلە د ماوێ لەشێن رەقڕا، و پشتی لەشێن رەق د ماوێ كەنالێ شلە تێدا بیت.

بیست و پێنج هزار خانەیێن بیهیستنێ یێن هەین دەنگی بۆ مێشكی دبەن، دا تو بزانی، و هەتا ڤێ دەمژمێرێ زانا نەشیاینە ئاشكەرا بكەن كا چاوا گوه دشێت جیوازییێ د ناڤبەرا ئاوازان و دەنگە دەنگاندا (هۆسە) بكەت.

بۆچی دەمێ پارچەكا شیشەی ل بن دەرگەهی دخریت، تو هەست دكەی دێ ژ پیستێ خۆ هێیە دەر؟ و بۆچی دەمێ تو هەمبەر سویلاڤەكێ دراوەستی دەنگێ شرشرا ئاڤێ دهێت خۆشییەكە بۆ تە و سەبرا تە پێ دهێت؟ ئەڤە دەنگە دەنگە، و یا دی ئاوازە، و

خۆشیە بۆ گوهان، چاوا تە جوداهی د ناڤبەرا ڤان دو دەنگاندا کر؟ و چاوا ئەڤ گوهە سەدان هزاران دەنگان وەردگریت، و هەر دەنگەکی تیبەتمەندییەکا دەنگی یا هەی د بیردانکێدا تۆمار دبیت؟ چاوا د تێلەفۆنێرا دێ بێژییە کەسەکی: تو فلان کەسی؟ ئەڤە چ هەستدارییە د گوهیدا بۆ تە عومبار دکەن، د بیردانکا مرۆڤیدا سەدان، بەلکو هزاران دەنگێن تایبەت پێن هەین؟

هەتا نوکە گوه نهێنییەکە ژ نهێنییێن خودێ، و هەتا نوکە گوه نیشانەکە ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ.

ئەوا ل ڤێرە هاتییە پێشکێشکرن زانیارییێن گەلەك کورتن، بەلێ ئەگەر هوین ب هویربینی بزانن کا چ د ڤی گوهیدا هەیە ژ حێبەتییان دێ سوجدێ بۆ خودێ بەن بۆ مەزنکرن و سوپاسییا وی.

# إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُلَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُلاً

**ژ نیشانێن خودێ یێن گەردوونی کو دبنە بەلگە ل سەر مەزناهییا وی، و ژ رێککەڤتنا ئایەتێن قورئانێ د گەل ئافراندنا مرۆڤی ئەڤە دوپات دکەت کو ئەڤ قورئانە یا ژ دەڤ خودێ هاتی، و رێککەڤتنەکا حێبەتی و بێ دویماهی و هەروهەر یا هەی د ناڤبەرا ئەوا د قورئانێدا هاتی و ئەوا د زانستیدا، خودێ دبێژیت: (إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا (٢)) [الانسان].**

**هویربینییەکا گەلەك یا د گۆتنا خودێدا هەی د گوهداریکرنێدا، و ما دەم ب گوه و ب چاڤ ئێخستی، بۆچی گوهلێبوون بەری دیتنێ هاتییە د ڤێ ئایەتێدا؟ خودێ دبێژیت: (قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ اللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَارَكُمْ) [الأنعام:٤٦]، (ئانکو، (هەی موحەممەد) بێژە وان: بێژنە من ئەگەر خودێ هوین ژ گوه و چاڤان کرن).**

**ل ڤێرە دو حیکمەت یێن هەین زانایان پشت پێ بەستی: (گوهلێبوون مەترسیترە ژ دیتنێ بۆ ژیانا مرۆڤی)؛ چونکی مرۆڤ ب گوهلێبوونێ دەنگان ژ شەش لایان وەردگریت، ژ لایێ راستێ، و یێ چەپێ، و ژ سینگی، و ژ پشتێ، و ژ سەری، و ژ ژێرییێ، د تاریاتییێ و رۆناهییێدا، د شەڤێ و رۆژێدا، زێدەباری ناڤبرێن بێ دەنگییێ گوهلێبوون دگەهیتە گوهی، و هەر وەکی گوهلێبوون های ژ هەمی خانییە، دەمێ تو یێ نڤستی دێ گوه ل لڤینەکا ژۆرا مێهڤانا بی کو دهێتە ڤەگوهاستن، بەلێ چاڤێن تە ب تنێ ڕەخێن ژۆرا نڤستنێ دبینن، دەمێ تو ترومبێلێ دهاژۆی ب تنێ تو وی تشتی دبینی یێ ل بەر سینگێ تە، بەلێ ئەگەر خەلەتییەك د لڤینەریدا هەبیت، یان خەلەتییەك د تایراندا هەبیت، دێ دەنگێ وان گەهیتە گوهێ تە، دێ ل دەمێ گونجای راوەستی، ئەڤە هندەك ئاراستەکرن و شیرەتکرنێن زانایانە، دیار کرییە کو گوهلێبوون بۆ مرۆڤی ژ دیتنێ گرنگترە.**

تشتەکێ دی، خودێ دبێژیت: ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ(١٠)﴾ [الملك]، (ئانكو، گۆتن ئەگەر مە فام هەبایە و ئەم یێت كەڕ (بێ گوهـ) نەباینە، نوكە ئەم نەدبووینە دۆژەهی).

بۆچی خودێ ب تنێ گوهلێبوون هەلبژارتییە؟ چونكی ئەوێ كەڕ بیت، دێ یێ لال ژی بیت، ئەوێ گوهـ لێ نەبیت نائاخڤیت، و یێ گوهـ لێ نەبیت و نەئاخڤیت ژ لایێ ئاقلیڤە دێ یێ پاشڤەمایی بیت، د گەل رێژا پەككەفتییێن عەقلی دهێتە هژمارتن، چەند كەسا دیتنا خۆ یا ژ دەست دایی، و د گوپیتكا زانستی و ئەدەبیدا بوون، ئەو پێشەنگ بوون، بەلێ ئەوێ گوهلێبوون نەبیت نائاخڤیت و تێ ناگەهیت، ئەڤە هندەك ئاراستە بوون.

هویربینییا چێكرنا گوهلێبوونێ وەكی هویربینییا چێكرییا دیتنێیە، د ڤێ ئاخڤتنا خودێدا: ﴿مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ﴾ [الملك:٣]، (ئانكو، دانان و رانان و چێكرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێكنەكەڤتنێ تێدا نابینی). هندەك كۆمپانی بۆ نموونە پەرتالەكێ پلە دو بەرهەم دئینن، دبێژنە ڤی بەرهەمی: پەرتالەكێ بازرگانییە، و چێ دبیت پەرتالەكێ ب پلە ئێك بەرهەم بینن، ئەڤی بەرهەمی بهایەكێ تایبەت یێ هەی، بەلێ چێكرنێن خودێ چو ڤێككەڤتن تێدا نینە، هەمی یێ باش و هویربین كری و تمامە كو دگەهیتە پلەكا ڤەبڕ.

بەلێ هەر ئێك ژ گوهلێبوون و دیتنێ كارێن خۆ یێن تایبەت یێن هەین، ب گوهلێبوونێ تە های ژ راستییێ دبیت، و هزركرنا ب ئاقلانە د راستییاندا دكەی، و ب دیتنێ تو بەرێ خۆ ددەیە جوانییان و تشتان، و بەرێ خۆ ددەیە وێنە و رەنگ و ڤەبارە و سالۆخەتێن وان، بەلێ ب گوهلێبوونێ مرۆڤ راستییێن وان دزانیت.

زانایان ئەشكەرا كر كۆرپەلەی د رۆژا بیست و دویێدا ژ پیتێنا هێكێ، جهێن گوهلێبوونێ و دیتنێ دیار دبن، بەلێ زارۆك نابینیت ب تنێ پشتی هەیڤا سێیێ نەبیت ژ بوونا وی، و هەتا هەیڤا سێیێ چو تشت كارتێكرنێ ب دیتنا وی ناكەن ب تنێ رۆناهی نەبیت، بەلێ ئەو چو نابینیت كو بەرەڤ وی تشتیڤە بچیت ب تنێ پشتی هەیڤا سێیێ نەبیت، و تشتا رەنگا و رەنگ نابینیت ب تنێ پشتی هەیڤا چارێ نەبیت ژ بوونا وی،

بەلێ د حەفتییا بیست و شەشێدا دەمێ د زکێ دایکا خۆدا، ئانکو د نیڤا هەیڤا شەشێدا، و ئەو یێ د رەحمیدا، گوه ل دەنگان دگریت، و ئەو د زکێ دایکا خۆدا، گوه ل لێدانێن دلێ دایکا خۆ هەیە، و گوه ل دەنگێ سیرسیرا مالبچویکی هەیە، و ڤرڤرا رویڤیکان، و هندەك زانایان تاقیکرن کرن، دەنگێن لێدانێن دلی تۆمار کرن، و دەنگێ سیرسیرا مالبچویکی، و ڤرڤرێن رویڤیکان، ئەڤ دەنگێن تۆمارکری بۆ زارۆکی پشتی بوونا وی دانانە سەر، دەمێ دگری، زارۆك بێ دەنگ بوو ژ گرییێ دەمێ گوه ل ڤان دەنگان بووی! ل ڤێرە هەستەوەرێ گوهلێبوونێ د هەیڤا شەش و نیڤێدا دورست دبیت، و هەستەوەرێ دیتنێ پشتی هەیڤا سێیێ و چارێ پشتی بوونێ دورست دبیت، ئەڤەیە یا زانایان بەحس کری، کو خودێ پەیڤا گوهلێبوون بەری یا دیتنێ ئینایە د هەڤدە ئایەتاندا د قورئانا پیرۆزدا گوهلێبوون پێش دیتنێ ئێخستییە سەبارەت گرنگییێ، و دورستبوونا وێ بەری دیتنێ، ب تنێ د ئایەتەکێدا نەبیت، خودێ دبێژیت: (رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحاً إِنَّا مُوقِنُونَ (١٢) [السجدة: ١٢]، ئانکو، (خودێوۆ مە دیت و مە گوه لێ بوو (ژڤانێ تە دایەمە مە دیت، و راستییا پێغەمبەرێ تە مە گوه لێ بوو)، ڤێجا تو مە بزڤرینە (دنیایێ) ئەم دێ کار و کریارێت باش کەین (هەروەکی تە ئەمرێ مە پێ کری)، ب راستی ئەم پشتڕاست بووین و گومان ل دەڤ مە نەما).

زانا دبێژن: (ژ بەر کو لەزاتییا ڤەگوهاستنا وێنەی پترە ژ لەزاتییا ڤەگوهاستنا دەنگی، و وێنە ب لەزاتییا سێ سەد هزار کیلۆمەتران د چرکێدا دهێتە ڤەگوهاستن، بەلێ دەنگ ب لەزاتییا سێ سەد و سیە کیلۆمەتران د چرکێدا دهێتە ڤەگوهاستن).

ل ڤێرە ما دەم ئاخڤتن ل سەر چێکرنێیە، چێکرنا گوهلێبوون و دیتنێ و گوهلێبوون د هەڤدە ئایەتاندا بەری دیتنێ ئێخستییە، و دەمێ کار ب دیتنێڤە یێ گرێدایی بیت، وێنە بەری دەنگی دهێتە دیتن، ژ بەر هندێ دیتن بەری گوهلێبوونێ ئینایە، (رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ (١٢)) [السجدة]، و راستگۆترین دیدەڤان بۆ ڤێ چەندێ، دەنگێ برویسییان، دێ رۆناهییا وێ بینی بەری تە گوه ل دەنگێ وێ ببیت، ئەگەر مرۆڤی بەرەك ژ دویرڤە دیت یێ دهێتە هەلکۆلاندن، دێ بینی مرج یێ ژ

لێدانێن بەری بلند دبیت و لێڤە دبیت، پشتی دەمەکی دێ تە گوهـ ل دەنگێ وی بیت (لێدانا مرجی بۆ بەری).

و د کێم ئایەتاندا پەیڤا (البصر) ئانکو دیتن بەری گوهلێبوونێ یا هاتی، ئەو ئایەتن یێن هۆشدارییێ ب سزایا ئیزاییێ ددەن، یان سالۆخەتکرنا گاوران، و چو ژ ڤان ئایەتان ئاماژێ بۆ چێکرنا ڤان هەردو هەستەوەران نادەن، یان سالۆخەتکرنا کارێن وان، یان گەشەبوونا وان.

خودێ دبێژیت: (وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا) [الأعراف:١٧٩].

و دبێژیت: (أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَا أَمْ لَهُمْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا) [الأعراف:١٩٥].

و دبێژیت: (ثُمَّ عَمُوا وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِنْهُمْ) [المائدة:٧١].

و دبێژیت: (وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُهِهِمْ عُمْياً وَبُكْماً وَصُمّاً) [الإسراء:٧٩].

# کارێ هەردو چاڤان و هەردو گوهان

خودێ دبێژیت: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٧٨)﴾ [النحل:٧٨]، (ئانكو، خودێ هوین ژ زكێت دەیكێت هەوە دەرێخستن (بچویك و لاواز) هەوە چو نەدزانی، و گوه چاڤ و دل دانە هەوە، دا هوین سوپاسی و شوكرا خودێ بكەن (دا هوین هەر ئەندامەكی ژ ڤان د جهێ وی یێ دورستدا ب كار بینن)، و دبێژیت: ﴿ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِنْ رُوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ (٩)﴾ [السجدة]، (ئانكو، پاشی دورست كر و ڕح دایێ، و گوه و چاڤ و ئەقل دانە هەوە، و كێم ژ هەوە هەنە سوپاسی و شوكرا خودێ بكەن، یان ژی هوین كێم شوكر و سوپاسییا خودێ دكەن)، و دبێژیت: ﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنْشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ (٢٣)﴾ [الملك]، (ئانكو، بێژە خودێ هوین پێت داین و گوه چاڤ و عەقل پێت داینە هەوە، بەلێ (هوین ڤان كەرەم و نیعمەتان كێم ب كار دئینن د باشی و تاعەتاندا) هوین كێم شوكر و سوپاسییا خودێ ل سەر دكەن)، و دبێژیت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ﴾ [البلد:٨]، (ئانكو، ما مە روی و چاڤ نەداینێ).

ئەرێ هەوە هزر د هندێدا كرییە كا چاوا ب ڤی چاڤێ بچویك تشتان ل سەر شێوێ وان یێ دورست دبینن؟ و مەزنترین ئامویرێ وێنەگرتنێ وێنەی بۆ تە دەردئێخن زێدەتر نینە ژ روویبەرێ دەستێ تە! چاوا تو چیای ل سەر شێوێ وی یێ دورست دبینی، و دیسا دەریا و رۆژێ؟ چاوا تو تشتان ل سەر شێوێ وان یێ دورست دبینی؟ ئەڤ پسیارە چو زانا هەتا نوكە نەشیاینە بەرسڤێ ل سەر بدەن.

تشتەكێ دی، ئەگەر رەنگێ كەسك بۆ نموونە بكەینە پلە پلە، یان هەر رەنگەكێ دی بكەینە هەشت سەد هزار پلە، ل ڤێرە چاڤێ ساخلەم دشێت جوداهییێ د ناڤبەرا دو

پلەیا ژ ڤان پلەیان بکەت کو زێدەتر ژ هەشت سەد هزار پلەیان، خودێ دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ).

تشتەکێ دی، چاوا ئەڤ چاڤە دشێت دویراتییا سێیێ ببینیت؟ ئەو ژی کویراتییە، درێژی و پاناتی و کویراتییێ دبینیت، ئەگەر خودێ چاڤەك ب تنێ دابا مە دا تشتان ب شێوێ راست و دەشت بینین، نە ب هەر سێ دویراتییێن ویڤە، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو دویراتییێن ل پێشییا مە ئەم ئەگەر ب هەردو چاڤان پێکڤە نەبیت ئەم نوزانین، و ئەو دویراتییێن دکەڤنە بەر چاڤی دێ ب چاڤەکی بینی و زانی.

تشتێ چارێ، چاوا وێنە دەمێ دکەڤیتە سەر تۆرا چاڤی دێ کۆپی بیتە سەر، و هێتە ڤەگوهازتن بۆ مێشکی کێمتر پشکەکێ ژ پێنجی پشکان ژ چرکێ، و د هەر چرکەکێدا چاڤ دشێت پێنجی وێنان بۆ مێشکی ڤەگوهێزیت، ئەوێ کو مەرەم پێ هەی، ل ڤێرە کەنگی شویشتن و دیارکرنا وێنان چێ دبیت؟

تشتەکێ دی، ئەو چاڤێ ساخلەم دشێت دو هێلا ببینیت کو د ناڤبەرا واندا ئێك ل سەر بیستێ مللیمەتر بیت، و د چاڤیدا گەلەك تشتێن هەین ئەڤ گۆتارە ل ڤێرە تێرا ناکەت لێ بزڤرینێ، بۆ نموونە د تۆڕا چاڤیدا کو رویبەرێ وێ ژ هندەك مللیمەتران نابۆریت، سەد و سیه ملیۆن چیلکەیی یێن هەین ژ پێخەمەت هەردو رەنگێن سادە (سپی و رەش)، و حەفت ملیۆن قەچەك ژ بۆ رەنگان و هویربینییان، خودێ دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ(٩)) [البلد].

د چاڤیدا کورنییەکا گەلەك تەنك یا رۆهن یا تێدا، و ئەگەر خوارن ب رێکا مۆلۆلەیێن خوینێ وەرگرتبا وەکی هەر شانەکا دی یا لەشی دا دیتن یا شێلی بیت، و دا تۆڕێ د سەر چاڤیدا بینین، بەلێ کورنیە ب تنێ ب رێکا (الحلول) خوارنا خۆ وەردگریت، ئانکو: خانا دەرەکی خوارنا خۆ و یا جیرانا خۆ وەردگریت ژ بەر کو دا دیتن دورست بمینیت، و یا رۆهن و دیار.

و رەنگینە، ئەڤ بیبیکا رەنگین کو فرەه دبیت، و دهێتە ئێك، فرەه دبیت دەمێ رۆناهی کێم دبیت، و تەنگ دبیت دەمێ رۆناهی توند دبیت، ئەڤە فرەه دبیت و تەنگ دبیت

بێی تو بزانی، و بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ دەمێ تو ژ نیشکەکێڤە ژ جهەکێ رۆناهی دچییە جهەکێ کێم رۆناهی لێ هەبیت تو تشتەکی نابینی، ب تنێ دەمێ ئەڤ بیبیکە فرەهـ دبیت ب شێوەکی بێی حەزا مرۆڤی (لا إرادي)، ژ بەر کو لەشەکێ رۆهن ب کارەکی رادبیت مەزنترین زانا نەشێن پێ رابن، ئەو دهێتە فشاردان، و دهێتە ئێك، و ژێك دهێتە دەر، ژ بەر کو بلند دبیت، و شلەیێ شیشە فشارێن سنوردار پێن هەین.

و هەردو گوهـ، ژێك جوداهی و ڤاڤارتنا گەهشتنا دەنگی بۆ هەردو گوهان دورست دبیت ب رێکا کۆئەندامەکی د مێشکیدا، و ژ بۆ نیاسینا ڤێ چەندێ مێشك جهێ هاتنا دەنگی ئاشکەرا دکەت.

دەمێ تو د رێکێدا دچی، و تە هاتە ژ هۆرێنا ترومبێلێ ل پشت خۆ بوو، تە چاوا ئاراستێ هاتنا ترومبێلێ زانی؟ ژ هەردو گوهان، خودێ دبێژیت: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٧٨)﴾ [النحل].

# هەستەوەرا بێهنێ و پێکهاتا وێ

ژ وان نیعمەتێن خودێ کو مە ئاگەهـ ژێ نە نیعمەتا بێهنکرنێیە، و زانایان هەڤسەنگییەك یا د ناڤبەرا بێهنکرنێ و دیتنێدا داناى، و چاڤ چو نابیت ئەگەر چ ناڤبر نەبن، کو ئەو ژی رۆناهییە، بەلێ بێهنکرن پێدڤی ب ناڤبرێ نینە، چونکی مرۆڤ ب شەڤ و رۆژ بێهنکرنێ دکەت، چ د رۆناهییەکا توندا بیت یان د تارییاتییەکا توند، و بێهنکرن پێدڤی پەیوەندییەکا نێزیکا ئێکسەر نینە د ناڤبەرا تە و تشتیدا، هەروەکی د گوهلێبوونێدا هەی؛ لەوا دبێژن: بێهنکرن بازنەکا هێمن یا گەلەك بەرفرەهـ ددەتە تە، و تو یێ نفستی چێ دبیت بێهنا گازێ د مالدا بهەلکێشی، بێی دەنگ و بێی رۆناهی، و چو پەیوەندییێن ئێکسەر ژی نینن، تو یێ د ژۆرا نڤستنێڤە، و بوتلێ گازێ یێ د لێنانگەهێڤە، و دەرگەهـ د گرتینە، و تاریاتییەکا توندە، و دەنگ نینە، و پەیوەندییا ئێکسەر نینە، و د گەل ڤێ چەندێ تو بێهنکرنێ دکەی و دێ هشیار بی، و دێ چیی گازێ گری، ل ڤێرە بێهنکرن بازنەکا هێمن یا گەلەك بەرفرەهـ ددەتە تە.

کی باوەر دکەت بیست ملیۆن خانەیێن دەماری یێن د دفنا مرۆڤیدا هەین تایبەتن بۆ هەستپێکرنا بێهنێ، ئەڤ خانەیێن دەماری یێن تێکرا، و جهێ وان یێ د چاخێ سەری یێ دفنێ، ب رویبەرێ زێدەتر نینە ژ دو سەد و پێنجی ملیمەترێن دوجایی، ئەڤ خانەیێن دەماری کو بیست ملیۆنن، کولکە یێن هەین کێمتر نینن ژ حەفت کولکەیان، ڤان کولکەیان شلەکێ تیر یێ ل سەر و د ناڤدا کەرستێن دوهنی یێن حەلیایی یێن تێدا تێککارکرنەکا کیمیایی د گەل بێهنێ دکەن، و ژ ئەنجامێن ڤێ تێککارکرنێ شێوەکێ ئەندازەیی یێ جودا دورست دبیت، ل دویڤ سروشتێ بێهنێ.

بۆ نموونە بێهنا گولان شێوێ ئەندازەیی ژێ دورست دبیت ژ تێککارکرنا وێ د گەل کولکێن خانەیێن بێهنێ شێوێ کلیلێیە، و بێهنا (الأثیر) شێوێ لاکێشەیە، یان ل سەر

شێوێ برکا مەلەڤانیایە، و هۆسا هەر تێککارکرنەکا د ناڤبەرا بێهنێ و کولکەیێن بێهنێ یێن خودان تایبەتمەندییەکا حەلیایی هەین، کو تێککارکرنێ د گەل بێهنێ دکەت ب تێککارکرنەکا کیمیایی.

ئەڤ شێوێ ئەندازەیی دێ ئاماژەکێ ب رێکا دەمارەکا بێهنێ هنێریت کو یا دانایە ب بانێ دفنێڤە، بۆ مەلبەندێ بێهنێ د مێشکیدا.

مێشک دشێت جوداهییێ د ناڤبەرا دەه هزار بێهناندا بکەت، نە ب تنێ بۆ ڤاڤارتنێ بەلکو بۆ ڤاڤارتنێ و نیاسینێ، چونکی د مێشکیدا بیردانکا بێهنا یا هەی، و دەمێ بهێن کرە بێهنەکێ تێککارکرنێ د گەل کولکەیێن بێهنێ دکەت، و دێ شێوەکێ ئەندازەیی چێ کەن، دێ ئاماژەکێ بۆ مێشکی هنێریت، و د مێشکیدا جهێ دەه هزار بێهنان یێن تێدا و دێ د ناڤ هەمی بێهناندا بۆریت، ئێك ئێکە، هەتا ئەڤە د گەل جهێ بێهنا خۆ رێك دکەڤیت، دبێژیت: ئەڤە یاسمینە، یان فولە، یان زەنبەقە، و ئەڤ چەندە ب چاڤ هەلنانەکێ دورست دبیت.

یا خویایە ل دەڤ زانایان: (ڤێ کولکێ گەلەك تایبەتمەندی یێن هەین؛ کو ئەو دشێن هەستپێکرنێ بکەن ب تیژکرنەکا (ترکیز) گەلەك کێم، نیڤ ملیۆن ژ مللیگرامەکێ د سەنتیمەترەکا سێ جاریدا، ئەڤ کولکە هەست ب ڤان بێهنان دکەت و بۆ مێشکی ڤەدگوهێزیت، و وی جۆرێ بێهنێ دنیاسیت، و دێ بێژیت: بێهنا فلان تشتی یا دهێت).

و ژ بیر نەکەن کو ل دەڤ مرۆڤی رێکێن دی یێن هەین مرۆڤ یێ پێ ئاگەهدارە ل سەر دەوروبەرێن ژ دەرڤە، مرۆڤ ب چاڤان دبینیت، بەلێ هندەك تشتێن هەین مرۆڤ نابینیت، و تو یێ د خانیڤە، یان تو یێ د ترومبێلەکێدا تە های ژێ هەیە، گوهلێبوون هێلەکا دی یا بەرەڤانیێیە، بەلێ هندەك تشتێن هەین تو نابینی و تە گوه لێ نینە، بۆ نموونە: ئەگەر مشکەك د خانیڤە بمریت، چ هەست وەل تە دکەت ب هەبوونا وی؟ ئەو ژی بێهنا ویە، هەر وەکی خودێ بێهن کرییە هەستەك بۆ مرۆڤی ب هویربینییێن دەوروبەرێن ژ دەرڤە، ئەڤە ژ کەرەما خودێیە بۆ مرۆڤی.

سەد مليۆن خانە يێن هەين، و هەر خانەكێ حەفت كولكە يێن هەين، و ل سەر هەر كولكەكێ شلەكێ چر كو د ناڤدا كەرستێن دوهنى يێن حەليايى هەنە، تێككاركرنەكا كيميايى د گەل بێهنان دكەن، و ژ ڤێ تێككاركرنێ شێوەكێ ئەندازەيى دەردكەڤيت، دێ ئاماژەكێ هنێريت بۆ مێشكى، كو مێشك جوداييێ د ناڤبەرا دەه هزار بێهناندا دكەت، و دێ ئەڤ بێهنە د ناڤ هەمى بێهناندا چيت هەتا ئەڤ بێهنە دهێتە زانين، و دێ بێژين: ئەڤە فلان بێهنە.

و تيژييا بێهنێ نيف ژ مليۆنێ ژ ملليگرامێ ژ سەنتيمەترەكا سێ جايى بيت، ئەڤە تێرا هەيە مرۆڤ بێهنا وێ هەلكێشيت و بزانيت كا چ بێهنە.

د سەرێ سەيدا سەد مليۆن دويماهييێن دەمارى بۆ بێهنكرنێ يێن هەين، و هێزا بێهنكرنێ ل دەڤ هندەك گيانەوەران زێدەترە ژ مليۆن جاران ژ مرۆڤى.

مێيا بەلاتينكێ نێرى ب دويراتييا نيف ميلى دئينيت، ب رێكا بێهنكرنێ، و ب رێكا دەرئێخستنا هندەك بێهنێن كيميايى.

و مێشا هنگڤينى بێهن دكەتە ئاڤا گولان ژ دويراتييێن درێژ پتر ژ دەه كيلۆ مەتران، و بێهن دكەتە بێهنا خانەيا خۆ.

و پێشى بێهن دكەتە بێهنا خوها مرۆڤى ژ دويراتييا شێست كيلۆمەتران، و مەزناهى بۆ وى خودايێ ئەڤ هەستەوەرە دايە مرۆڤى، چەپەرەك و رێزگرتنەكە بۆ مرۆڤى.

# ناڤەندا تامێ د مێشکیدا

خودێ هۆسا ئەزمان چێ کرییە خانەیێن تایبەت ل سەر هەبن، و د بەلاڤ بن ل سەر شێوێ گوپکەیان، مرۆڤ د ماوێ وانڕا دشێت تام کەتە شرینی و خوارنا خۆش، و یێ تەعل و ترش ژ وی باڤێژیت، و ئاڤا شرین ڤەخۆت، و یا سویر باڤێژیت، کێ ئەڤ خانەیێن تامێ دانایینە سەر ئەزمانی؟ هندەك ژ خانەیان تام دکەنە شرینی، و هندەك تەعلی، و هندەك سویراتییێ، و هندەك ترشاتییێ، ئەڤ خانە د لێکڤەکرینە ل هەمی لایێن ئەزمانی، هندەك ژ وان یێ ل دەستپێکا ئەزمانی دا تامکەنە خوارنا شرین، و هندەك یێ ل دویماهییا ئەزمانی دا تام کەنە خوارنا تەعل، و هندەکێن دی یێ ل سەر رەخێن ئەزمانی دا تامکەنە خوارنا ترش و سویر.

و تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت هەستپێکرنا خانەیێن تامێ ئەوێن تایبەت ب خوارنا تەعلڤە دگەهنە دەه هزار جارکی ژ هەستپێکرنا خانەیێن تام دکەنە خوارنا شرین، بۆچی؟ چونکی خودێ ئەڤە هۆسا چێ کرییە کو هەر خوارنەکا ژەهراوی یا زیان بەخش یا تەعل بیت ـ ئەڤ رێککەڤتنە رێککەڤتنەکا زانایانەیە، ئەو خوارنا مفایێ تە تێدا بیت تاما وێ یا شرینە، و خوارنا زیانێ دگەهینیتە مە تاما وێ یا تەعلە، ژ بەر ڤێ چەندێ هەمی جۆرێن ژەهران تاما تەعل یا هەی، داکو مرۆڤ ژەهراوی نەبیت، هەستپێکرنا خانەیێن تایبەتمەند بۆ تاما تەعل، دەه هزار جارکی ژ هەستپێکرنا خانەیێن تایبەتمەند ب تاما شرین پترن.

تشتێ دووێ: تاما خوارنا ب ساناهی دچیتە خوارێ د گەریێدا رێك دکەڤیت د گەل مفایی، و تاما تەعل رێك دکەڤیت د گەل زیانێ، و ئەڤ رێککەڤتنە ژ حیکمەتا خودێیە، و ئەڤ تڤا د دەڤیدا ب شێوەکێ کاریگەر هاریکارییا حەلکرنا خوارنێ دکەت، ئەڤە رێڤەکرنەکە دا تامێ ژ وێ خوارنێ ببەین ژ لایێ گوپکەیێن تامێ ئەوێن ل سەر ئەزمانی.

تشتێ سێییێ: ئەو ژی دفن هەلێ یان گازێ ـ ئەگەر دەربرین یا دورست بیت ـ ئەوا بەربەلاڤ دبیت ژ ڤێ خوارنێ دا بێهن کەتێ، تاما خوارنا بنیاتێ وێ بێهن و تامە، هەر خوارنا ئەم دخۆین و خۆشییێ پێ دبەین و سوپاسییا خودێ ل سەر ڤێ خوارنێ دکەین، خانەیێن بهێنکرنێ دبنە هاریکار د چێکرنا وێدا د گەل خانێن تامێ، و دەمێ مرۆڤ تووشی پەرسیڤەکێ توند دبیت، دێ هەست کەت کو تاما خوارنێ یا جودایە د دەڤێ ویدا، ئەڤە ژ کەرەما خودێیە، و د مێشکیدا ناڤەندەکێ دی یێ هەی بۆ تامێ، دیسا ناڤەندەکێ هەی بۆ بێهنێ، و ناڤەندێ تامێ دشێت جوداهییێ د ناڤبەرا دەه هزار تاماندا بکەت، و ئەڤە د بێهنکرنێدا ژی روی ددەت، ئەڤ تامە دێ چیت بۆ مێشکی دێ هەست پێ کەت، پاشی دێ نیاسیت، و نیاسینا تامێ پشتی ئەو تام ل سەر دەه هزار تامان دبۆریت د بیردانکا تامێدا، ئەگەر ئەڤ تامە رێککەفت د گەل تاما تۆمارکری د بیردانکێدا، دێ بێژیت: ئەڤ تامە ئەڤەیە، و ڤێ خوارنێ فلان کەرستە یێ تێدا، و هتد...، خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات]،

# پشکا دەهێ

# دل و لۆلەیێن خوینێ

١- دل

٢- دل و تویرکێ تامۆر و تاییە تمەندییا مەهینێ د خوینێدا

٣- کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ د لەشیدا

٤- خوینبەر و خوینهێنەر

٥- پێکهاتێن خوینێ

# دل

هەمی کارێن پەرستنێ، و جوداهیا جۆرە و جۆری و شێوەیێن وان ئارمانجن بۆ پاقژکرنا دلی ژ نەخۆشییێن وی، و یێ خەملاندی ب وان تەکووزێن خودێ بۆ دلی هنارتی دا بەر ب بلندییێ بچیت بۆ ئافرێنەرێ وی، و دا یێ بەختەوەر بیت ب نێزیکییا وی، و خۆشییا ب بەحەشتا وی ببەت.

دل جهێ ئێکەمە د لەشێ مرۆڤیدا، و ئەوە جهێ بڕیارێ د هەمی تشتاندا، و نەتشتەکێ حێبەتییە ئەگەر سەرکردە بیت، و ئەندامێن دی سەرباز و خزمەتچییێن وی بن، و ئەوە یێ بڕیاردەر و دانەپاشییێیە، و ئەندام دویکەفتی و خولامن بۆ وی، و رێزبەندی و هژماراتە یا د گۆتنا خودێدا: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ (٣٧)﴾ [ق]، (ئانکو، ب راستی ئەڤە (د هیلاکبرنا گوندێت ستەمکاردا) چامە و دەرسن بۆ وی یێ خودان عەقل، بۆ وی یێ گوهدارییێ دکەت و هشێت وی د سەرێ وی).

و دل راستییا مرۆڤییە، و ژ حێبەتییێن خودێ د ڤی دلیدا ئەوە مانا دلی و ساخلەمییا وی د لەشیدا و رێکخستنا کارێ وی یا گرێدایە ب ژین و چالاکییا لەشیڤە، و پاقژییا دلێ نەفسێ و تەناهییا وی کرییە ژیانا روحی و وەرارا وێ.

و دل لایەنێ تێگەهشتنێیە ژ مرۆڤی، کو دل ئاخفتنکەرە، و داخوازکەرە، و گازندەکەرە، و جهێ زانستییە، و تەقوا و وەفاداری، و بیرئینان، و ڤیان، و نەڤیان، و وەسواس، و مەترسییان، و دل جهێ باوەرییێیە، و گاورییێ، و ل خۆزڤرینێ، و رك ل سەر گرتنێ، و تەنایی، و تێکچۆنێ.

و دل يێ زانايه ب خودێ، و نێزيككەره بۆ خودێ، و يێ پەسەندە ل دەڤ خودێ، بەلێ دەمێ رادەستى ژ بلى خودێ بوو، ئەو دل دێ يێ پەردەپۆش بيت ژ خودێ، دەمێ مژويلى ژ بلى خودێ بوو، و دل دێ يێ شاد بيت ب نێزيكييا خودێ، و خراب و پيس دبيت دەمێ ژ خودێ دوير دكەڤيت، و يا هاتييە ڤەگوهاستن: ((عبدي طهَّرتَ منظرَ الخَلقِ سنين، أفلا طهَّرتَ منظرِي ساعةً)) (ئانكو، ئەى بەندەيێ من تە ب سالان سەر و سيمايێ خۆ پاقژ و ب سەروبەر كر، هەما سەعەتەكێ ژى جهێ بەرێخۆدانا من پاقژ و ب سەروبەركە). و دل جهێ بەرێخۆدانا خودێيە، و مرۆڤ سەرفەراز نابيت، و باش نابيت ئەگەر دل يێ پاقژ نەبيت، و دێ يێ زيانكار و پيس بيت ئەگەر ب گونەهان كێم كر و شكاند.

ئەگەر تو سەحكەيە حێبەترين چێكرييێن خودێ د عەرد و عەسماناندا تو نابينى ژ حێبەتيترين و جوانترين و هويربينترين تشت ژ دلێ مرۆڤى.

و ئەگەر باشى تێدا بيت دێ دلۆڤانى و ڤيان و رامانێن جوان و نەرم و هەستێن نازك ژێ دەركەڤن، هەتا ژ بلندى و رێزا ملياكەتان دبۆريت.

و ئەگەر دل خراب بوو، دێ رەقاتى و قەلسى ل سەر هێنە نژاندن، و پيسى هەتا دگەهيتە نزمترين پەيسك و جه، و دێ ل سەر هويركێ تەپا جيهانێ خرڤەبيت، چ يێن هوير و بچويك و يێن مەزن بن، مەزن دبيت و مەزنييا وى نابينيت، و هەر تشتەكێ مەزن ل هەمبەر وى كێم و بچويك دبيت، و بچويك دبيت بەلێ بچويكيا وى نابينيت، ل ڤێرە دێ هەر تشتەكێ بچويك ل سەر مەزن بيت.

وێنە و شێوازێ دلى ئێكە، بەلێ رامان و مەرەمێن وى د جودانە، چونكى دلەكێ هەى وەكى (گەوهەرێ)يە، و رەنگێ وى يێ پاقژ و زەلالە، و دلەكى دى وەكى بەرى يێ ب هێز و موكومە، مفاى ددەت، بەلێ رەنگ و دەنگ ناڤەدەت، و دلەكێ دى وەكى هەوايە، كێشا وى يا سڤكە، و رەنگێ وى يێ هاتييە گوهۆرين، دل دمريت پاشى ساخ دبيت، پاشى دمريت، و دگەهيتە بلندترين ئاست، و دهێتە خوار بۆ نزمترين ئاست، و ئەو دێ گەهيتە بلنداهييا ستێران ئەگەر تێكەلى پەرستنێ بۆ خۆ كرە رێك، ئەرێ ما ئاڤاكەرێن

جیهانێ ب مەزناتییا دلێن وان ناهێنە سالۆخەتکرن، و راستییا هەستێ وان، و هێزا شیانا وان، و ئەگەر مرۆڤی هەمی تشت هەبن، و دل ژ دەست دا هەر وەکی وی چو تشت نەی.

دلێ لەشی حێبەتترین تشتە خودێ چێ کری، ئەو وەکی ماتۆرەکا ئاڤێ یا جۆتانییە خوینێ ژ خوارنێ و وزێ دهەلگریت بۆ هەمی خانە، و شانە، و ئەندامان، ب رێکا تۆرەکا لۆلەیێن خوینێ کو درێژاهییا وان ژ سەد و پێنجی کیلۆمەتران پترە.

دل د هەیڤا دووێدا کار دکەت ژ ژیانا زارۆکێ د زکێ دایکێدا و هەتا مرنێ کار دکەت، کو غافل نابیت، و پیچەك ژی نافەمینیت، و ژ بیر ناکەت، و سەهوە ناکەت، و نارووینیت، و ناهێتە گرتن، و بێزار نابیت، و گازندان ناکەت، کار دکەت بێی راوەستان، و بێی زڤرین، و بێی سەخبێریکرن، و بێی ئاراستەکرن...

و مرۆڤ ب مەزناتییا خۆ زیانێ دگەهینیتە دلێ خۆ، و ب ئاگرێ نەڤیانێ داخ دکەت، و ب خەمان نەخۆشییێ دگەهنیتێ، و ئەو بنیاتێ ژیانا مرۆڤییە، و رۆژا جیهانا وییە، و بۆ هەمی کاروبارێن خۆ پشت بەستنا خۆ ددەتە سەر، و هەمی هێزا وی ژێ دەردکەڤیت، و بزاڤێن وی، و ئەو ئەندامەکێ گەلەکێ حێبەتییە!.. و وەستیانێ نوزانیت کو بۆ خۆ بکەتە رێك، هێزا وی گەلەگ جارکی زێدە دبیت، داکو هەمبەر کارکرنا تەنگاڤییان بیت، و ئەو ماسۆلکەکە ژ مژدارترین ماسۆلکان، ژ لایێ چێکرن و کارکرنێ و جهێنانێ، و ژ موکمترین و هێزاترینانە، د هەر خۆلەکەکێدا هەشتێ جاران تێك دچیت و ڤەدبیت، و د کاودانێن نەخۆش و بەرتەنگدا لێدانێن وی دگەهیتە سەد و هەشتێیان، و د رۆژەکێدا هەشت هزار لیترێن خوینێ دهاڤێژیت، ئانکو دبیتە هەشت مەترێن سێ جایی ژ خوینێ، و دل ب درێژاهییا ژییەکێ ناڤنجی یێ مرۆڤی تێرا تژیکرنا مەزنترین ئاڤاهییێن جیهانێ ژ خوینێ دکەت.

و دل ب تنێ یێ جودایە ژ کۆئەندامێ دەماری، کو لێدانێن وی و رێکخستنێن وی ب ئاماژا کارەباییە ژ ناڤەندا دانا خۆیەتی کو ئەڤە بنیاتێ نەخشێ وییە و ماسۆلکا دلی ب رێکەکا ئێکانە خوارنێ دخۆت!! و ژ حێبەتترین وان تشتێن تێدا دەرپۆشکێن وی یێن

بنەجھ کو دھێلن خوین د ئێك ئاراستەڕا بچیت، و ئەڤە تشتەکێ جێهگرە د هاڤێتناندا (المضخات).

ئەگەر دل د جهێ خۆدا راوەستا، و بێهنا خۆ ژ کارکرنێ ڤەدا، دێ کەلەخەکێ ڤەمری و بێ ژیان ل دویڤ خۆ هێلیت، دێ وەکی قورمێ دارقەسپا خلۆلە لێ هێت، و چو ژیان ژ وی ناهێتە دیتن، و پێغەمبەر ﷺ راستگۆیێ راستی بێژانە ب کورتی ل سەر دلی دبێژیت: "ألاَ وَإِنَّ فِي الجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألاَ وَهِيَ القَلْبُ"[1]، (ئانکو، بزانن پارچە گۆشتەك یێ د لەشیدا هەی، دەمێ ئەو پارچە یا باش بیت، لەش هەمی دێ یێ باش بیت، و دەمێ خراب بوو، لەش هەمی دێ خراب بیت، بزانن ئەو ژی دلە).

و دلۆڤانییا خودێ ل ئەحمەد شەوقییێ هۆزانڤان بن دەمێ دبێژیت:

دقاتُ قلبِ المَرْءِ قائلةٌ لَهُ إِنَّ الحَيَاةَ دقائقٌ وَثوَانِ

فارْفعْ لِنَفْسِكَ قَبْلَ موتكَ ذِكْرَها فالذكْرُ للانسان عمرٌ ثانِ

(١) بوخاری (٥٢)، موسلم (١٥٩٩)، ئیبن ماجە (٣٩٨٤)، ژ زار نوعمانێ کورێ بەشیری.

# دل و تویرکیێ تامۆر و تاییەتمەندییا مەهینیێ د خوینێدا

ئەو دلێ د ناڤ رەخێن مەدا ژ حێبەتیێن چێکرییێن خودێنە، زانا دەربارەی دلی دبێژن: دل ژ هێزترینێ ماسۆلکانە، و موکومترین ماسۆلکەیە د مرۆڤیدا.
ئەڤ دلە زانا ناڤ لێ نا ب ماتۆرا هاڤێتنێ، و ئامویرێ لێدانا دوکما، زڤرۆکا خوینێ دابین دکەت د ئەندامانداا، هەر ژ دەست ب لێدانێ کری و تو د رەحمیدا، و هەتا مرنێ، بێی وەستیان، و بێزار نابیت، و بێن نادەت، و نا راوەستیت هەتا دویماهییا ژیانێ.
ژ نیشانێن خودێ یێن جهێ داخباربوونێ، ئەوە خودێ تویرکەکێ پێڤە گرێدای بۆ دلی چێ کرییە ئەو ژی پەردا دلییە، و یا پەردەپۆش کرییە ب پەردەکێ دی دبێژنێ: تامۆر، ئەڤ تویرکە کەرستەکێ دەردکەت بزاڤا وی نەرم دکەت، دا دل ب ڤی تویرکی ب خۆ نەکەڤیت، ئەڤە ب هەمیڤە وەکی زەیتێیە د ئامویراندا، و زێدەباری ڤێ چەندێ دل یێ پەردە کرییە ب پەردەکا گەلەك تەنك، حولی، دبێژنێ پەردا دلی، ئەڤ پەردە گەلەك یا تەنك، گەلەك حولی، د گەل تامۆری کو ئەڤە کەرستەکێ نەرمکرنێ بەرددەت، یا هاتییە چێکرن دا تێکهسوین د بزاڤا دلیدا چێ نەبیت.
و ژ نیشانێن حێبەتی ئەوە د ناڤ خوینێدا تاییەتمەندییەکا هەی، ئەگەر ئەڤ تاییەتمەندییە نەبا کەس ژ مە نەدما ساخ، ئەو ژی تاییەتمەندییا مەهینێیە، ئەو ژی دەمێ خوین دهێتە هوساندن ب هەوایێ ژ دەرڤە رویشال د خوینێدا دورست دبن، کونێن خوینبەران بۆ ژ دەرڤەی لەشی دگریت، ئەگەر ئەڤ تاییەتمەندییە نەبا، تاییەتمەندییا مەهینێ دا خوینا مرۆڤی هەمی چیت، ب برینەکا سڤك، بەلێ دەمێ خوین ب هەوایێ ژ دەرڤە دکەڤیت دمەهیت، و دێ بیتە رویشالە و ئەو کونا هاتییە ڤەکرن دێ گریت، ئەگەر برینەك بیت، یان تشتەکێ وەکی وێ، ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (٩٦)﴾ [الأنعام]، (ئانکو، ئەڤێت هەنێ ژ دانانا خودایێ سەردەست و پڕ زانایە).

دل کار دکەت و بێهن نادەت، خوینا خوینهێنەری درژیتێ ئەو خوینا ب خۆلەکا خوینێ رابوویی د ئەندامانداد گوهۆکێ راستێدا[١]، ژ ڤێرە بۆ زکۆکێ راستێ[٢]،.و ژ ڤێرە ژی بۆ هەردو گورچیسکان، و پشتی ئۆکسجین وەرگرتی دێ زڤریتە گوهۆکێ چەپێ، و ژ زکۆکێ چەپێ کو د ماوێ خوینبەرا ئورتادا[٣] خوینێ بۆ هەمی ئەندامێن لەشی دبەت، چونکی د دلیدا دو گوهۆك و دو زکۆك یێن تێدا هەین خوینێ دمێژن، و پالددەن بێی وەستیان و بێزاری.

زانایان تەخمین کر کو دل د هەر لێدانەکێدا کۆمەکا سەنتیمەترێن سێ جایی خوینێ دهاڤێت، زێدەتر ژ دەهان د خۆلەکەکێدا، هەشتێ لێدانان د هەر خۆلەکەکێدا، ئانکو د خۆلەکەکێدا دو گالۆن و نیڤێن خوینێ دهاڤێژیت، هندەك ژ وان ئەڤ چەندە دەرئێخست بۆ وی مرۆڤێ حەفتێ سالان عومری دبەت دلێ وی د ماوێ ڤی عومری هەمییێدا چار ملیۆن گالۆنێن خوینێ دهاڤێژیت، و ئەڤە تشتەکێ حێبەتییە د ڤێ ماسۆلکێدا (دل).

ژ بەر ڤێ چەندێ دل ژ نیشانێن خودێیە د ئافراندییێن ویدا، ئەوا پێغەمبەری ﷺ دەربارەی دلی گۆتی: "أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ"[٤].

---

(١) دکەڤیتە پشکا سەری ژ دلی، و دو گوهۆکن (گوهۆکێ چەپێ و گوهۆکێ راستێ). وەرگێر.

(٢) دکەڤیتە ژێرییا دلی، دو زکۆکن (زکۆکێ چەپێ و زکۆکێ راستێ). وەرگێر.

(٣) مەزنترین خوینبەرە د لەشێ مرۆڤیدا، خوینا ب ئۆکسجینڤە ژ زکۆکێ چەپێ یێ دلی بۆ هەمی لەشی دبەت د ماوێ زڤرۆکا خوینێ یا مەزندا، و دزڤریتەڤە بۆ گوهۆکێ راستێ یێ دلی. وەرگێر.

(٤) بوخاری (٥٢)، موسلم (١٥٩٩)، ئیبن ماجە (٣٩٨٤)، ژ زار نوعمانێ کورێ بەشیری.

# كۆئەندامێ زڤرۆكا خوينێ د لەشيدا

نيشانێن خودێ د گەردوونيدا، و نيشانێن خودێ د نەفسا مرۆڤيدا، بەرفرەهترين دەرگەهە ئەم بچينە د ناڤدا پێ بگەهينە خودێ، و كورتترين رێكە بۆ خودێ، چونكى ئەڤ نيشانە دێ تە دانن بەرامبەر مەزناهييا خودێ، خودێ دبێژيت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات].

ژ نيشانێن بەلگە ل سەر مەزناهييا خودێ سيستەمێ ڤەگوهاستنا خوينێيە د لەشيدا، ژ بەر كو زيندەوەر پێدڤى ب خوارنێنە ژ بەر چالاكييێن وان زيندەيى، و ژ بەر سەخبێركرن و چێكرنا خانەيێن وى يێن پويچ بوويى، و ڤەگوهاستنا خوارنێ ژ دەرڤەى زيندەوەرى بۆ ناڤخۆيا وى كۆئەندامێ هەرسكرنێ پێ رادبيت، بەلێ ڤەگوهاستنا ئەو كارێ كۆئەندامێ هەرسكرنێ كرى د خوارنێدا بۆ هەمى خانەيێن لەشى ئەڤە ژ كارێن كۆئەندامێ زڤرۆكا خوينێيە.

د زيندەوەرێن پێشكەڤتى يێن مژدار ب مژدارەكا ئيعجازى، و نەخاسمە مرۆڤ، ئەڤ ڤەگوهاستنە د بازنەكێ گرتيدا دورست دبيت، چونكى كۆئەندامێ زڤرۆكا خوينێ بازنەكێ گرتييە، و ژ بەر كو دا خوين د لۆلەياندا بچيت، پێدڤييە ماتۆرەك هەبيت خوينێ پالدەتە د ڤان لۆلەياندا، و پێدڤييە ڤى ماتۆرى پالدانەك و كێشانەك هەبيت، ئانكو برن و ئينان.

كۆئەندامێ زڤرۆكا خوينێ پێك دهێت ژ خوينبەران، خوينبەرێن بچويكتر و لۆلەيان، و لۆلەيێن بچويكتر، و مولۆلە، و مولۆلەيێن گەلەك هوير، هەمى روبەرێ لەشى دگرن، پاشى ئەڤ مولۆلەيێن گەلەك هوير گرێداينە ب مولۆلەيێن خوينهێنەرڤە، و دزڤرن بۆ خوينهێنەرەكا بچويك پاشى بەر بەرە مەزن دبيت بۆ دلى.

تشتێ سەرنجا مرۆڤی دکێشیت هژمارا مولۆلەیان د لەشیدا ژ سەدێ بۆ سەد و شێست ملیار مولۆلەنە، ژ بەر کو د هەر جهەکێ لەشیدا ئەگەر مرۆڤ دەمبوسەکێ لێ بدەت دێ خوین دەرکەڤیت، و درێژاهییا ڤان لولەیان د لەشێ مرۆڤیدا سەد و پێنجی کیلۆمەترە، و خوین د ماوێ ڤاندا دچیت ژ حەفت هەتا دەھ لیتران، و تەپکا سۆرا خوینێ ئەگەر ئەم دویڤ بچین ژ دلی دەردکەڤیت، و د بیست و سێ چرکاندا دزڤریتەڤە دلی، و خوین د لولەیاندا د ماوێ ئێك رۆژدا سێ هزار و حەفت سەد جاران دزڤریت، ئەگەر ڤان لولەیان چۆنا زۆر و دەرکەڤتن هەبان دا د رۆژێدا حەفت هەتا دەھ تونان تێرا چن، دل د رۆژێدا هەشت مەترێن سێ جایی دهاڤێت، و هەر مەترەکا سێ جایی نێزیکی تونەکێیە.

د ماوێ ژییەکیدا سەد و پێنجی هەتا دو سەد و پێنجی هزار تون د لۆلەیاندا دچن، ئەگەر دل ماتۆربا و کونەکا چۆنا زۆر و ژ دەرڤە هەبا دا مەزنترین ئاڤاهییێن جیهانێ پرکەت د ژییێ شێست سالییێدا!! و ئەگەر ئەم بەحسێ شیانا دلی بکەین شیانا دلی د مرۆڤیدا تێرا هندێ هەیە بۆ پالدانا شەمەندەفرەکێ د رێکەکا ژێهەلی بۆ سەری ب دویراتییا چار هزار و هەشت سەد مەتران، ژ سفرێ بۆ چار هزار و هەشت سەد مەتران!! خودێ دبێژیت: (هَٰذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ (١١)) [لقمان]، (ئانکو، ئەڤەیە دان و چێکرنا خودێ، ڤێجا بێژنە من ئەڤێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، چ داییە و چ چێ کرییە؟ (نەخێر وان چو نەداییە و چو چێ نەکرینە) بەلێ ستەمکار یێت د گۆمڕاییەکا ئاشکەرادا).

و د فەرموودێدا: ((ألا وإنَّ في الجَسَدِ مُضغَةً إذا صَلَحَت صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وإذا فَسَدَت فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وَهِيَ القَلبُ)).

ئەڤە هندەك راستییێن رۆهن و دیار بوون ژ کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ د لەشێ مرۆڤیدا.

# خوینبەر و خوینهێنەر

خوینهێنەر و خوینبەر یێن د مرۆڤیدا هەین، د خوینبەرێدا ئۆکسجینا هەلگرتی یا د ناڤ خوینێدا، و خوینبەر دابەش دبیت، و چەق و تا ژێ دچن، هەتا دگەهیتە بچویکترین خانە د لەشیدا دا خوارنێ بۆ دابین بکەت، و خوینێ گەلەك پێدڤی و بەردەوامی ب ئۆکسجینی یا هەی؛ ژ بەر ڤێ چەندێ خوینهێنەر خوینێ دبەن بۆ دلی، دا بۆ هەردو سیهان ببەت دا ئۆکسجینی ژ سیهان وەرگریت.

خوینا خوینبەری د چۆنا خۆدا ژ پێی بۆ دلی، پێچەوانێ ئاراستێ راکێشانا ئەردی دچیت، شلە بۆ سەری ناچیت، ژ بەر ڤێ چەندێ دڤێت رێکەك هەبیت، چونکی ئەڤ خوینا بەرەف سەریڤە دچیت بۆ حیکمەتەکا هویربینە خودێ هۆسا ڤیایە کو نەهێتە خوار، و ژ بۆ چێکرنەکا بنەجە و زانایانە خودێ چێ کرییە، بۆ ڤان خوینهێنەران ئەڤێن خوینێ ژ پێی بۆ دلی دبەن ئەزمانك یێن هەی، ئەڤە د راستیدا گرێکن، رێکێ ددەنە خوینێ بەرەف سەری بچیت، و ناهێلن بهێتە خوارێ، گرێك یێن ل سەر دیوارێن لۆلەیێن خوینێ، دەمێ خوین بەرەڤ سەریڤە دچیت، دێ دیوارێن وێ ب دیوارێن لۆلەیێن خوینێڤە نویسن، و دێ خوین چیت، و دەمێ خوینێ ڤیا بەرەف خوارێ بهێت، دێ ئەڤ گرێکە پڕ بن، و دێ پف بن، و دێ پێکڤە نویسن هەتا رێك ل خوینێ بهێتە گرتن کو بهێتە خوار، ئەڤ ئەزمانکێن خودێ دانایینە د ڤان خوینهێنەراندا، چ حیکمەت بۆ هەیە؟ حیکمەتا وێ ئەوە کو رێکێ بدەتە خوینێ بەرەف ئاراستەکێ ب تنێ بچیت، بێی زڤرین.

ئەگەر تێکچۆن د ڤان ئەزمانکاندا چێ بوو و رێك ل خوینێ نەهاتە گرتن، دێ خوین د خوینهێنەراندا کۆم بیت، و دێ فشارا خوینێ تێدا بلند بیت، و دێ تەپکێن سۆرێن خوینێ ژ دیوارێن خوینهێنەران دەرکەڤن بۆ شانان، و دێ پێ شین بن و وەرمن، و دێ

**مرۆڤ هەست ب ئێشانەکا توند کەت، کو ئەو ژی نەخۆشییا (دەوالی)یە[1]، کارێ گرێیان، کارەکێ گەلەك هویربین و جوانە.**

**(لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤)) [التين]، (ئانکو، ب راستی مە مرۆڤ ل سەر باشترین رەنگ و وێنە دورست کرینە و چێ کرینە).**

---

**(١) بەری نوکە یا هاتییە رۆهنکرن.**

# پێكهاتێن خوینێ

خوینا مرۆڤی ب بۆچۆنا زانایێن تایبەتمەند وەكی دەریایەكا پڕ و پێل بلندە ب بڕینا گەشتیگەلەكێ، هندەك گەشتی یێن هەین بۆ هاریكارییێ، و هندەك گەشتی بۆ بەرەڤانییێ كو شیانێن هەین ل سەر راهێنانان، و چەپ و چیر لێدانێ، و چۆنا د ناڤدا، كو ئەو ژی تەپكێن سپی یێن خوینێنە، و هندەك گەشتی یێن هەین بۆ رزگاركرنێ ژ مرنا دورست، ئەو ژی پەرڕكێن خوینێنە، و هندەك گەشتی كەرستێن خوارنێ دهەلگرن، و شەكرێ، و هندەك گەشتی كەرستێن هاتینە سەخبێركرن دهەلگرن، پرۆتین، و هندەك گەشتی پیساتییان دهەلگرن، و ترشێ یوریا، و ترشێ لاكتیك، ئەڤ هەمی گەشتییە بزاڤێ دكەن ب ئازادی بێی ڤێككەڤتن، و بێی خەندقین، و بێی تووشی پویچبوونێ ببن.

ئەڤ شلەیێ سۆر (خوین) كو شەنگستێ ژیانا مەیە ژ تەپكێن سۆرێن خوینێ و تەپكێن سپی یێن خوینێ پێك دهێت، و پەرڕكێن خوینێ، و دێ كێمەكێ ل سەر تەپكێن سۆرێن خوینێ راوەستین، تەپكا سۆرا خوینێ خانەیە، دویراتییێن وێ هویربینن، و تیرا وێ حەڤت میكرونە، و ئەگەر ئەم مللیمەترێ بكەینە هزار پشك، ژ بەر كو تیرا ڤێ تەپكێ وەكی شێوێ نانییە حەڤت میكرونە، ئانكو حەڤت پشك ژ هزار ژ مللیمەترێ، و ستویراتییا وێ ژ دو میكرونان نابۆریت، كو ئەڤە دبنە دو پشك ژ هزار ژ مللیمەترێ.

و پسیارا نوكە: هژمارا ڤان تەپكان د لەشێ مرۆڤیدا چەندە؟ هژمارا وان یا تەخمینكری و نێزیككری بیست و پێنج تریلیۆنن، ئانكو بیست و پێنج هزار هزار ملیۆن تەپكێن سۆرێن خوینێنە، و ئەگەر ئەم ڤان تەپكێن د ناڤ خوینا هەر ئێك ژ مەدا دانینە ب رەخ ئێكڤە دێ حەڤت جاركی ل دۆر عەردی زڤریت د هێلا كەمەری یا عەردیدا؛ چونكی د هەر مللیمەترەكا سێ جاریدا پێنج ملیۆن تەپكێن خوینێ یێن هەین، و تشتێ سەرنجا

مرۆڤی رادکێشیت ئەوە هندەك مولۆلەیێن خوینێ یێن هەین تیرا وان ناگەهیتە تیرا تەپکا سۆرا خوینێ، ژ بەر ڤێ چەندێ تەپکێن سۆرێن خوینێ نەچار دبن د ڤان لولەیاندا ئێك ل دویڤ ئێکێ بچن د ئێك ریزدا، و ژ ڤێ سەیرتر هندەك لولەیێن خوینێ یێن گەلەك هویر تیرا وان تەنگترە ژ تیرا تەپکا سۆر، پا چاوا ئەڤ تەپکە دشێت د ڤان لولەیانرا بچیت؟ ئەڤ تەپکا سۆر درێژ دبیت کو شێوەکێ وەکی هێکێ وەردگریت ژ پێخەمەت دا د ڤێ لولەیا گەلەك هویررا بچیت.

خودێ دبێژیت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣)) [فصلت].

و د لەشێ مرۆڤیدا بیست و پێنج هزار ملیۆن تەپکێن سپی یێن خوینێ هەنە، ڤێ تەپکێ هندەك تایبەتمەندی یێن هەین عەقل باوەر ناکەت، چونکی د شیانێن واندایە د جهەکێ گەلەکێ تەنگرا بچن کو ئەڤ تەپکە دەه جارکی ژ ڤی جهی مەزنترە، و مەژییێ هەستییان د هەر چرکەکێدا دو ملیۆن و نیڤ تەپکا چێ دکەت، و د هەر چرکەکێدا وەکی ڤێ ژمارێ دمرن ژی، و دەمێ ئەڤ تەپکە دمرن دێ بەرەڤ گۆرستانەکا کۆمەل چن کو ناڤێ ڤێ گۆرستانێ (خالخالکە).

و تەپکێن سپی وەکی لەشکەرەکێ بەرڤانییێنە، و نەخۆشییا ئایدزێ کو ئەو کوشتنا ڤان تەپکێن سپینە، و ب ئەگەرێ وێ مرۆڤ دێ مریت ژ کێمترین تووشبوونا میکرۆبی، و کۆئەندامێ بەرڤانییێ وەکی لەشکەرەکییە ب هەمی رامانێن خۆڤە.

پشکەك سەحکرنێ دکەت؛ سەحکرنا دژمنی، و چەکێن وی، و تایبەتمەندییێن وی.

و پشکەك چەکی چێ دکەت، و پشکەك شەڕی دکەت.

سێ توخمن: رەگەزێ سەحکرنێ - سیخوڕی - و رەگەزەك چەکی چێ دکەت، و رەگەزەك بەرسینگگرتنا دژمنی دکەت، ئەڤ کۆئەندامێ بەرگرییێ، بیست و پێنج هزار ملیۆن تەپکێن سپی، و بیست و پێنج ترلیۆن تەپکێن سۆر، و ترلیۆنەکا پەڕکێن خوینێنە، ئەڤ پەڕکە ئەگەر نەبان دا خوینا مرۆڤی بەربیت ژ برینەکا سادە، دەمێ برینەك چێ دبیت ئەڤ پەڕکە بەرەڤ جهێ برینێ دچن دا بگەهیننە ئێك، و ڤێ برینێ دگرن.

تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە د خوینێدا کەرستەك یێ هەی، ئەڤ کەرستە هاریکارە بۆ چڕاتییا خوینێ، و ئەگەر ئەڤ کەرستە نەبا دا هزار سەنتیمەترێن سێ جایی یێن خوینێ د ماوێ شەش خولەکان ژ مرۆڤی دەرکەڤن، ژ بەر ڤی کەرستەی ئەڤ چەندییا خوینێ نادەرکەڤیت ب تنێ د سیە خۆلەکاندا نەبیت، چونکی چڕاتی تشتەکێ سەرەکییە د خوینێدا.

و دخوینێدا توخمێن هەین خوینێ دمەهینن، و توخمێن هەین دحەلینن، و ژ هەڤسەنگییا ڤان هەردو توخمان خوین دمینیت ب ڤی شێوێ حێبەتی، ئانکو نە گەلەکێ رۆنە دەمێ کو خوین ژ مرۆڤی دهێت هەمی د دەمەکێ کێمدا بچیت و بمریت، و نە ژی یێ چڕە وەکی تەڤنێ بیت د خوینبەراندا، و دانانەکا گەلەکا هویربینە د ناڤبەرا چڕاتی و رۆنییێدا.

ڤەکۆلینا خوینێ ب تنێ مەزنترین نیشانەکا بەلگەیە ل سەر مەزناهییا خودێ، پلازمایا خوینێ، پێکهاتێن پلازمایێ، تەپکێن سۆر، و تەپکێن سپی، و پەرکێن خوینێ، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)﴾ [الذاريات].

# پشکا یازدێ

## رژێن

١- رژێنا ژێر مەژی
٢- رژێنا کازی
٣- سایموسە رژێن
٤- پەنکریاس و نەخۆشییا شەکرێ
٥- خالخالك



# رژێنا ژێر مەژی

د مێشکێ مرۆڤیدا رژێنەك یا هەی کێشا وێ نیڤ گرامە، ئەڤ رژێنە ب هندەك کارێن گەلەك گرنگ و مەترسی رادبیت، و ئەڤ رژێنە یا گرێدایە ب لەشیڤە ل ژێر لاندکا دیتنێ ب سەد و پێنجی هزار دەماران، ئەڤ رژێنە هۆرموونێ گەشەکرنێ دەردکەت، ئەڤ هۆرموونە پێك دهێت ژ سەد و هەشتێ و هەشت ترشێن ئەمینی، و پێدڤییە د هەر لیترەکا خوینێدا دەھ میکرۆگرام ژ ڤی هۆرموونی تێدا بن، و ئەگەر ئەڤ رێژە کێم بوو مرۆڤ دێ بیتە قەزەمك، و ئەگەر ئەڤ رێژە زێدەبوو دێ مرۆڤ ژ درێژییا سروشتی بۆریت، کێ ئەڤ رێژە ب ڤی شێوەی دانایە؟ ئەو ژی ئەڤ هۆرموونەیە، هۆرموونێ گەشەکرنێ کو پێك دهێت ژ سەد و هەشتێ و هەشت ترشێن ئەمینی.

هۆرموونەکێ دی یێ هەی ئەڤ رژێنا ژێر مەژی دەردکەت ئەو ژی هۆرموونێ بەردانا شیرییە، چونکی پیچەك پشتی دوگیانییێ ئەڤ هۆرموونە دەست پێ دکەت د ناڤ خوینێدا دگەریت، هەتا دگەهیتە دەمێ پشتی بوونێ، دێ شیر ژ سینگێ ژنێ هێت، چێکرنا کێیە؟ خودێ (جل جلاله) ڤێ راستییێ دوپات دکەت، دەمێ دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ (٩) وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ (١٠)) [البلد]، (ئانکو، ما مە رِوی و چاڤ نەدایینێ. و ما مە ئەزمانەك و دو لێڤ نەدایینێ. و ما مە هەردو رِێك (یا قەنج و یا خراب) بۆ ئاشکەرا نەکرینە و نیشا نەداینە)، هندەك راڤەکەر دبێژن[1]: (((النَّجْدَيْنِ) ئانکو: هەردو لایێن سینگێ ژنێ)).

---

(١) ئەڤە گۆتنا ئیبن عەباسییە، تەبەری یا د تەفسیرا خۆدا (٢٠١/٣٠) ڤەگوهاستی، و ئیبن کەسیر د تەفسیرا خۆدا (٥١٣/٤).

هۆرموونەکێ دی یێ هەی ئاماژێ ددەتە رژێنا ژێر مەژی کو هۆرموونەکێ دەربکەت دەربرینا خوراکی (گوهۆرینا خوارنێ بۆ وزێ) دابین بکەت د لەشیدا، و دەربرینا خوراکی کریارەکا گەلەکا مژدارە دەمێ خوارن دبیتە وزە، و رژێنا پەریزادێ بەرپرسە ژ ڤێ دەربرینا خوراکی، دیسا رژێنا ژێر مەژی بەرپرسە ژ ئاراستەکرنا رژێنا پەریزادێ ژ بۆ دەرهاڤێژتنا ڤی هۆرموونی، و ئەڤ رژێنا ژێر مەژی کێشا وێ ژ نیڤ گرامێ نابۆریت.

و هۆرموونەکێ دی یێ هەی رژێنا ئەدرینالی ئاگەهدار دکەت دەمێ مرۆڤ تووشی مەترسییەکێ دبیت، دێ فەرمانێ ل ئەدرینالی کەت کو هۆرموونەکی بەردەت لێدانێن دلی زێدە دکەت، و هۆرموونەك هاندانا هەردو سیهان دکەت رویبەرێ خۆ زێدە کەت، و هۆشدارییێ ل لۆلەیێن خوینێ دکەت کو تەنگ ببن دا خوین بۆ ماسۆلکان مشە ببیت، و فەرمانا مێلاکێ دکەت دا چەندەکا شەکرێ بەردەت، ئەڤە چار فەرمانن کو رژێنا ئەدرینالی بەرددەت ب فەرمانا رژێنا ژێر مەژی.

و هۆرموونێ گەشەبوونا جنسی بەرپرسییا وی رژێنا ژێر مەژییە د مێشکیدا، و سالۆخەتێن هەر ئێك ژ نێر و مێیان کارێ وی هۆرموونییە ئەوێ رژێنا ژێر مەژی بەرددەت.

و هۆرموونێ خانەیێن د بن پیستیدا هۆشدارییێ ددەت کو کەرستێ رەنگین بۆ مرۆڤی بەردەت، ژ رەنگێ سپی، و گەنمی، و ئەسمەر، و رەش، و رەنگاورەنگ، ئەڤە ژ کارێن ڤێ رژێنا ژێر مەژییە کو کێشا وێ ژ نیڤ گرامێ نابۆریت.

و هۆرموونەکێ دی یێ هەی هەڤسەنگییا شلەیان دورست دکەت، و ئەگەر ئەڤ هۆرموونە تێك چۆ د رژێنا ژێر مەژیدا دێ ژیانا مرۆڤی گەلەك نەخۆش بیت، ب تنێ دێ مژویلی ڤەخوارنا ئاڤێ بیت و ب میزتنێڤە، و دێ هەمی دەمێ خۆ ب ڤەخوارنێ و دەرهاڤێژتنا ئاڤێڤە بەت.

و هۆرموونەکێ دی یێ هەی بۆ ئینانەئێك و بەرفرەهکرنا لۆلەیێن خوینێیە، و چالاككرنا بیردانکێ.

و هۆرموونەکێ دی یێ ژانا زارۆکبوونێیە، کو رژێنا ژێر مەژی دەردکەت، ژانا زارۆکبوونێ کریارەکا گەلەکا مژدارە کو حەوز فرەهـ دبیت، و ماسولکێن رەحمی دهێنە ئێك، ئەڤ هۆرموونە دێ هێت کو یێ پرۆگرام کرییە، دا بگونجیت ل هەر بزاڤەکێ کو دانانەکا دەستنیشانکری هەبیت، (ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ (٢٠)) [عبس]، (ئانکو، پاشی رێکا بوونێ بۆ ساناهی ئێخستی (و ژیان بۆ ساناهی کر و هەردو رێك بۆ ئاشکەراکرن، رێکا باشی و باوەرییێ و رێکا خرابی و گاورییێ، کا وی کیژ بڤێت بلا بۆ خۆ وێ بگریت).

و گەلەك هۆرموونێن هەین ئەڤ رژێنا ژێر مەژی دەردکەت، و زێدەباری ڤێ چەندێ مرۆڤ یێ لاوازە، هەروەکی خودێ مرۆڤ سالۆخەتکری: (وَخُلِقَ الإنْسَانُ ضَعِيفاً) [النساء:٢٨]، (ئانکو، ب راستی مرۆڤ بێ هێز و لاواز هاتییە چێکرن (ئانکو نەشێت بێنا خۆ ل سەر دلخوازییان فرەهـ بکەت).

ئەڤەیە مرۆڤ، ئەڤە رژێنەکا بچویکە د مێشکێ ویدا، زانا دبێژنێ شاها رژێنان، ئەو ژی رژێنا ژێر مەژییە، کێشا وێ نیڤ گرامە، نەهـ هۆرموونێن سەرەکی بەرددەت د ژیانا مرۆڤیدا، ئەگەر ئەڤ رژێنە تێك چۆ یان دەردانا هۆرموونێن وێ تێك چۆ، دێ ژیانا مرۆڤی بیتە دۆزەخ (خۆلبەرگرتن نینە).

(أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ (٩) وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ (١٠) فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ (١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣)) [البلد]، خۆزییێن وی یێ گەردەنا خۆ ژ دلچۆنێن دنیایێ ئازا کری دا بگەهیتە خودێ؛ چونکی دلچۆن پەردەکە د ناڤبەرا وی و خودێدا.

هەتا نوکە ژی بابەتێ هۆرموونان بابەتەکێ مژدارە، گەلەکێ گرنگە، ژ بەر کو دەمێ مرۆڤ هشیار دبیت، و لڤینێ دکەت، و چالاکییا خۆ دکەت نوزانیت کا چەندا مژدارە، و چەندا هویربینە د چێکرنا ویدا، و لڤینێن ئەندام و کۆئەندامێن وی، بلا ئەو سوپاسییا خودێ بکەت ل سەر ڤان نیعمەتان.

# رژێنا کاژی

رژێنەکا بچویك یا د نیڤا مێشکێ مرۆڤیدا هەی، قەبارێ وێ هندی تۆڤکەکا گەنمۆکێ سپییە، دبێژنێ رژێنا کاژی، زانایەکێ گەلەکێ مەزن د وەلاتەکێ پێشکەفتیدا - ب پیڤەرێ ماددی - گۆتە قوتابییێن خۆ: "رژێنا کاژی رژێنەکا بێ مفایە، و چو کار و چالاکی ژی نینە، و چو رۆلەك د لەشێ مرۆڤیدا ب هەمیڤە نینە"، خودێ دبێژیت: (وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا (٨٥)) [الاسراء]، (ئانکو، ژ کێمەکا زانینێ پێڤە بۆ هەوە نەهاتییە دان).

ئاخڤتنەك بوو زانایەکێ مەزن د نوژدارییێدا د زانستێ توێکارییێدا (التشریح) دگۆتە قوتابییێن خۆ، پاشی ئاشکەرا بوو ئەڤ رژێنە ئێکەم رژێنە د کۆرپەلەیدا چێ دبیت، و دویماهی رژێنە نهێنییێن وێ هاتینە دیارکرن د زانستێ نوژدارییێدا، ئەڤ رژێنە هۆرموونەکی بەرددەت یێ د هەمی زیندەوەراندا هەی ژ رووەکی و گیانەوەری و مرۆڤی هەتا ئەڤێن ئێك خانە ئەڤ هۆرموونە یێ تێدا، هەبوونا ڤی هۆرموونی د هەمی زیندەوەراندا تشتەکێ کێم و حێبەتییە، ئەڤ هۆرموونە دەردانێ ناکەت ب تنێ شەڤێ نەبیت، زانا نوکە بۆ ڤی هۆرموونی دبێژن: "ئەڤە ژ پترین کەرستێن چالاکە د لەشێ مرۆڤیدا، هاریکارییا لەشی دکەت بۆ نەهێلانا میکرۆبان و ڤایرۆسان، و هاریکارییا لەشی دکەت بۆ نڤستنەکا ئارام، و بۆ باشترلێکرنا جۆرێ نڤستنێ، و هاریکارییا لەشی دکەت ژ کێم پەیدابوونا نەخۆشییێن خوینبەرێن دلی، و نیشانێن گەشتا دویر و درێژ سڤك دکەت، و چالاکییا زیندەوری زێدە دکەت، و د هێزا ماسولکێن ویدا، چو نەمایە ئەڤ هۆرموونە ببیتە توخمێ ئێکێ د چالاککرنا مرۆڤیدا و د ساخلەمی و سلامەتی و کارێن ئەندامێن ویدا".

من ژ ڤێ هۆشدارییێ هەمییێ دڤیا ئەوێ گۆتی:"رژێنا کاژی رژێنەکا بێ مفایە، چو کار و چالاکی نینن، و چو رۆلەك د لەشێ مرۆڤیدا نینە" بەرامبەر بۆ ڤێ گۆتنا وی، کو چو بنەمایێ دورست بۆ ڤێ گۆتنێ نینە، ئەوە کو ئەو تشتێن ئەم دخوینین هەمی نەدورستن، و ئەو تشتێن ئەم گوه لێ دبین هەمی نەدورستن.

ئەڤ رژێنە گرنگترین هۆرموون دەردکەت د لەشێ مرۆڤیدا و ئەگەر ئەم ڤی هۆرموونی لادەین دێ ژیانا مرۆڤی ب دویماهی هێت.

رژێنەکا بچویکە ب قەبارێ تۆڤکەکا گەنمۆکێ سپی د ناڤەندا مێشکیدا، ناڤێ وێ رژێنا کاژییە، و یا د هەمی زیندەوەراندا هەی، هەتا د رووەك و گیانەوەراندا، و هەتا د زیندەوەرێن ئێك خانەدا، خودێ دبێژیت: ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا (٨٥)﴾ [الاسراء]، ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ (٢٥٥)﴾ [البقرة]، (ئانکو: چو تشت ب سەر چو زانینا وی (خودێ) هەلنابن، ئەو نەبیت یا وی ڤیایی، (ب رێکا پێغەمبەرێت خۆ) و کورسییا وی (خودێ دزانیت کا چییە) ئەرد و ئەسمان ڤەگرتینە، و راگرتنا هەردوکان ژی (ئەرد و ئەسمان) لێ (ل خودێ) یا گران نینە. و ئەوە یێ خودان رێز و مەزنایی و پێکا بلند).

و یا کەڤتییە سەر زارێ زانایان کو: "هێژ پێت مە د دەریایا زانینێدا تەر نەبووینە، هێژ زانا وەکی زارۆکان دکەڤنە سەر چۆکان هەمبەر نهێنییا ڤی گەردوونی، و هەمبەر نهێنییا ڤی مرۆڤی".

ژ بەر ڤێ چەندێ دبێژن: "سێ سەد ڤەکۆلینێن زانستی یێن کویر ل دۆر ڤێ رژێنێ د سالەکێدا یێن بەلاڤ کری"، مرۆڤ هندەك جاران بهایێ وی تشتی کێم دکەت ئەو تشتێ چو ژێ نەزانیت، بەلێ دەمێ راستی زانی پێدڤییە ئەو سوجدێ بۆ خودێ ببەت.

# سايموسه رژێن

رژێنەکە د دەستپێکا بوونێدا دورست و گەشە دبیت، و پشتی دو سالان لاواز (تضمر) دبیت، ئەڤێ چەندێ وەکر هندەك زانا بێژن:" ڤێ رژێنێ چو کار نینە، و چو مفا ب هەمیڤە د ژیانا مرۆڤیدا نینە"، و ئەڤە ژ کێماسییێن زانستینە، پاشی ژ نیشکەکێڤە ئاشکرا کر ئەڤ رژێنە ژ گرنگترین و مەترسیترین رژێنە د ژیانا مرۆڤیدا.

کۆئەندامێ بەرگرییا وەرگر دهێتە هژمارتن ژ مەترسیترین کۆئەندامێن د لەشێ مرۆڤیدا، و ئەڤ کۆئەندامە لەشکەرەکێ بەرهڤانییەکا ئاست بلند و ئامادەیە، کو تیپێن سەحکرنێ یێن تێدا، و تیپێن چێکرنا چەکی، و تیپێن شەرکرنێ، و تیپێن خزمەتکارییان، و تیپا کۆماندۆز، و ئاخڤتنا ل ڤێرە دێ ل سەر تیپێن شەرکرنێ بیت.

تیپەکا ژ تەپکێن سپی یێن خوینێ دێ هنێریت کو ئەڤ تەپکە یێن د مەژییێ هەستیاندا چێ بووین و دورست بووین، و دهێنە بەردان بۆ کارێ شەرکرنێ، دهێنە هنارتن بۆ خویندنگەهەکا جەنگی ناڤێ وێ سایموسە رژێنە د خۆلەکا مەشق و راهێنانێدا، و پشتی ژ تاقیکرنێ دەرباز دبن دێ دەرچۆنێ کەن ب نازناڤێ خانا تائی ( t cell) یا فێرکری.

و د ڤێ خویندنگەها جەنگیدا تەپکێن سپی یێن خوینێ کو هاتینە جوداکرن بۆ شەرکرنێ دو بابەتێن سەرەکی دخوینن: نیاسینا خۆیەتی و هەڤالی، و نیاسینا دژمنێ ب نەخۆشی.

و د بریاردەرێ ئێکێدا: سەدان هزار پرۆتینان نیشا ڤان خانەیان ددەن کو یێ ل ناڤ لەشێ مرۆڤی، پاشی دێ ڤان رەگەزێن هەڤال ئیشارەت کەن، و دێ راهێنانان ب ڤان خانەیان کەن کو هێرشێ نەکەنە وان، چونکی ئەگەر هێرش کرێ رامانا وێ ئەوە لەش دێ خۆ ب خۆ ژ ناڤ بەت، و خۆ پویچ کەت.

و د بریاردەرێ دوویێدا: دێ نیشا ڤان خانەیان دەن ئەو تشتێ کو جۆرێ مرۆڤی زانی د ماوێ بۆرینا نفشێن مرۆڤی کو ئەو رەگەزەکێ ب نەخۆشە، د ماوێ بەرگریکارییێن دایکێ کو دچیت بۆ زارۆکێ بوویی د ماوێ شیریرا، و د ماوێ تاقیکرنێن زێندی ژ بەر کو زارۆك د سالێن دەستپێکێدا بەرەف گرتنا تشتان دچیت و دکەتە د دەڤێ خۆدا دا ب ڤێ چەندێ خانەیێن وی یێن شەرکەر رەگەزێن هەڤدژ بنیاسیت، یان ڤەگرتنا نەخۆشییێ زێدەتر زانیارییان ددەتێ ل سەر دژمنێن وی، و د ماوێ ڤان وانەیاندا تەپکێن سپی یێن شەرکەر دێ رەگەزێن هەڤدژ نیاسن کو ل سەر ڤان تەپکێن سپی پێدڤییە هێرشێ بکەنێ، یان دێ دەنگ و باسێ هەبوونا وان بەلاڤ کەن (رەگەزێن هەڤدژ)، یان دێ پشکدارییێ د دەستەسەرکرنا واندا کەن.

و و ب رێکا تلسکۆپێن ئەلکترۆنی سایموسە رژێن دیار دبیت ل سەر شێوێ پەیسکێن رۆمانی، تەپکێن سپی رێز رێز دبن ل سەر، داکو ڤان وانەیێن ب بها وەرگرن.

و چو پێ نەڤێت ل هەر زانکۆیەکێ یان پەیمانگەهەکێ یان قوتابخانەکێ تاقیکرن یێن هەین...

ئەڤ تەپکێن سپی یێن خوینێ ژی ئێك ئێکە د دەرگەهێن تاقیکرنارا دچن، و دهێنە تاقیکرن ئێك ئێکە د بریاردەرێن مە بەری نوکە بەحس کرین.

تاقیکرنا بابەتێ ئێکێ: دێ رەگەزەکێ هەڤال نیشا تەپکا سپی دەن، ئەگەر هێرش کرێ رامانا وێ ئەڤە ژ تاقیکرنێ دەرنەچۆ، و وەناکەن رژێنا سایموس ب جه بهێلیت و دێ هێتە کوشتن، چونکی ئەگەر دەرکەڤت و چۆ د ناڤ خوینێدا دێ هێرشێ کەتە لەشێ هەڤ شێوێ خۆ.

تاقیکرنا بابەتێ دووێ: دێ رەگەزێ دژمنێ ب نەخۆشی نیشا تەپکا سپی دەن، و ئەگەر نەشیا بنیاسیت و رەتکرنا وی بکەت رامانا وێ ئەو د تاقیکرنێدا ب سەر نەکەڤت، و ناهێلن ژ رژێنا سایموس بچیت و دێ کوژن، چونکی ئەگەر دەرکەڤت و چۆ د ناڤ خوینێدا های ژ دژمنی نابیت، و دێ دژمن شێت هێرشا لەشی کەت.

کارێ ڤێ کۆلیژا جەنگێ (سایموسە رژێن) یا بەردەوامە هەر ژ دەستپێکا بوونێ و هەتا ژییێ سێ سالییێ، و پشتی ڤی ماوەی دێ رابیت ب دانانا زانستێ زێرەڤانییێ و رێك و پێکیا تەپکێن سپی بۆ تەپکێن سپی یێن سەرکەڤتی د تاقیکرنێدا، کو پشتی دەرچۆنێ دبێژنێ خانێن تائی یێن فێرکری دا ب رۆلێ خۆ رابن د ڤەگوهاستنا ڤی زانستیدا بۆ نفشێن تەپکێن سپی یێن دویڤ واندا دهێن.

و د ژییێ حەفتێ سالییێدا نیاسین و زانینا تەپکێن سپی یێن شەرکەر لاواز دبیت، و دێ هێرشا رەگەزێن هەڤال کەن، و هندەك کۆئەندامێن لەشی و ئەندامان، و دێ بینین د ڤی ژییێ مرۆڤیدا نەخۆشییێن بەربەلاڤ وەکی کولبوونا گەهان، و هندەك نەخۆشییێن گورچیسکان، و نەخۆشییێن مەسلییان، و هندەك نەخۆشییێن دی ئەگەرێ وان ب تنێ لاوازییا فێرکرنا کۆئەندامێ بەرگرییێیە کو ژ ئەنجامێ نەمانا رێك و پێکیێ د کارێ خانەیێن شەرکەردا، و دێ خانەیێن بەرگرییێ یێن شەرکەر هێرشا وی لەشی کەن یێ ل سەر شێوێ خۆ، و دێ کاودانێ لەشێ مرۆڤی وەکی شەرەکێ ناڤخۆیی لێ هێت، و چێ دبیت خودانێ ڤێ ئاخڤتنێ بۆ ڤی دەمی راستییا گۆتی:

أعلِمُهُ الرِّمايَةَ كُلَّ يَومٍ          فَلَمَّا اشتَدَّ ساعِدُهُ رَمانِي

وَكَمْ عَلَّمتُهُ نَظْمَ القَوافِي          فَلَمَّا قَالَ قَافِيَةً هَجَانِي

ئەڤ رژێنا خەلك چو هزرا بۆ نەکەت، و هزر دکەن چو مفا نینە، بەلێ د راستیدا ژ گرنگترین و مەترسیترین رژێنە د لەشێ مرۆڤیدا، ئەڤە وەکی خواندنگەهەکا جەنگییە، یان کۆلیژەکا لەشکەری، ژ بۆ راهێنان پێکرنا رەگەزێن شەرکەر دا هەڤال و دژمنان ژێك جوداکەن (بنیاسن).

و هەر دەمێ زانست بەرەڤ پێش دچیت ڤان نیشانان ل سەر مەزناهییا خودێ ئاشکەرا دکەت.

# پەنكریاس و نەخۆشییا شەكرێ

نەخۆشییا شەكرێ، و ئەڤ نەخۆشییا بەربەلاڤ بنیاتێ وێ ئەوە خودێ رژێنەك یا كرییە د مرۆڤیدا ناڤێ وێ پەنكریاسە، ئەڤە رژێنەكا حێبەتییە، دەمێ خوارن دچیتە د مەعیدەیدا، و تێككاركرنێ د گەل شلەیێن هەرسكری دكەت دێ ترش بیت، و ئەڤ ترشە دێ ئاگەهییا دەمارێن خودێ كرینە د دیوارێن رویڤیكاندا كەن، ئەڤ دەمارە ئاگەهییا ناڤەندێن د مێشكیدا دكەن كو مێشك فەرمانێ ل پەنكریاسی بكەت ب دەردانا كەرستان و شلەی، دێ هەڤسەنگییێ ئێخیتە د ترشییا خوارنێدا، چونكی ئێكەم كارێ گرنگێ پەنكریاسی ئەوە دەردانا كەرستە و شلەیێن خوارنێ دكەتە ماددێن تفتی ب فەرمانەكێ كو ژ مێشكی دهێت، و ئەڤە ئێكەم كارێ پەنكریاسییە.

كارێ دووێ: گوهۆرینا شەكرا عومباركری د مێلاكێ و ماسۆلكاندا، ژ شەكرا عومباركری بۆ شەكرا بەرهەڤی سۆتنێ، شەكر دو جۆرە: شەكرا بۆ عومباركرنێ، و شەكرا بۆ مەزاختنێ، یا پێدڤییە هۆرموونێ پەنكریاسی مایتێكرنێ بكەت دا ڤێ شەكرێ ب گوهۆرن ژ كاودانەكی بۆ كاودانەكێ دی.

و كارێ گەلەكێ گرنگ، كو یێ سێیێیە ئەوە پەنكریاس ئەنسولینێ دەردكەت دا بشێت شەكرێ بمەزێخیت و بسۆژیت، و دەمێ پەنكریاسی سستی د دەردانا ئەنسولینێدا كر، دێ شەكر د میزێدا دیار بیت، و سۆتنا ڤان كەرستان ژی دێ لاواز بیت د لەشیدا، رژێنەكا بچویكە ئەم گرنگییێ پێ نادەین، ب گرنگترین كار رادبیت، ئەڤە ژ چێكرنا زانایەكێ پڕ خودان شیان و شارەزایە، ئەڤە ژ چێكرنا ئافرێنەرییە، خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات].

ئەو نیشانێن د لەشیدا هەین ئەگەر ئەم ژیانا خۆ هەمییێ د هزركرنا هویربینێن واندا ببۆرینین ئەم نەشێین ب دویماهی بینین، پەسن و مەزناهی بۆ وی خودایێ مرۆڤ

ئافراندی و وێنەکری، و ب باشترین وێنە، ئەوێ مرۆڤ ئافراندی و چێکری و موکم و بنەجە چێکری.

# خالخالك

خالخالك چییه؟ ئەڤ کۆئەندامێ حێبەتی، ئەڤ ئەندامێ گرنگ، ئەگەر ژ کار کەفت، یان چالاکیيا وی زێدە بوو دێ ژیانا مرۆڤی ب دویماهی هێت.

خالخالك، کۆئەندامە، یان ئەندامە، یان رژێنە، ناڤ بکە چەند تو دشێی، کێشا وێ ژ دو سەد گرامان زێدەتر نینە، رەنگێ وێ سۆرێ تارییە، خوین ب رێکا لۆلەیێن خوینێ یێن مەزن دگەهیتێ، و خوینبەرەك و خوینهێنەرەك یێن تێدا، د ناڤدا پەردەپۆشێن هەین، د دابەشکرینە بۆ خانیکا، و یێ دەوردایە ب ماسۆلکان، دەمێ دهێنە ئێك دێ ئەو خوینا یەدەك تێدا ڤالا بیت.

ئەڤ کۆئەندامە (خالخالك) چەندەکا مەزن ژ تەپکێن سپی یێن خوینێ چێ دکەت، و تەپکێن سپی لەشکەرێ بەرگرییێنە د لەشیدا، و نەخۆشییا ئایدزێ کو جیهان دلتەنگ و نەرحەت کری، ئەگەرێ ڤێ ژی ئەوە پویچبوونا ڤی لەشکەرییە، و دێ بەرگرییا لەشی د گەلدا لاواز بیت، ل ڤێرە بچویکترین ڤایرۆس دێ شێت وی شکێنیت.

ئەڤ خالخالکە، زێدەباری مێلاکێ، ئەوە تەپکێن سپی یێن خوینێ چێ دکەت د ژیانا کۆرپەلەیدا، ئەڤ تەپکە وەکی لەشکەرەکینە بەرهنگارییێ ژ ساخلەمییا لەشی دکەت.

ئەڤ خالخالکە، گۆڕستانەکە بۆ تەپکێن سۆرێن خوینێ، تەپکێن سۆرێن مری دهێنە خالخالکێ، دێ خالخالك کەرستەکی بەردەتە سەر، ئەڤ تەپکە دێ هێنە حەلکرن بۆ پێکهاتێن وان؛ دێ ئاسن ژێ هێتە دەر، و دێ چیتە کارگەهێن تەپکێن خوینێ یێن د مەژییێ هەستیاندا، و دێ هیمۆگلۆبین ژی هێتە دەر، دێ چیت بۆ مێلاکێ دا زەرکێ چێ کەت، ل ڤێرە خالخالك گۆڕستانەکە کو تەپکێن سۆرێن خوینێ شیکار دکەت بۆ پێکهاتێن وێ یێن سەرەکی، دا جارەکا دی چێکەتەڤە، و چێکرنا ئاسنی دێ جارەکا دی بنە تەپکێن خوینێ، ئەرێ ما ئەڤە نە نەخشە دانانەکا ئابۆرییە؟ ئەرێ ما ئەڤە نە

ئاراستەكرنا خودابيە، كو ژ ناڤچۆن، و پويچبوونا كەرستان، تشتەكە بەروڤاژى تەكووزييا مرۆڤييە؟

تشتێ سێيێ، خالخالك ئاميرەكە بۆ چێكرنا تەپكێن سۆرێن خوينێ، كارگەهەكە، بەلێ كارگەهەكا يەدەك، ئەگەر كارگەهـ د مەژييێ هەستييياندا ژ كار كەڤتن، دێ ئەڤ كارگەهە كار كەت بۆ چێكرنا تەپكێن سۆرێن خوينێ، ژ بۆ پاراستنا ژيانا مرۆڤی.

تشتێ چارێ، خالخالك عومبارەكە بۆ تەپكێن سۆرێن خوينێ، خالخالك ڤان تەپكێن سۆر دبەتە لەشی دەمێ پێدڤی، كو ئەو عومبارەكا يەدەكە.

عومبارەكە بۆ تەپكێن سۆرێن خوينێ، و كارگەهەكا يەدەكە بۆ تەپكێن سۆرێن خوينێ، و كارگەهەكە بۆ تەپكێن سپی يێن خوينێ، و گۆڕستانەكە بۆ تەپكێن مری يێن سۆر.

ئەگەر ئەڤ خالخالكە چالاك بوو، و تەپكێن سۆرێن ساخ پويچ كرن مرۆڤ دێ مريت، يان دێ تووشی كێم خوينييێ بيت ژ جۆرەكێ تايبەت، و ئەگەر كێماسييەك د كارێ خۆدا كر دێ كۆئەندامێ بەرگرييا لەشی لاواز بيت، و ئەڤەيە ئەوا نوكە جيهان تووشی نەخۆشييەكا مەترسی كری (نەخۆشيا ئايدز)ێ.

ئەڤ خالخالكە، چێ دبيت مرۆڤ ل دەڤ فرۆشيارى بكريت وەك پارچەكا گۆشتی، و نوزانيت ئەڤ خالخالكا دخۆت ئەڤە جيهانەكا بنيات دايە ب خۆ؟

پێغەمبەر ﷺ دبێژيت: "...أُحِلَّتْ لَكُمْ مَيْتَتَانِ وَ دَمَانِ؛ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَ الْجَرَادُ، وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ"[1]، (ئانكو، دو مرى و دو خوين بۆ هەوە يێن هاتينە حەلالكرن، هندی هەردو مرينە نەهنگ و كولينە، و هەردو خوين مێلاك و خالخالكن).

---

(١) ئيبن ماجە (٣٣١٤)، ئەحمەد (٥٧٢٣) ژ ئيبن عومەرى.

ئاراستەكرنا خودايیە، كو ژ نافچۆن، و پویچبوونا كەرستان، تشتەكە بەروفاژی تەكووزییا مرۆفییە؟

تشتێ سێیێ، خالخالك ئامویرەكە بۆ چێكرنا تەپكێن سۆرێن خوینێ، كارگەهەكە، بەلێ كارگەهەكا یەدەك، ئەگەر كارگەهـ د مەژییێ هەستییاندا ژ كار كەفتن، دێ ئەڤ كارگەهە كار كەت بۆ چێكرنا تەپكێن سۆرێن خوینێ، ژ بۆ پاراستنا ژیانا مرۆڤی.

تشتێ چارێ، خالخالك عومبارەكە بۆ تەپكێن سۆرێن خوینێ، خالخالك ڤان تەپكێن سۆر دبەتە لەشی دەمێ پێدڤی، كو ئەو عومبارەكا یەدەكە.

عومبارەكە بۆ تەپكێن سۆرێن خوینێ، و كارگەهەكا یەدەكە بۆ تەپكێن سۆرێن خوینێ، و كارگەهەكە بۆ تەپكێن سپی یێن خوینێ، و گۆڕستانەكە بۆ تەپكێن مری یێن سۆر.

ئەگەر ئەڤ خالخالكە چالاك بوو، و تەپكێن سۆرێن ساخ پویچ كرن مرۆڤ دێ مریت، یان دێ تووشی كێم خوینییێ بیت ژ جۆرەكێ تایبەت، و ئەگەر كێماسییەك د كارێ خۆدا كر دێ كۆئەندامێ بەرگرییا لەشی لاواز بیت، و ئەڤەیە ئەوا نوكە جیهان تووشی نەخۆشییەكا مەترسی كری (نەخۆشیا ئایدز)ێ.

ئەڤ خالخالكە، چێ دبیت مرۆڤ ل دەڤ فرۆشیاری بكریت وەك پارچەكا گۆشتی، و نوزانیت ئەڤ خالخالكا دخۆت ئەڤە جیهانەكا بنیات دایە ب خۆ؟

پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: "...أحِلَت لَكُمْ مَيْتَتَانِ وَ دَمَانِ؛ فَأمَّا المَيْتَتَانِ فَالحُوتُ وَ الجَرادُ، وَأمَّا الدَّمَانِ فَالكَبِدُ وَالطِّحَالُ"[1]، (ئانكو، دو مری و دو خوین بۆ هەوە یێن هاتینە حەلالكرن، هندی هەردو مرینە نەهنگ و كولینە، و هەردو خوین مێلاك و خالخالكن).

---

(١) ئیبن ماجە (٣٣١٤)، ئەحمەد (٥٧٢٣) ژ ئیبن عومەری.

# پشكا دوازدێ

## كۆئەندامێ هەرسكرنێ ( حەلكرنا خوارنێ )

١- پێكهاتێ تفێ و كارێن وێ
٢- هەستییێ لامكێ و ئەزمان و كۆئەندامێ هەرسكرنێ
٣- ئەزمانكێ گەورییێ
٤- پەردا بریتوانی، و هەستكرن ب ئێشانێ
٥- مەعیدە و هۆكارێ "كاسل"
٦- مێلاك جهەكێ پیشەسازییێ تمامە
٧- ڤەخوارنا ساخلەم

# پێکهاتێ تفێ و کارێن وێ

کەس ژ مە نینە تف د دەڤیدا نەبیت، تفەکا شل، ئەڤ تفە هندەك رژێنێن بن لامکێ بەرددەن، و بن ئەزمانی، و بن گوهی، بۆ مە ل ڤێرە نەیا گرنگە هژمارا وان چەندە، و توێکارییا وێ، و بۆ مە ل ڤێرە دو تشت گرنگن پێکهاتێ تفێ، و کارێ وێ.

کی باوەر دکەت د تفێدا ماددێن ئەلکترۆلیتی یێن کانزایی یێن هەین ژ وان: سۆدیۆم، و پۆتاسیۆم، و کالسیۆم، و مەگنیزیۆم، و کلۆر، و بیکاربۆن، و فۆسفات، و یوود، و ئازووت، و د تفێدا پرۆتین، و شەکر، و دژە زیندی، و ئەنزیم، کێ ئەڤ تفە چێ کرییە؟ کێ پێك ئینایە؟ کێ وەلێ کرییە ئەڤ ماددێن ئەلکترۆلیتی یێن کانزایی، و یێن ئەندامی ژێ دەرکەڤن؟

و کارێن تفێ زانایان کارێن وێ ئاشکەرا کرن، کو تفێ رۆلەکێ گەلەکێ گرنگ یێ هەی د هندەك ئاستاندا، یا ئێکێ: تف پانکا ناڤ دەڤیدا نەرم دکەت، و ئەگەر تف نەبا دا پانکا دەڤی تیڤل بیت و شەق شەق بیت، و دا میکرۆب کارێ خۆ یێ مەترسی کەن، و ژ کارێن دی یێن تفێ تف ئەزمانی نەرم دکەت، و پانکێن ناڤا دەڤی.

تشتەکێ دی: وی پارییێ ئەم د خۆین تف تەڕ و نەرم دکەت، و ب رێکا تەڕبوون و نەرمبوونێ ڤەجوینا پاری و هەرسکرنا وی ب ساناهی دکەڤیت.

تشتێ سێیێ: تف ب رۆلێ هەرسکرنا دەستپێکی رادبیت د دەڤیدا، ئەوێ نانی بخۆت و بوو ماوەکێ درێژ بهێلیتە د دەڤێ خۆدا، دێ هەست ب تامەکا شرین کەت، و ئەڤە بەلگەیە کو د تفێدا کەرستێن هەرسکەر یێن تێدا، شلەکێ هەرسکەر نشایێ دگوهۆریت بۆ شەکرێ.

**تشتێ چارێ:** تف هاریکاره دەمێ ئاخفتنێ، و د چێکرنا هەر پیتەکێ ژ پیتان هەڤدە ماسۆلکه پشکدار دبن، و ئەزمان ئامیرێ ئاخفتنێیه، و ئەگەر تف نەبا مرۆڤ نەدشییا بەردەوامییێ بدەته ئاخفتنێ.

**تشتێ پێنجێ:** تف بەرمایکێن خوارنێ د دەڤیدا پاقژ دکەت، و ئەڤه رۆلەکه چێ دبیت هندەك مرۆڤ پێ ئاگەهـ نەبن.

**تشتێ شەشێ:** تف زێده دبیت دەمێ مرۆڤ خوارنەکا ترش دخۆت، هەر ڤەخوارنەکا تیراتی تێدا، ئەڤ تیراتییا د ڤێ ڤەخوارنێدا هەی وەل رژێنێن تفێ دکەن کو زێدەتر دەردانێ بکەن، ژ بەر کو دا ئەڤ ڤەخوارنا تیر ژێك بهێته دەر دا زیانێ نەکەت.

**تشتەکێ دی:** تف خوارنا سار گەرم دکەت ب رێکا لێکگوهۆرینا گەرمییێ، و دبیته هاریکار بۆ تەزاندنا خوارنا گەرم، و دیسا دبیته هاریکار ب ئینان و برنا پاری د دەڤیدا، و ژ ڤێ هەمییێ گرنگتر کو د تفێدا کەرستێن هەڤدژ یێن هەین بۆ پویتبوون و رزینا ددانان، و کەرستێن هەڤدژ یێن د تفێدا هەین بۆ میکرۆبان، چونکی دەڤ یێ ڤەکرییه بۆ هەوایێ دهێت، دبیته ژینگەهەکا گەلەکا باش بۆ گەشەبوونا میکرۆبان، چونکی د ڤێ ژینگەهێدا گەرمی و شەهـ یا هەی، ئەڤ هەردو مەرجه د ژینگەهێدا باشن ژ بۆ زێدەبوونا میکرۆبان، ژ بەر ڤێ چەندێ کەرستەکێ دژی میکرۆبان د تفێدا یێ هەی د شیانێن ڤی کەرستەیدایه ڤان میکرۆبان د جهێ واندا بکوژیت.

ژ کەرستێن هەڤدژ بۆ میکرۆبان، و کەرستێن هەڤدژ بۆ رزین و پرتپرتبوونا ددانان، و کەرستێن ژێکهاتنەدەرا کەرستێن حەلیایێن ب زیان، و پاقژکرنا دەڤی ژ بەرمایکێن خوارنێ، و نەرمکرنا ئەزمانی د ماوێ ئاخفتنێدا، و نەرمکرنا پاری د ماوێ ڤەجوینێدا، و هەرسکرنا دەستپێکی یا پێکهاتێن پاری، و نەرمکرنا پانکا دەڤی، و ئەگەر ئەڤه نەبا دا تڤیلاندن و پەڤپەڤبوون دورست بیت، ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)﴾ [الذاريات].

ئەڤ تفا کو کەس پویتەی پێ نەکەت پێکهاتییەکێ هویربین و رژێن و خانه یێن هەین، و کارێن جودا جودا، هەمی ژ بەر هندێ کو مرۆڤ ب ژیانەکا تەکووزا دورست بژیت.

# هەستییێ لامکێ و ئەزمان و کۆئەندامێ هەرسکرنێ

هزرکرن د ئافراندنا ئەرد و ئەسماناندا، و هزرکرن د نەفسا مرۆڤیدا، ئەڤە نێزیکترین تشته بۆ وی، بەرفرەهترین دەرگەهە بۆ نیاسینا خودێ، و نێزیکترین ڕێکە بۆ بەرەڤ وی، خودێ دبێژیت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ) [فصلت: ٥٣]، (ئانکو، نێزیك، نەدویر ئەم دێ بەلگە و نیشانێت (ئێکینی و شیانا) خۆ بۆ وان د ئەرد و ئەسماناندا و د وان ب خۆدا ژی ئاشکەرا کەین).

ژ نیشانێن خودێ د مرۆڤی ب خۆدا، ئەوە ئەڤ هەستییێ لامکێ یێ ب لڤین، شەش ماسۆلکە دلڤینن بۆ بەرەڤ ژێری، و شەش ماسۆلکێن دی دلڤینن بۆ بەرەڤ سەری، و دو ماسۆلکە دلڤینن بۆ راست و چەپێ، و چار ماسۆلکە دلڤینن بۆ بەرەڤ پێشی و پاشییێ، ژ بەر کو لڤین بەرەڤ سەری، ژێری، و راستێ، و چەپێ، و پێشی و پاشییێ، و مرۆڤ نێزیکی دو هزار و چار سەد جاران د ئێك رۆژدا خوارنێ دجویت و دادعویریت، کۆئەندامەکێ داعویرانێ گەلەکێ هویربین یێ هەی.

و د هەر خۆلەکەکێدا سەد هزار خانە د دەڤیدا نوی دبنەڤە، و د ئەزمانیدا هەڤدە ماسۆلکە یێن هەین، ئەڤ ماسۆلکە دشێن ئەزمانی بۆ هەمی لایان ببەن ژ بۆ ئینان و برنا خوارنێ د دەڤیدا، بەرێ خۆ بدە ئامویرێ هەڤیرکرنێ، چاوا دزڤریت، و چاوا تێکەلکەرەك د ناڤدا پێڤەیە هەڤیری تێکەل دکەت، دیسا دەڤ ژی ب ڤی شێوەیە، چونکی لامکا ژێری بۆ هەردو لایێن راست و چەپ دلڤیت، بەرەڤ سەری و ژێری، پێش و پاش، و ئەزمان وەکی ڤی تێکەلکەرییە، بۆ هەمی لایان دزڤریت، دا پێکهاتێن پاری تێکەل بکەت.

بابەتێ داعویرانێ بابەتەکێ کەلەکێ هویربینە، گلالیچك یا هەی، و دیسا ئەزمانکێ زڕنایی، و دەمێ مرۆڤ پاری دادعویریت، گلالیچك دێ رێکا دفنێ گریت، و دێ ئەزمانکێ

زرنا بۆرییا هەناسێ گریت، بەلێ دەمێ تو شەڤێ یێ نڤستی، و تف د دەڤیدا کۆم دبیت، و تو یێ نڤستی، کریارەکا گەلەکا هویربین دهێتە کرن، ل ڤێرە هندەك ئاگەهکرنێن دەماری د دەڤیدا بۆ لاکێشە مەژی یێن هەین، تف گەلەك کۆم دبیت، و دێ فەرمان بۆ ئەزمانکێ زرنایی و گلالیچکێ هێت کو رێکا دفنێ و رێکا بۆرییا هەوای بگرن، و دێ تف بۆ سورێنجکێ چیت، ئەڤە هەمی چێ دبن و تو یێ نڤستی، بەلێ چاڤدێرییا خودایی یا هشیارە.

کریارا داعویرانێ دەمارێن کلۆخکی کۆنترۆلا وێ دکەن، و دەمارا حەفتێ یا کلۆخکی و یا نەهێ و یازدێ و دوازدێ، و ئەڤە هەمی د ڤەدا مێشکێرا دچن، و ئەگەر ئەڤ ناڤەندە تووشی پویچبوونێ بوو ب هەر ئەگەرەکی دێ خوارن بۆ کونێن دفنێ چیت و تێرا دەرکەڤیت، و دا خوارن بۆ بۆرییا هەوای ژی چیت، و پاشی بۆ هەردو سیهان، و د ڤێ رەوشێدا دێ ب خەندقینێ مرن مسۆگەر بیت.

ئەڤ سورێنجکە، درێژاهییا وێ پێنجی سەنتیمەترە، پێکهاتییە ژ ماسۆلکێن بازنەیی دهێتە ئێك پلە ب پلە، ئەگەر مرۆڤەك یێ درێژکری بیت د نەخۆشخانێدا، و خوارنێ بدەنێ، ئەڤ خوارنە دێ چیتە ژ دەستپێکا سورێنجکێ بۆ مەعدەی ئانکو دێ ئەڤ خوارنە ب چۆنەکا سروشتی چیت، و ئەگەر ئەم مرۆڤەکی سەر نشیف بهەلاویسین، و پارییەکێ خوارنێ بدەینێ، دێ ئەڤ پارییە بەرەف سەری چیت (هەر ژ سورێنجکێ بۆ مەعیدەی)، بەروڤاژی هێزا راکێشانێ، چونکی د ڤێ سورێنجکێدا ماسۆلکێن بازنەیی یێن هەین، دەمێ پاری تێرا دچیت دهێنە ئێك و ل دویف ئێك بۆ بەرەف مەعیدەی، و دێ پاری چیتە د مەعیدەیدا، ئەگەر بەرێ مرۆڤی ل کیژ لایی ژی بیت.

مەعیدەی دەرپۆشکەکێ هەی، و یێ بنەجهە بۆ گرتنێ، دا شلێن ترش نەدەرکەڤن، ئەگەر دێ مرۆڤ پێ نەخۆش بیت، و دەمێ دلێ مرۆڤی رادبیت، مرۆڤ هەست ب سۆتنەکێ دکەت، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ئەوە ترشێ کلۆرێ ئاڤێیە د مەعیدەیدا یێ هەی، و چونکی دا ئەڤ ترشە نەدەرکەڤیت و بهێتە سورێنجکێ، و مرۆڤ نەخۆشییا خۆ پێ ببینیت، ئەڤ دەرپۆشکە ب بنەجهی یێ گرتییە، و دا پاری د دەڤێ دەرپۆشکێرا بچیتە د

**مەعیدەیدا، دڤێت فشارەکا بلند هەبیت پاری پالدمت د دەرپۆشکیڕا بچیت، ئەڤ فشارە چار جارکی هندی وێیە ئەوا د سورێنجکێدا هەی، و ئەڤە هەمی ژ بەر هندێیە، تو بخۆی، و ڤەخۆی، و هەناسێ بهەلکێشی، و بنڤی، و تفێ ب شەڤێ داعویری، و خوارن بچیتە د مەعیدەیدا، کێ ئەڤە ڕێکخستییە؟ کێ موکوم و بنەجە چێکرییە؟**

(لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ) [التين: ٤].

# ئەزمانكێ گەورییێ

د لەشێ مرۆڤیدا پۆلیسەكێ هاتن و چۆنێ یێ هەی، كار دكەت هەر ژ ئافراندنا مرۆڤی د زكێ دایكێدا هەتا مرنێ، ناوەستیت، و بێزار نابیت، ب شەڤ و رۆژ كار دكەت، د هشیاری و د خەوێدا، ئەو ژی ئەزمانكێ گەورییێیە.

رێكا هەوای ژ دفنێ بۆ هەردو سیهان د ماوێ بۆرییا هەوایدا، و رێكا خوارنێ ژ دەڤی بۆ مەعیدەی د ماوێ سورنجكێدا ئەڤ هەردو رێكە ل جهەكێ بەرتەنگ دگەهنە ئێك ئەو ژی گەورییە.

ئەزمانكێ گەورییێ د ژیانا مرۆڤیدا ب گرنگترین كار رادبیت، ئەگەر نیڤ پەرداغا ئاڤێ ب خەلەتیڤە بچیتە د بۆرییا هەوایدا و بچیتە د هەردو سیهاندا، دێ مرۆڤ ب خەندقین مریت، چونكی خانەیێن مێشكی یێن ماقویل (النبیل) دێ ب هەمیڤە مرن، دەمێ ئۆكسجین پتر ژ پێنج خۆلەكان ژێ دهێتە برین، و ئەگەر ئەزمانكێ گەورییێ ژ بیر كر رێكا بۆرییا هەوای بگریت، و رێكا سورێنجكێ ڤەكەت دێ ئەنجامێ وێ خەندقین بیت، و دێ چاوا بیت ئەگەر خوارن چۆ د بۆرییا هەوایدا، ل ڤێرە دێ بۆرییا هەوای هێتە گرتن، و دێ مرۆڤ خەندقیت، و هەر وێ گاڤێ دێ مریت؟

ئەڤ ئەزمانكێ گەورییێ، كو رێكا ڤەدكەت ل سورێنجكێ هەمبەر خوارنێ، و رێكا هەناسێ ڤەدكەت دەمێ هەناسەكرنێ، ب شەڤ و رۆژ كار دكەت، كار دكەت و تو یێ نڤستی، ئەگەر تو بێژی: ئەز ب شەڤێ و دەمێ ئەز یێ نڤستی ئەز چو ناخۆم، ئەڤ تفا د دەڤێ تەدا كۆم دبیت، چاوا تو دادعویری، و تو یێ نڤستی و بێی هەست پێ بكەی؟ كی فەرمانێ ل ڤی ئەزمانكی دكەت كو رێكا سورێنجكێ ڤەكەت، دا ئەو تفا كۆم بووی د دەڤیدا ببەتە د مەعیدەیدا، پاشی سورێنجك دگریت و هەناسە بەردەوام دبیت، و تو نوزانی؟

ژ قەنجی و کەرەما خودێیە ل سەر مە، ئەڤ بۆرییا هەوای، ژ بەر گرنگییا کاریٚ وێ، و کۆئەندامەکیٚ چارەنڤیسییێیە، و ئەگەر هەناسە ب چەند خۆلەکان راوەستا، دێ مرۆڤ مریت، ژ بەر کاریٚ وێ ییٚ گرنگ، خودیٚ وەسا یا حەز کری کولك د ناڤ بۆرییا هەوایدا ب لڤین کرینە، بەردەوام دهێنە لڤاندن بۆ سەری، هەر تشتەکیٚ کێم بچیتە تێدا، دێ وی تشتی بەرەڤ سەری بەت، دا د گەورییێدا کۆم ببن، و بلغەم دورست بیت، کیٚ ئەڤ بۆرییا هەوای کولکێن ب لڤین کرینە تێدا؟ ل ڤێرە یا گونجایە بەحسیٚ جگارکێشانیٚ بکەین کو ڤان کولکان هەناسیٚ ژ کار دئێخیت، دیٚ سیە تووشی کولبوونێن کویفکیبوونا خوینیٚ بن، ژ ئەگەریٚ کارئێخستنا ڤان کولکان کو بەرەڤ سەری دلڤن.

و سورێنجك خودیٚ وەسا چیٚ کرییە ماسولکێن بازنەیی کرینە تێدا کو ل دویڤ ئێك تێك دچن (دهێنە ئێك)، و ئەگەر مرۆڤەکی سەرنشیڤ بکەین، پێن وی ل سەری بن، و سەریٚ وی ل بنی بیت، و پارییەکی بدەییٚ، یان فرەکا ئاڤیٚ بدەییٚ، دیٚ ئاڤ بەروڤاژی هێزا راکێشانیٚ بەرەڤ سەری چیت، و خوارن ژی بەروڤاژی سیستەمیٚ راکێشانیٚ بەرەڤ سەری چیت، ژ ئەگەریٚ ڤان ماسۆلکێن بازنەیی کو ل دویڤ ئێك دهێنە ئێك، کیٚ ئەڤ کولکە ب لڤین بەرەڤ سەری کرینە د بۆرییا هەوایدا، و کیٚ ئەڤ ماسۆلکێن بازنەیی کو هەمی تشتا بەرەڤ مەعیدەیڤە دبەن کرینە د سورێنجکێدا، بێی بەریٚ خۆ بدەتیٚ کا بەریٚ مرۆڤی ل کیڤەیە؟ خودیٚ دبێژیت: (وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِنْ دَابَّةٍ آيَاتٌ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ (٤)) [الجاثية]، (ئانکو: چێکرنا هەوە و هەمی رەنگێت جانەوەرێت د ئەردیدا بەلاڤ، نیشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت هەڤییٚ پەسەند دکەن و دگرن). و دبێژیت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ) [فصلت:٥٣]، و دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات].

ئەڤە نیشانەکە پێدڤی پەرتۆکان ناکەت، و پێدڤی ب بەرگێن پەرتۆکان و تلسکۆپێن ئەلکترۆنی ناکەت، هەر ئێك ژ مە دشێت هزرکرنیٚ د ڤیٚ نیشانێدا بکەت.

# پەردا بریتوانی و هەستکرن ب ئێشانێ

پەردەك یا د ڕویڤیكێن زراڤدا هەی دبێژنێ: پەردا بیریتوانی یان (مەساریق)ی... ڤێ پەردێ كارەكێ گەلەكێ مەزن پێ هەی.

ئێك: ئەگەر مرۆڤەك ئاڤا كەلاندی ڤەخۆت، ڕویڤیك هەست ب گەرمییێ ناكەن، چونكی زانین و شارەزاییا خودێیە ڕویڤیكێن زراڤ و ستویر دەمارێن هەستپێكرنێ ب هەمیڤە نەبن، ڕویڤیك دەوردانە ب پەردەكێ گەلەك كار پێن هەین، ژ كارێن وێ: ب شێوەكێ نەرم دهەلگریت، ئانكو وەدكەت بزاڤێ بكەت و ئەو یا هەلگرتی، و ئەڤە ژ هویربینترین كارانە، چونكی ل ڤێرە بزاڤەك بۆ ڕویڤیكان یا هەی، چونكی لڤینا ڕویڤیكان د هەرسكرنێدا بنیاتێ وێ میكانیكییە، و ڤێ پەردێ دویماهییێن دەماری پێن هەین، و ئەڤ پەردە ناڤەندێن لیمفاوی تێدا پێن هەین، ئەڤە وەكی كۆئەندامەكێ بەرگرییە د لەشێ مرۆڤیدا، و ئەگەر كولبوونەكا تیژ هەبیت د ڕویڤیكاندا و ڕویڤیك كون بوون، دێ پەردا بریتوانی بزاڤێ كەت دا وەكی دەرزیكەكێ (لوڤاحەكێ) چێ كەت و ڤان میكرۆبان داعویریت، و دێ مرۆڤ هەست ب ئێشانێ كەت، و ئەو ئێشانێن مرۆڤ هەست پێ دكەت د ڕویڤیكاندا ژێدەرێ وێ نەڕویڤیكن، بەلكو پەردا بریتوانییە، كو ئەو كۆئەندامێ ئێكێ پێ ئاگەهداركرنێیە، و ئەگەر كونەك د ڕویڤیكاندا چێ بوو، یان كولبوونەكا توند، و كویفكیبوون، یان وەرەمتن، ب ڤی پەردا بریتوانی كو دویماهییێن دەماری پێن تێدا دێ مرۆڤ هەست ب ئێشانێ كەت.

و هندەك ناڤەندێن بەرهەڤانییێ پێن هەین سروشتێ میكرۆبی دیاركەت، و دێ دەرمانەكێ هەڤدژ چێ كەت، و دێ میكرۆبان دۆرپێچ كەت و داعویریت، و ڤێ ئارێشێ دێ دەستنیشان كەت، ڤی كۆئەندامێ نازك دێ بینی ل دەڤ گۆشتفرۆشان د ناڤ ڕویڤیكاندا، و گرێكێن بچویكێن بلغەمێ پێن تێدا وەكی گومتلێن بەزی، ئەڤ گرێكێن بلغەمێ كۆئەندامێن بەرهەڤانییێنە و ژ پێشكەڤتیترین كۆئەندامان، وەكی سەربازان پێن

تێدا سروشتێ دژمنی ئاشکەرا دکەت، و سەربازێن شەڕکەر یێن تێدا، و کارگەهەکا گەهاندنێ یا تێدا.

و د ڤێ پەردێدا دویماهییێن دەماری یێن تێدا، هەمی ئێشانێن زکی کۆئەندامێ هشیارکرنا زوی ئامادە دکەت، و ئەڤ هەمی ڤان رژێنان کۆئەندامێ بەرەڤانییێ ئامادە دکەت ژ ڤان رویڤیکان کو ئەو د سەرەکینە د ژیانا مرۆڤیدا، بەلێ ژ بۆ حیکمەتەکا مەزن د رویڤیکاندا دەمارێن هەستکرنێ نینە، کەنگی ئێشان دهێنە ڤەگوهاستن بۆ خودانێ خۆ؟ دەمێ کونبوونەك د رویڤیکاندا چێ دبیت، دێ هەست ب ئێشانان کەین، خودێ دبێژیت: (وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ (١٥)) [محمد]، (ئانکو: ژ ئاڤەکا زێدە شارییی ڤەدخۆن، ڤێجا ڕویڤیکێت وان پرت پرت ببن).

ئەگەر رویڤیك پرت پرت بوون، دێ مرۆڤ هەست ب ئێشانێ کەت، دەمێ رویڤیك کون کون بوون دێ مرۆڤ هەست ب ئێشانێ کەت، ژ بەر ڤێ چەندێ: (وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ).

ئەڤ ئایەتە رێك دکەڤیت د گەل نویترین ڤەکۆلینێن زانستی، و ئەگەر قورئان ئاخڤتنا خودێ نەبا پێغەمبەر ﷺ نەشیا ڤێ راستییێ دیارکەت، چونکی سروشتێ سەردەمێ هاتنە خوارا قورئانێ ل دویڤ هەمی راستییێن زانستێ وی دەمی ئەڤ چەندە نەدهاتە زانین، ئەڤ پەردە کو دویماهییێن دەماری یێن گەلە هەستدار یێن هەین، مرۆڤ نەشێت هەست ب ئێشانێ بکەت ب تنێ د کاودانێ کونبوونا ڕویڤیکاندا نەبیت، و هەستکرن ب ئێشانێ د رویڤیکاندا نینە، چونکی ئەگەر مرۆڤ ئاڤا کەلاندی ژی ڤەخۆت هەست ب تشتەکی ناکەت.

کەنگی دێ وان ئێشینیت؟ دەمێ ئاڤا کەلاندی رویڤیکێن وان پرت پرت دکەت، خودێ دبێژیت: (وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ).

هەر گاڤا مرۆڤ راستییەکێ د لەشێ خۆدا ئاشکەرا دکەت، راستییا مەزناهییا خودێ ل بەر مرۆڤی زێدە دبیت، ئەڤە پەرتۆکا خودێیە، پەرتۆکا ئافرێنەرێ مرۆڤییە، و ئەو پەرتۆکە یا بریاردەر، و رێبازا بنەجهە، و رێکا راستە، ئەو رۆناهییا ئاشکەرایە، و وەریسێ ب هێز و موکومە.

# مەعیدە و هۆكاریٚ "كاسل"

ئەڤ مەعیدێ خودێ د مرۆڤیدا چێ كری، و ئاخفتنا ل سەر مەعیدەی گەلەكا درێژە، گۆتارێن گەلەك تێرا ناكەن، بەلێ دێ ل ڤێرە كورت كەین ل سەر ئێك ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ، خودێ ئەو ژی چار پەردە یێن كرینە د ڤی مەعیدەیدا، هندەك ژ ڤان تەخان تەخێن ماسۆلكەیینە، و ماسۆلكێن جودا جودا یێن تێدا، و ماسۆلكێن بازنەیی، و ماسۆلكێن راست، و ماسۆلكێن خوار (لاری)، دا هەمی گڤاشتنێن كو هاریكارییا هەرسكرنا خوارنێ دكەن دابین ببن.

تشتەكێ گرنگ د مەعیدەیدا ئەوە پتر ژ سیه و پێنج ملیۆن شلەیێن هەرسكەر یێن هەین، ب رێژا هەشت سەد شلە د هەر سەنتیمەترەكا دوجاییدا، ئەڤ شلە ئەنزیمان دەر دكەن، و ترشێ كلۆرا ئاڤێ دەر دكەت، و ئەڤ ترشە كەرستەكە هەمی تشتان هەرس دكەت، هەتا گۆشتی هەرس دكەت، و پسیارا مەزن كو هەتا نوكە بەرسڤەكا رۆهن و ئاشكەرا بۆ ڤێ پسیارێ نینە، ئەو ژی: بۆچی مەعیدە ب خۆ هەرس نابیت؟ پسیارەكا مەزنە، و بەرسڤ ل سەر ڤێ كو د مەعیدەیدا داهێنانا ئافراندنا خودێیە.

ناڤا مەعیدێ یا دۆرپێچدایە ب پەردەكا خۆلبەر ترشی و دەرهاڤێژتنێن مەعیدەی بگریت، و دیواریٚ مەعیدەی دهێتە پاراستن ژ ترشێ ناڤەندا مەعیدەی، و ترشان... د گەل هەبوونا خانەیێن دیواریٚ مەعیدەی كو كەرستەكێ سەخبێركەر بەردەوام دەردكەت، و ئەگەر تە مەعیدەك خوار دێ هەرس بیت، چونكی ژ بەر نەمانا پەردێ دەوردایێ ب دیوارێن مەعیدەیڤە، و چو دەرهاڤێژتن نەماینە مەعیدەی بپارێزیت، مەزنی و بلندی بۆ وی خودایێ ئافرێنەر و پڕ زانا.

بەلێ تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادكێشیت ئەوە هندەك زانا دبێژن: (تەپكێن سۆرێن خوینێ كو د كارگەهێن تەپكێن سۆرێن خوینێ د مەژییێ هەستییاندا دهێنە چێ كرن، ئەڤ تەپكە پێ ناگەهن، و دورستبوونا وان ناگەهیتە ئاستێ چێبوونێ ئەگەر ڤیتامینەكێ

گرنگ، ڤیتامین "ب١٢"سەرپەرشتییێ لێ نەکەت، و ژ ڤێ سەیرتر ئەوە ئەڤ ڤیتامینە نەشێت بگەهیتە خوینێ، و د مێلاکێدا عومبار نابیت، ئەگەر ئێك د گەل نەبیت، ئەو ئێك ژی کەرستەکێ پرۆتینییە خودان کێشەکا گەردیلە یا گەلەك بلندە، ڤی پرۆتینی مەعیدە دەردکەت، زانا دبێژنێ: "هۆکارێ کاسل" کو ناڤێ وی زانایە یێ ئاشکەرا کری، دەمێ مەعیدەی ئەڤ کەرستە بەردا، ئەڤ ڤیتامینێ گرنگ دشێت بچیتە د خوینێدا، و د مێلاکێدا عومبار دبیت، و دویڤدا کارگەهێن د مەژییێ هەستییاندا د هەر چرکەکێدا پترى دو ملیۆن و نیڤ تەپکێن سۆرێن خوینێ چێ دکەن).

و ئەڤ ڤیتامینێ گرنگێ عومبارکری د مێلاکێدا کو سەرپەرشتییێ ل سەر پێگەهاندنا تەپکێن سۆر دکەت، ب رێژا پێنج مللیگرامان عومبار دبیت پێنج سالان تێرا مرۆڤی هەیە، و مرۆڤ هەر سالێ مللیگرامەکی ژ ڤی ڤیتامینی دمەزێخیت، کو هۆکارێ (کاسل) یێ د گەلدا مەعیدە دەردکەت.

تشتەکێ دی، پێدڤییا مرۆڤی یا رۆژانە ژ ڤی ڤیتامینی، ژ سێ بۆ پێنج میکرۆگرامانە، و هەر میکرۆگرامەك، یەکسانە ئێك ژ ملیۆنێ ژ گرامێ، ئەگەر مەعیدێ مرۆڤی بنبڕ بوو ئەڤ هۆکارە، "هۆکارێ کاسل" دێ راوەستیت، ژ گەهشتنا ڤیتامین "ب١٢" بۆ مێلاکێ، دێ چ چێ بیت؟ کێم خوینییا پیس (فقر الدم)، کولبوونا ئەزمانی، و لاوازییا مەعیدەی، و تووشبوونا مەژی، و زەحمەتی د داعویرانێدا، سستی د چالاکییێدا، خەمگینی د دەروونیدا، و رێنجیبوون د پێیاندا، و تێکچۆنا هەڤسەنگییێ، ئەڤ هەمی نەخۆشییێن مەترسی، ژ بەر هندەك مللیگرامێن د مێلاکێدا ب دویماهی دهێن.

ئەڤە چ هویربینییە د ئافراندنا مرۆڤیدا؟! (أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى (٣٦) أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى (٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى (٣٨) فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى (٣٩)) [القيامة]، ئانکو: ئەرێ مرۆڤ هزر دکەت، هەما دێ هۆسا مینیت، بێی حسێب د گەل بێتە کرن. ما نە چپکەکا ئاڤێ بوو، کەڤتییە د مالبچویکیدا؟. پاشی بوو خوینپارە، پاشی خودێ چێ کر و دورست کر، دەست و پێ و چاڤ و گوهـ دانێ. و ژن و مێر هەر ژ وی چێکرن (ئانکو کچ و کوڕ ب دویڤ ئێخستن).

# ئامویرێ میلاکێ دەڤەرەکا پیشەسازی یا تمامە

ئەڤ میلاکا د ناڤ هناڤێن مەدا ژ نیشانێن مەزنێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا خودێ، و میلاک مەزنترین ئەندامە د هناڤاندا، و ئەگەر مرۆڤ نەشێت بێی دل بژیت پتر ژ سێ خۆلەکان، و نەشێت بێی میلاک بژیت پتر ژ سێ دەمژمێران، و میلاک دشێت خۆ چێ کەتەڤە، ئەگەر نوژدارەکێ سیرۆلۆجی (جراج) چار ژ پێنجێ میلاکێ ژێ ڤەکەت، دێ میلاک ب خۆ خۆ دورست کەتەڤە ب لەزاتییەکا حێبەتی، ژ بەر کو خودێ شیانەکا حێبەتی یا کرِییە تێدا بۆ ئاڤاکرنا خۆ، و ب لەزترین خانەیێن ژێکڤە دبن خانەیێن میلاکێنە، و میلاک ب گەلەك کاران رادبیت، هندەك دبێژن: (ب پێنج سەد کاران رادبیت)، و هندەك دبێژن: (حەفت سەد کاران)، و هندەکێن دی دبێژن: (بەلکو ب هزاران کاران). و د سەر هەمی تشانرِا تشتێ سەرنجێ رادکێشیت ئەوە هەر خانەکا د میلاکێدا رادبیت ب ڤان هەمی کاران.

ژ کارێن میلاکێ: عومبارکرنە، میلاك عومبارە بۆ خوینێ، کو هزار و پێنج سەد سەنتیمەترێن سێ جایی وەردگریت، و ئەگەر بەرتەنگییەك چێ بوو، خوین بەربوونەك، رویدانەك دورست بوو، زارِۆك بوون، دێ هۆرموونەك د رژێنا ئەدرینالدا، فەرمانا میلاکێ کەت کو پشکەکێ ژ وێ خوینا عومبارکری دەربکەت، دا ڤەرەبوویا خوینا چۆیی بکەت.

و ژ کارێن وێ عومبارکرنا شەکرێیە، و عومبارکرنا ڤەلەوییێ، و عومبارکرنا پرۆتین، و ڤیتامینان، میلاك عومبارکرنەکا خوارنێیە، ئەگەر برسەك چێ بوو، ئەگەر ڤەقەتیانەك چێ بوو ژ خوارنێ و ڤەخوارنێ ج ب دەستێ مرۆڤی بیت یان نە، ئەگەر خوین بەربوونەکا توند چێ بوو، دێ میلاك ڤەرەبووکەت، چونکی میلاك عومبارەکە بۆ کەرستێن خوارنا کو مرۆڤ پێدڤی دبیتێ، و راستییا برسێ ئەوە، کێمییا د عومبارا میلاکێدا، ئەگەر خوینا کەسەکێ برسی بهێتە سەحکرن، دێ بینن کەرستێن سەرەکی د

مشه و تمامن، ب بەلگە کو کەسێ برسی ئەگەر تووشی برسێ بوو ب هەر ئەگەرەکێ خوارنێ نەخۆت، دێ ب دەمژمێرێن درێژ مینیت بێی هەستکرن ب وەستیانێ، ژ بەر ڤێ چەندێ برس دێ هێتە هژمارتن کێماتی د عومبارا مێلاکێدا نە د خوینا دچیت و دهێت د خوینبەران و خوینهێنەراندا.

د مێلاکێدا تایبەتمەندییەکا هەی سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت، زانا دبێژنێ: تایبەتمەندییا گوهۆرینێ، چونکی د شیانێن مێلاکێدایە شەکرێ بکەتە پرۆتین، و پرۆتینی بکەتە شەکر، و شەکرێ بکەتە قەلەوی، و قەلەوییێ بکەتە شەکر، تشتەکێ حێبەتییە، و کەرستێن پرۆتینی یێن هەین، و د کاودانێن پێدڤیدا مێلاک دشێت شەکران بگوهۆریت بۆ کەرستێن قەلەوییێ، و دشێت کەرستێن قەلەوییێ بگوهۆریت بۆ کەرستێن شەکران، و ئەڤ گوهۆرینە تایبەتمەندییەکا گەلەکا گرنگە ژ تایبەتمەندییێن مێلاکێ، ئەڤە هەمی ژ بەر پاراستنا ژیانێ.

تشتەکێ دی، مێلاکێ کارێ پالاوتنێ یێ هەی: شەکر ب رێژەکا گەلەک بلند دچیتە د مێلاکێدا، و نەخاسمە ئەگەر ئێك خوارنەکا ب شەکر بخۆت، خوین ژ مێلاکێ دەردکەڤیت ب رێژا شەکرێ، کو زێدەتر نینە ژ ئێك و نیڤ ژ هزارێ، کارێ مێلاکێ پالاوتنا خوینێیە، پالاوتنا شەکرێ، و پالاوتنا قەلەوییێ، و پالاوتنا هەمی کەرستان، عومبارکرن یا تێدا هەی، و ژ عومبارێ رێژەکا گەلەك هویربین دەردئێخیت، بۆ پاراستنا وێ.

کارێ چارێ، کارێ پێکهاتنێیە، مێلاك هۆرموونێ مەهینێ چێ دکەت، و هۆرموونێ حەلاندنێ، و دەردانا ڤان دو هۆرموونان دەردانەکا گونجایە، خوین دمینیتە د ڤی کاودانیدا، ئەگەر هۆرموونێ حەلاندنێ ژ کار کەفت، دێ خوین وەکی هەرییێ لێ هێت د خوینبەراندا، و دێ مرۆڤ هەر زوی مریت، و ئەگەر هۆرموونێ مەهینێ ژ کار کەفت، دێ خوینا مرۆڤی هەمی ژ کونەکا بچویك چیت، ژ دەردانا هۆرموونێ حەلاندنێ، د گەل هۆرموونێ مەهینێ، خوین ب ڤی کاودانێ نموونەیی دمینیت.

تشتەكێ دی، مێلاك هۆرموونەكی دەردكەت ئاڤێ د لەشیدا دگوهۆریت و رێژا وێ تخویب دكەت، و ئەوێ مێلاكا وی كول بوو، تووشی ئاڤ كەڤتنێ بوو، ئەوە كو لەش ئاڤەكا زۆر عومبار دكەت، كو پترە ژ پێدڤییا وی.

ژ كارێن مێلاكێ تێكهەلكرنە، ژ بەر كو مێلاك ڤەكۆلینا سەروبەرێ ژەهرێ دكەت، یان دێ راستڤەكەت ب تێككاركرنەكا كیمیایی، و یان دێ راوەستینیت، یان دێ كەتە دەرێ ل دویڤ مەترسییا وێ و ژەهراوییا وێ، هەر وەكی یێ ب عاقلە تشتێ بڤێت بكەت، ڤێ ژەهرێ دێ سەح لێ كەت، یان دێ كەرستەكی بەردەتە سەر و ژ كار ئێخیت، یان دێ راوەستینیت، یان دێ كەتە ژ دەرڤەی لەشی، دێ د گەل میزێ بەت، ئەڤە هەمی ژ كارێن مێلاكێنە.

تشتەكێ دی، مێلاك زەركێ دەردكەت، و د هەر چركەكێدا دو ملیۆن و نیڤ تەپكێن سۆرێن خوینێ دمرن، ئەڤ خانە دمرن، و دچنە خالخالكێ، و خالخالك گۆرستانا تەپكێن سۆرە، و ل ڤێرێ ژێكڤە دكەت بۆ پشكێن وێ یێن سەرەكی، دێ ئاسنی ژێ ئینیتە دەر و چیتە كارگەها مەژییێ هەستییان، و دێ كەرستێ زەركێ وەرگریت و دێ هیموگلۆبینی بەتە مێلاكێ، و دێ بیتە زەرك، و ئەو زەركا د مێلاكێدا، ژ بەرهەمێ حەلكرنا تەپكێن سۆرێن مری یێن خوینێیە، زەرك چ دكەت؟ ڤەلەوییێ وەردگریت و هەرس دكەت، و زەرك دبیتە هاریكار بۆ لڤینا ڕویڤیكان، و ڕویڤیكان پاقژ دكەت ژ میكرۆبان، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو كەسێ زەركا وی نەمابیت، مێزتنا ڤەلەوییێ یا ب زەحمەتە بۆ وی.

كەنگی مێلاك كول دبیت؟ كولبوونا مێلاكێ، خودان بسپۆر دبێژن: (مێلاك كول دبیت دەمێ خوارن پیس دبیت، و ئالاڤێن وێ ژی پیس دبن ب ئاوێتێن دوەمی، و ل ڤێرە فەرموودێن ل سەر پاقژییێ دهێن، و ئەو فەرموودە گەلەكن یێن پێغەمبەری ﷺ بەرێ مە ب وان دایە پاقژییێ، و خۆ پاراستن ژ میزێ، و ژ هەمی تشتێن ژ لەشی دەردكەڤن، ئەڤە هەمی ژ بەر پاراستنا مێلاكێیە.

زانایان دوپات كرییە نەخۆشییا مێلاكێ ئەگەرەكێ مەزن یێ ڤێ نەخۆشییێ ڤەخوارنا مەییێیە، و مەی ماكا پیساتییایە، چونكی بارا پتر ئەو كەسێن مەیێ ڤەدخۆن مێلاكا وان

تووشی ڤێ نەخۆشییێ دبیت، و نەخۆشییا مێلاکێ ئەوە مێلاك ژ کارێن خۆ دراوەستیت، و دەمێ قورئانا پیرۆز مەی ڤەخوارن ل سەر مە حەرام کری، یا حەرامکری چونکی زیانێ دگەهینیتە مێلاکێن مە، و چەند کاودان هەنە کو ناهێنە هژمارتن مێلاك پویچ بووی، و تووشی نەخۆشییێ بوویی، ب ئەگەرێ ڤەخوارنا مەیێ، خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٩٠)) [المائدة]، (ئانکو، گەلی خودان باوەران، ب راستی مەی و قومار و بوتێت چکلاندی و دانایی (ل دۆر کەعبێ و تێدا) هەرمی و پیسن، ژ کار و عەمەلێ شەیتانینە، ڤێجا خۆ ژێ بدەنە پاش و خۆ ژێ دویر بێخن، دا هوین سەرفەراز ببن).

هوین دزانن کو د ناڤ لەشێ هەوەدا ئەڤ ئەندامێ گرنگ یێ هەی؟! ئەڤ تاقیگەهە، ئەڤ جهێ نۆبەدارییێ، ئەڤ کارگەهە، ئەڤ عومبارە.

کارێ عومبارکرنێ، کارێ گوهۆرینێ، کارێ پالاوتنێ، و کارێ پێکهاتنێ، و کارێ خلاسکرنێ، کارێ دەردانێ، ئەڤە هندەك کارێن مێلاکێنە، و هەر خانەك ژ خانەیێن مێلاکێ هەمی ڤان کاران ب تنێ ب بێدەنگی و بێ هۆسە دکەت.

ئەوە خودایێ گشت جیهانان، ئەڤە ئافراندنا وییە، هوین دچنە دەڤ گۆشت فرۆشی و ڤێ مێلاکێ دکرن، ئەڤ ئەندامێ مرۆڤ نەشێت بێی وی پتر ژ سێ دەمژمێران بژیت، خودێ دبێژیت: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ مِمَّ خُلِقَ (٥) خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ (٦) يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ (٧)) [الطارق].

ژ ئاڤەکا بێ بها یێ چێ بووی، ژ چیکەکێ (سپێرمان) مێلاك و مێشك، و ئەڤ دلە، و هناڤ، و هەردو گورچیسك یێن چێ بووین، خودێ دبێژیت: (أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ (٣٥)) [الطور]، (ئانکو: ئەرێ ئەو بێ چێکەر هاتینە چێ کرن، یان ژی وان ب خۆ، خۆ دایە؟).

ئەو خودایێ تو ئافراندی، ئەوێ بێ کێماسی و راست و دورست تو چێ کری. ئەرێ ما هەژی پەرستنێ نینە؟ ئەرێ ما نە یێ هەژییە تو حەژێ بکەی؟ ئەرێ یێ هەژی نینە

تو کاری ب فەرمانا وی بکەی، ئەرێ یێ هەژی نینە تو خۆ ژ وی تشتی بدەیە پاش ئەوێ وی فەرمانا دانەپاشییێ ژێ کری؟ ئەرێ یێ هەژی نینە تو ژییێ خۆ د گوهدان و پەرستنا ویدا ببۆرینی؟ زار ئبن مەسعود ژ پێغەمبەری ﷺ: گۆت: ((لا تزولُ قدَمُ عبْدٍ يَوْمَ القيَامَةِ حتّى يُسألَ عَنْ خمْسٍ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أفْنَاهُ، وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَ أبْلاهُ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أيْنَ اكْتَسَبَهُ؟ وَفِيمَا أنْفَقَهُ؟ وَمَاذَا عَمِلَ فِيمَا عَلِمَ؟))[1]. (ئانکو، رۆژا قیامەتێ بەندەیێ من چو پێنگاڤان ناهێت هەتا پسیارا پێنج تشتان ژێ نەهێنە کرن: ژییێ وی کا د چدا بۆراندییە، و گەنجاتییا وی کا ب چڤە بۆراندییە، و مالێ وی کا ل کیرێ ب دەست خۆڤە ئینایە، و د چدا مەزاختییە، و چ کار ب وێ یا وی زانی کرییە؟).

(١) ترمزی (٢٤١٦).

# ڤەخوارنا ساخلەم

زار ئەنەسێ کورێ مالکی: ((أنَّ النَّبيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَتَنَفَّسَ فِي الإِنَاءِ ثَلاثاً، وَيَقُولُ: ((هُوَ أَمْرأُ وَأَرْوَى))[1]. (ئانکو: پێغەمبەری ﷺ سێ جاران بهێنا خۆ دئینا و دبر دەمێ ئاڤ ڤەدخوار، و د گۆت: ((ئەو هۆسا گونجایترە و بۆ هەرسکرنێ باشترە)).

ئانکو دەمێ ئاڤ ڤەدخوار سێ جاران ڤەدخوار، و د ناڤبەرا هەر دو جاراندا هەناسە دکێشا، ل ڤێرە هەناسە دکێشا دەمێ ئاڤ سێ جاران ڤەدخوار، و دگۆت: (أروى) ئانکو: باشترین تێنك شکاندن (ئاڤدان)، و نێزیکتر بۆ (عافیەت)ێ، و (أمرأ) ئانکو: ب ساناهیترین چۆن.

و زار ئەبی هورەیرە رضي الله عنه ((أنَّ النَّبي (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَشْرَبُ فِي ثَلاثَةِ أَنْفَاسٍ، إِذَا أَدْنَى فِيهِ الإِنَاءَ سَمَّى اللهَ، فَإِذَا أَخَّرَهُ حَمِدَ اللهَ، يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ))[2]. (ئانکو: پێغەمبەری ﷺ ب سێ هەناسەدانان ئاڤ ڤەدخوار، دەمێ دەست ب ڤەخوارنێ دکر ناڤێ خودێ دئینا: (بسم الله الرحمن الرحيم)، و دەمێ ب دویماهی دئینا دگۆت: (الحمد لله) ئەڤ چەندە سێ جاران دکر.

تشتێ ب موعجیزە ئەوە دەمارەکا د لەشێ مرۆڤیدا هەی دبێژنێ دەمارا مژدار (المبهم)، ئەڤ دەمارە یا گرێدایە ب مەعیدەی و دلیڤە، و هۆشدارییەکا توند دێ زیانێ گەهینیتە ڤێ دەمارێ، بۆ نموونە: ئاڤا سار ئەگەر ئێکجاری و سەرێك مرۆڤی ڤەخوار بێی ناڤبڕ و هەناسەدان ـ وەکی فەرموودێ بەرێ مە دایێ ـ دێ بیتە هۆشدارییەکا توند بۆ دەمارا

---

(١) أخرجه الترمذي (١٨٨٤)، و ئەبو عیسا دبێژیت: ئەڤ فەرموودە یا (حسن و غریب)ـە، و نەسائی یا ڤەگوهاستی (٦٨٨٨).

(٢) تەبەرانی یا د (الأوسط)دا (٨٤٤) ڤەگوهاستی، و الكبير (١٠٤٧٥)، و سیوطي د (الجامع الصغير)دا (٥٨٦).

مژدار، و ئەڤ دەمارا مژدار چێ دبیت هۆشدارییێ بدەتە دلی و کارێ دلی راوەستیت، و گەلەك کاودانێن مرنا ژ نیشکەکێڤە یێن هەین ژ ئەگەرێ هۆشدارییەکا زۆرە بۆ ڤێ دەمارا مژدار، زانایان ناڤلێنایە دانەپاشا (النهيَ العصبي) دەماری دکێشیتە راوەستانا دلی، و چێ دبیت مرن ژ نیشکەکێڤە روی بدەت.

تشتەکێ دی، دەمێ مرۆڤ د گەرماتییەکا توندا بیت، و د زەحمەتەکا گەلەك بلنددا بیت نابیت مرۆڤ گەلەك ئاڤێ ڤەخۆت، ژ بەر کو هەتا ئامویرێن کانزایی ئەگەر تە ئاڤ گرتە سەر دێ ژێکفە بیت و شەق شەق بیت، پا دێ یا چاوا بیت بۆ مرۆڤی، خودێ دبێژیت: (فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُمْ بِنَهَرٍ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَنْ لَمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُمْ مُلَاقُوا اللَّهِ كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ (٢٤٩)) [البقرة]، (ئانکو، ڤێجا دەمێ (طالوت)ی لەشکەر (ژ باژێری) دەرئێخستی، گۆتە وان: ب راستی خودێ دێ هەوە ب ڕویبارەکی جەربینیت، ڤێجا هەچییێ ژێ ڤەخوار نە ژ (لەشکەرێ) منە، و یێ ژێ نەڤەخۆت ژ (لەشکەرێ) منە، ژ بلی هندێ کو ئێك مستەکێ ژێ ڤەخۆت (دا تێنا خۆ پێ بشکێنیت) هەمییان ژێ ڤەخوار، کەتەکا کێم نەبیت، و دەمێ (طالوت) و ئەوێت باوەری د گەل ئینایین ژ (رویباری) دەرباز بوویین گۆتن: ئەڤرۆ مە شیانا شەڕێ جالووت و لەشکەرێ وی نینە، بەلێ ئەوێت پشت راست کو دێ بەرانبەری خودێ بن، گۆتن: چەند جاران کۆمەکا بچویك ب ئانەهییا خودێ ب سەر کۆمەکا مەزن کەڤتییە؟! و خودێ د گەل سەبرکێش و بێنفرەهانە).

د کاوادانێن گەرمییا توند، و زەحمەتەکا مەزندا پێدڤییە تو ئاڤێ کێم ڤەخۆی، و بکەیە فڕ، نە ب ئێکجاری ڤەخۆی.

ئەڤە هندەك ئاراستەکرنێن تەندروستی یێن پێغەمبەرینە ﷺ، داخوازێ ژ خودێ دکەین مفایی ب وان ل مە بکەن.

# پشکا سێزدێ

## کۆئەندامێ هەناسێ

١- کارێن ب حەزا خۆ ( إرادي ) و یێن بێی حەزا خۆ ( لاإرادي ) هەناسەدان

٢- هەردو سیە

٣- قرگ ( حنجرة ) و دەرازینکا هەستەوەرگران

## کارێن ب حەزا خۆ ( إرادي ) و یێن بێی حەزا خۆ ( لاإرادي ) هەناسەدان

دهێتە گۆتن: (نێزیکبوونا گەلەك پەردەیە)، نیشانەکا دیار یا هەی بەلگەیەکا دیارە ل سەر مەزناهییا خودێ، بەلێ ژ بەر زۆرییا نێزیکبوونا وێ ژ مە هەروەکی ئەم وێ نابینین، ئەو ژی هەناسەیە.

دەمێ مرۆڤ یێ نڤستی، و هەردو سیهێن وی ب رێکخستی کار دکەن، و دیسا لێدانێن دلی، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ ب رێك و پێك کار دکەت، و کۆئەندامێ زەلالکرنێ ب هویربینییەکا حێبەتی کار دکەت.

ئەگەر کۆئەندامێ زەلالکرنێ، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ، و یێ زڤرۆکا خوینێ، و دل، و هەردو سیه ب مەڤە گرێدایبان، ئەرێ کی دا شێت گاڤەکێ نڤیت؟ یان دا گاڤەکێ کارکەت؟ یان گاڤەکێ د گەل برایێ خۆ روینیت؟

ئەڤ نیشانا مەزن، ئەڤە کارێن نە ب حەزا خۆنە، کو ب شێوەکێ حێبەتی کار دکەت، ب هویربینییەکا پشتی وێ هویربینی نەبیت، و ب حیکمەتەکا پشتێ وێ چو حیکمەت نەبن، و ب رێڤەبرنەك و هزرکرنەکا پشتی وێ رێڤەبرن و هزرکرن نەبن.

زانا دبێژن: (ناڤەندێن کریارێن نە ب حەزا خۆ یێن هەین کۆنترۆلی د لێدانێن دلیدا دکەن، و خلولاهییا هەردو سیهان، و کریارا هەرسکرنێ، و کریارا دەردانا هۆرموونان، و گەلەك کارێن دی کو خودێ ب تنێ دزانیت؛ وەکی کارێن کورە رژێنان، و پەنکریاسێ، و مێلاکێ، و ئەدرینالی، و پەریزادێ، و ژێر مەژی، و هەڤسەنگییا گەرمییێ، و هەڤسەنگییا شلەیان، و هەڤسەنگییا لێدانێن دلی، و گەلەك کارێن دی ب شێوێ نە ب حەزا خۆ دهێنە کرن).

زانا دبێژن: (د لاکێشە مەژیدا کو یا ل پشکا ژێری ژ قەدا مێشکی، گرێکا ژیانێ، د ڤێ گرێکێدا ناڤەندا رێکخستنا هەناسێ یا هەی، و ناڤەندا رێکخستنا لێدانێن دلی یا هەی، و دیسا ناڤەندێن لولەیان کو بەرفرەه و تەنگ دبن ل ڤێرێ، و ناڤەندا داعویرانێ، و

ڤەجوینێ، و دەنگی، و هەڤسەنگییا شەکرێ، و خوهدانێ، و تفێ، و نڤستن و هشیاربوونێ، و ناڤەندا رێڤەچۆنێ، و خوّلا ژڤانێ خوین دیتنێ (حیض)، و گەرمییا لەشی، و ناڤەندا رژێنێن زێدەبوونێ (زاوزێ) د پشکا ژێری ژ ڤەدا مێشکی، دبێژنە ڤی جهی گرێکا ژیانێ، و ئەڤە گرنگترین و مەترسیترین جهە د مرۆڤیدا، ئەگەر تووشی تێکچۆنەکێ بوو هەر وێ گاڤێ دێ مرۆڤ مریت).

دا ژ ڤی کۆئەندامی ناڤەندا هەناسەدانێ وەرگرین.

د ڤی ڤەدیدا دو پنی یێن هەین؛ پنییەك بۆ هەلکێشانا هەناسێ، و پنییەك بۆ دەرکرنا هەناسێ، ئەو گازا دوان ئۆکسیدێ کاربوونی ئەوا د ناڤ خوینێدا ئاگەهییا هەلکێشانا هەناسێ و دەردانا هەناسێ دکەت، دەمێ ناڤەندا هەلکێشانا هەناسێ ئاگەهدار دکەت ناڤەندا دەردانا هەناسێ دراوەستیت، و دەمێ ناڤەندا دەردانا هەناسێ ئاگەهـ دکەت ناڤەندا هەلکێشانا هەناسێ دراوەستیت، ئەگەر هەردو پێکڤە ئاگەهدارکرن دێ کارێ وان تێك چیت، ئێك ژ وان ئاگەهـ دکەت یێ دهێتە گیرۆکرن، تشتەکێ حێبەتییە، تشتەکە دهێتە وەرگرتن ب عەقلان.

تشتەکێ دی، هەناسەکا ب حەزا خۆ یا هەی؛ مرۆڤ دشێت ب شیانا خۆ هەلکێشانا هەناسێ یان دەردانا هەناسێ بکەت، ناڤەندەك ژ مێشکی دهێت بۆ هەلکێشانا هەناسا ب حەزا خۆ و دەردانا هەناسا ب حەزا خۆ، ئەڤ ناڤەندە ئەگەر تو یێ ژێ خافل ژی بی، دێ ب شێوەکێ خۆیەتی کارکەت، ئەو چییە ڤان هەردو ناڤەندان ئاگەهدار دکەت؟ گازا دوان ئۆکسیدێ کاربوونییە د ناڤ خوینێدا، و ئەگەر ئەڤ گازە کەڤتە سەرێك، و د ناڤ خوینێدا زۆر بوو، دێ هەلکێشانا هەناسێ و دەردانا هەناسێ زێدە بیت، ئەگەر مرۆڤی لحێف ب سەرێ خۆ دادا، و ئۆکسجین د ناڤ نڤینێدا کێم بوو، و دوان ئۆکسیدێ کاربوونی زێدەبوو، داکو زێرەڤانییا خۆ بکەت، دێ خلولاهییا هەردو سیهێن وی زێدە بیت بێی هەست پێ بکەت، ئەڤ لەزاتییا هەلکێشانا هەناسێ و دەردانا وێ، ژ ئەگەرێ زێدەبوونا گازا دوان ئۆکسیدێ کاربوونییە، ئەڤ گازا زێدەبووی د ناڤ خوینێدا،

ئاگەهدارییا ناڤەندێن هەردو هەناسا دکەت، دێ بزاڤا وان زێدە بیت، و ئەم نوزانین، ئەم د خافلین، دیتنا خودێ یا بەردەوامە و خافل نابیت.

و یا بەرنیاس و خویایە: (ئەگەر گازا دوان ئۆکسیدێ کاربوونی دو ژ دەهێ زێدە بوو ژ چەندییا وێ یا رێکخستی د خوینێدا دێ هەناسە زێدە بیت، و ئەگەر کێم بوو هەر ب ڤێ ژمارێ ژ چەندییا وێ یا رێکخستی د خوینێدا، دێ هەناسە راوەستیت، ئەڤە چ هەڤسەنگییە؟ ئەگەر گازا دوان ئۆکسیدێ کاربوونی د ناڤ خوینێدا بلند بوو بێی ئاگەهییا ناڤەندێن هەناسێ بهێنە کرن، دێ مرۆڤ کەڤیتە د بێهۆشبوونێدا، پاشی دێ مریت، و ئەو کەسێن هندەك جاران  د سەرشۆییێڤە دخەندڤن ژ ئەگەرێ ب کارئینانا سۆتەمەنییا گازێ بۆ نموونە، ب چ ئەگەر؟ بلندبوونا رێژا گازا دوان ئۆکسیدێ کاربوونی د هەوایدا، و ل دویڤدا د ناڤ خوینێدا، و پاشی دێ هەناسە راوەستیت، و دێ مرۆڤ مریت.

ئەڤ هەناسە، و ئەڤ هەردو سیهە، ئەم دنڤین و سیه رێکخستی کار دکەن، و دل رێکخستی لێدانان لێ ددەت، و کورە رژێن ب کارێن خۆ یێن رێکخستی رادبن، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ دەردانێ ب رێکخستی دکەت، خودێ دبێژت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)) [الذاريات].

# هەردو سیه

ژ نیشانێن خودێ یێن بەلگە ل سەر مەزناهیا وی ئەڤ هەردو سیهەنە، کرینە د سینگێ مرۆڤیدا، و هەر ئێك ژ وان یێ گرێدایە ب دەوروبەرێ ژدەرڤە ب رێکا بۆریەکا هەوایی ئەڤ بۆریە دبیتە لق بۆ بیست و سێ لقان، هەتا ئەڤ لقە دگەهنە سیکلدانۆکێن هەوای، کو ئەڤە بچویکترین یەکە د سیهەیدا، سیکلدانۆك: تیرا وێ دەمێ یا تژی هەوا چارێك میکرونە، رۆبەبەرێ بۆریا هەوایی پێنج سەنتیمترە، هندی پارچەکا کانزاییە (پارێ کانزایی)، یان بیچەك مەزنتر، بەلێ رۆبەرێ سیکلدانۆکان حەفتێ مترێن دوجارینە، هەوای ژ بۆریەکێ وەردگریت کو تیرا وێ ژ پێنج سەنتیمتران زێدەتر نینە، ئەرێ هوین باوەر دکەن کو د سیهاندا سێ سەد و پێنجی ملیۆن سیکلدانۆکێن هەواییینە، و رۆبەرێ سیکلدانۆکان، دو هزار جارکی ژ رۆبەرێ بۆریا هەوای زێدەترە، و روبەرێ بۆریا سیهان وەکی لیرە لێ کرییە، و رۆبەرێ سیکلدانۆکێن سیهان وەکی یاریگەهەکا تێنسێ لێ کرییە، هەوا ژ بۆریەکێ ڕا بچیت، و دابەش بیتە چەڤان ب رۆوبەرێن بەرفرەه، ژ بەر گوهۆرینێ د گەل ئۆکسجینێ.

تشتێ حێبەتی ئەوە درێژاهیا ڤان لقان کو ب دویماهی دهێن ب سیکلدانۆکێن سیهان کولك دبەربەلاڤن، کولك چنە؟ وەکی موینە کو درێژاهیا ئێك ژ وان،شەش میکرونە، و تیرا وی (٢.٠) ژ میکرونێ یە، ئەڤ کولکە بەردەوام بەرەڤ سەری دلڤن، ژبۆ دەرێختنا هەمی هویرکێ هەلاویستی، و لەشێن بیانی، ئەڤ کولکە دلڤن بۆ بەرەڤ سەری ژ هزار بۆ هزار و پێنج سەد جاران د خولەکەکێدا، داکو هەمی تشتان ب دەرێخن، و رێکا هەوای دا بمینیت پاقژ و زەلال، هەتا ڤێ دەمژمێرێ نوژدارێن جیهانێ نەشیاینە سیهەکێ ب چینن، چونکی نەشیاینە ژ وان گەهاندنێن دەمارێن گرێدایی ب کولکان ڤە بزانن، ڤێ سیهێ سێ سەد و پێنجی ملیۆن سیکلدانۆکێن هەوای یێن تێدا، رۆبەرێ وێ حەفتێ

مترێن دو جارییه، و کولك یێن تێدا بۆ بەرەڤ سەری دلڤن ژ هزار بۆ هزار و پێنج سەد جاران د خولەکەکێدا، تشتێ نەهێتە باوەرکرن، ئەوە کو ئەڤ کولکە د دابەشکرینە د بۆریا هەوایدا، و د لقاندا هەتا دگەهیتە سیکلدانۆکان، ئەڤە لەشێن بیانی دەر دئێخیت، شازدە میلی د خولەکەکێدا، ئەگەر تشتەك چوو د بۆریا هەوایدا، وەکی چپکەکا ئاڤێ، ل ڤی دەمی دێ کوخین چێ بیت، کوخین چییە؟ ئەوە کو هەوا د سیهاندا دەردکەڤیت ب لەزاتیا نەهـ سەد کیلومتران د دەمژمێرەکێدا، داکو هەمی تشتان د بۆرییێدا پال بدەت.

و تشتێ ژ ڤێ چەندێ مەزنتر ئەوە کو هەناسەکرن دورست دبیت ب رێکا ئاگەهکرنا دەماری یا (نوبي)، نە ب حەزا خۆ، و ئەگەر خودێ هەناسەکرن کربا د دەستێ مەدا، دا هەلبژارتن گەلەکا ب زەحمەت بیت، ڤیابا مە نڤستن هێلابا، یان ئەگەر ئەم نڤست بایین دا مرین، و نەخۆشیەکا گەلەك کێم یا هەیی، تووشی ناڤەندا ئاگەهکرنا سیهی یا (نوبي) دبیت، لڤی دەمی مرۆڤ نەشێت چ جاران ب شەڤێ بنڤیت، و دەرمانەکێ گەلەکێ ب بها چێ کر، مرۆڤ هەر دەمژمێرەکێ دخۆت، ئانکو پێدڤییە د ناڤبەرا هەر دەمژمێرەکێ ژ خەو ڕاببیت دا حەبەکێ بخۆت، چونکی تێکارکرنا ڤی دەرمانی پشتی دەمژمێرەکێ ب دویماهیك دهێت، ئەم یێ د نیعمەتاندا کو ناهێنە هژمارتن.

# ڤرگ و دەرازینکا هەستەوەرگران

خودایێ مە د پەرتۆکا خۆیا پیرۆزدا دبێژیت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ (٤٩)﴾ [القمر: ٤٩]، (ئانکو: هەمی تشت مە ب پیڤان و قەدارە پێت داین).

خودێ هەمی تشت ب پیڤان و قەدارەکا هویربین پێن داین، ئەڤ رامانە دیسا ژ ڤێ ئاخفتنا خودێ دەردکەڤیت: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ [التغابن: ٣]، (ئانکو: ئەرد و ئەسمان بۆ هەقییێ پێت داین، و وێنە و شکل دا هەوە، و سەر و شکلێ هەوە جوان کر و باش چێکر، و زڤڕین و دویماهیکا هەوە هەر ب بال ویڤەیە).

زێدەباری بۆ رامانا هەقییێ کو ئەو تشتەکێ نەلڤە و ژ جهـ ناچیت هەڤسەنگیا وێ د گەل نە هەقییێ (الباطل) کو ژ جهـ دچیت، ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّموَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ [الحجر:٨٥]، (ئانکو: مە ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا، چێ نەکرینە ئەگەر ب هەقییێ نەبیت (ئانکو مە پێت ب دادپەروەری چێکرین، دا هەر ئێك ب کریارا خۆ بێتە جزاکرن))، و رامانەکا دی بۆ حەقیێ یا هەی، ئەو تشتێ ئارمانجدەرە کو هەڤدژە د گەل یاری پێکرنێ و بێ بهادیتنێ، خودێ دبێژیت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ (١٦)﴾ [الأنبياء: ١٦]، (ئانکو: مە ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا هەی، بێ مفا و ژ قەستا نەداینە).

و رامانا سێیێ ئەوە تشت ب هەقی پێ هاتیە ئافراندن، ئانکو ب پیڤانەکا هویربین پێ قەدارەکری ژ لایێ خۆدان زانین و پرشارەزایەکێڤە.

ئەڤ بۆریا هەوای کو ئەڤە ئامویرێ دەنگییە ل دەڤ مرۆڤی، نوژدار دبێژن: ((کونا ڤرکێ گەلەك هویربینی یا هاتیە دورست کرن، ئەگەر بەرفرەهتربا ژ یا نوکە، دا دەنگی

مرۆڤی بەرزە بیت، و ئەگەر تەنگ تربا ژ یا نوکە دا هەناسەکرن یا ب زەحمەت بیت))
یان دێ هەناسەکرن یا هێدی بیت و دەنگ بەرزە ببیت، یان دێ دەنگ بەرز بیت و هەناسەکرن دێ یا ب زەحمەت بیت، و کونا قرکێ بڤی شێوەیە یا ڤەکۆلین کرییە ب ڤەکۆلینەکا هویربین، چونکی ئەڤە ژ داهێنانا خودایێ پر زانا و خودان شیان و شارەزایە، کێ ئەڤ کونە ب ڤی قەدارەی چێ کرییە؟ خودێ دبێژیت: (صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ) [النمل: ٨٨]، (ئانکو: ئەڤە چێکرنا خودێیە، ئەوێ هەمی تشت موکوم و بنەجھ چێکری، و خودێ ئاگەھ ژ وێ هەیە یا هوین دکەن).

ئەڤە مە دبنە دەرازینکێن هەستەوەرگران، ئەڤ چاڤە د ناڤبەرا دو دەرازینکادا دبینیت، ئەگەر دیتن ژ سنورێ خۆ یێ نوکە زێدەتربا دێ ژیانامە نەخۆش بیت، دەمێ تو بەرێخۆ ددەیە وی پەرداغێ ئاڤێ یێ تو ڤەدخۆی دێ بینی یا شرین و خۆشە، بەلێ ئەگەر دەرازینکا دیتنێ پیچەك زێدەبوو و پتر با ژ هویراتیا نوکە یا سروشتی، دێ حێبەتیان بینی د ڤی پەرداغیدا؛ دێ زیندەوارن بینی، و میکرۆبێن نە ب زیان، و بەکتریان ب ژمارەکا کو نەهێنە هژمارتن، ل ڤی دەمی تە ئاڤ نەڤەدخوار، و دا رویێ حولیێ زارۆکێ بچویك بینی هەروەکی شکەفت و گوپکان، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ (٤٩)) [القمر: ٤٩].

و ئەگەر دەازینکا گوهلێ بوونێ پیچەك ژ ئاستێ خۆ بلندبوو مرۆڤ نەشێت ب شەڤێ بنڤیت، چونکی دێ بلەز هەمی دەنگان وەرگری، بەلکو دەنگێن کۆئەندامێ هەرسکرنێ بتنێ چ نەدما بگەهیتە کارگەهەکا مەزن، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دەرازینکەکا تایبەت کرییە د گوهلێ بوونا مەدا کو ژ ڤی سنوری زێدەتر نەبیت، ئەگەر هەستەوەرگرێ بەرکەڤتنە وەرگر (اللمس) زێدەبوو، دێ هەست ب کەهرەبا ڕاوەستیایی کەی دێ ژیاناتە بیتە دۆزەخ و مرۆڤی خۆ لبەر نەدگرت، و هەستەوەرگرێ بێهنێ ل دەڤ هندەك گیانەوەران ملیۆن جارکی ژ هەستەوەرگرێ بێهنێ یێ مرۆڤی پترە، و ژ بلی کو خودێ گوهلێ بوون د مەدا دورست کری، و چاڤ و دل بۆ مە چێکری، و هەستەوەرگرێ بەرکەڤتنە وەرگر دورست کری، و هەستەوەرگرێ دیتنێ، و د گەل ڤێ هەمیێ ئەڤ

هەمی هەستەوەرگرە ب چێ کرنەکا گەلەك هویربین یێن هاتینە چێ کرن ژ لایێ خودێ ڤە.

# پشکا چاردێ
# کۆئەندامێ دەرهاڤێتنێ

١- هەردو گورچیسك و شوكرا نیعمەتا وان
٢- هەردو گورچیسك كۆئەندامێ زەلالكرنا میزێنە
٣- گورچیسك و پەیوەندییا وێ ب خوێڤە
٤- میزدانك

# هەردو گولچیسك و شوكرا نیعمەتا وان

یا هاتییە ڤەگوهاستن دەمێ پێغەمبەر ﷺ ژ جهێ دەستاڤێ دەردكەڤت، دگۆت: ((الحَمْدُ للهِ الذِي أذهَبَ عَنّي الأذَى وَعَافَانِي))[1]، (ئانكو: سوپاس بۆ خودایێ تشتێ زیانێ دگەهینیتە من دبەت و من چارەسەر دكەت).

و د دوعایەكا دیدا دگۆت: ((الحَمْدُ للهِ الذِي أذاقَنِي لذَتهُ، وَأبْقَى فِي قُوَّتَهُ، وَأذهَبَ عَنّي أذَاهُ))[2]، (ئانكو: سوپاس بۆ وی خودایێ خۆشییا وێ دایە من، و هێزا وێ هێلایە د لەشێ مندا، و زیانا وی ژ من دویركری).

هەردو گولچیسك د ئێك رۆژدا ب ڤەبارێ هزار و هەشت سەد لیترێن خوینێ زەلال دكەن، و ئەگەر تو مایە حێبەتی ئەڤە حێبەتییە كو ئەڤ ژمارە ب خۆ یا د چەندین ژێدەراندا هاتی، و ئەڤ ژمارا مەزنە كو ڤێ زانیارییێ ب سەیر و (شاذ) دەردئێخیت.

ئەز د وێ باوەرێدامە كو خێزانەكا ناڤنجی ب درێژاهییا سالەكێ هندە ڤەبارێ سۆتەمەنییێ دمەزێخن.

و د هەردو گولچیسكاندا رێكەكا هویربین ژ بۆرییا یا تێدا هەی ژ یەكێن زەلالكرنێ، درێژاهییا وێ شێست كیلۆمەترن.

و د ڤان هەردو گولچیسكاندا وزەكا هەی ژ بۆ زەلالكرنێ دەه جاركیا پێدڤییا مرۆڤییە بۆ زەلالكرنێ.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئەگەر گولچیسكەك ژ كار كەڤت ژ بەر هەر ئەگەرەكی، و مرۆڤ دێ شێت ژیت ب گولچیسكەكێ ژی، ئەرێ ما ئەڤە نە ژ دلۆڤانییا خودێیە؟ چونكی

---

(١) ئیبن ماجە یا ڤەگوهاستی (٣٠١) ژ زارێ ئەنەسی.

(٢) تەبەرانی د (الدعاء)دا (٣٧٠)، و (ابن السني) د (عمل اليوم والليلة)دا ژ ئیبن عومەر، و بەیهەقی د (شعب الايمان)دا (٤٤٦٩) ژ عائیشایێ.

گولچیسك ئەندامەکێ گرنگە و مەترسییە، ئێك زێدە یا چێکری بۆ مرۆڤی، یان گولچیسکەك یا زێدەیە ژ پێدڤییا مرۆڤی.

کی ژ مە باوەر دکەت خوین ب هەمیڤە د هەردو گولچیسکاندا د ئێك رۆژدا شێت و شەش جاران دچیت.

و ئەڤ هەردو گولچیسکە ب کریارەکێ رادبن گەلەکا ئالۆزە، کو هەردو گولچیسك کەرستێن شەکرێ ژ خوینێ وەردگرن، و کانزایان، و پرۆتینان، و دهاڤێنە د خوینهێنەرا دەرڤەی خۆ ب رێکەکا رێژەیی، و یێ مایی ژ شەکرێن زێدە ژ پێدڤییا خوینێ، دهاڤێنە د میزێدا.

دەمێ مرۆڤ تووشی نەخۆشیا شەکرێ دبیت، چاوا ئەڤ چەندە دهێتە زانین؟ ژ هەبوونا شەکرێ د ناڤ میزێدا، رامانا ڤێ چەندێ ئەوە کو گولچیسك رێژەکا سیستەمی یا شەکرێ وەردگریت، و یا مایی د گەل میزێ دهاڤێژیت، و دەمێ مرۆڤی گەلەك خوێ خوار، و میزا وی هاتە سەحکرن، دێ بینین کو پشکەك ژ ڤێ خوێ د گەل میزێ یا هاڤێتی.

گولچیسك، وەکی هندەك زانا دبێژن: (رێکێ ددەتە تە تو هەمی تشتا بخۆی، و ئەگەر گولچیسك نەبا، و ئەگەر رێژا خوێ هەشت ژ هزارێ د ناڤ خوینێدا بلند ببا، دا مرۆڤ مریت)، کێ گەرنتی دایە جێهگرییا ڤێ رێژێ د خوینێدا؟ ئەو ژی هەردو گولچیسکن.

ئەو پاڤژکەرێن (پالاوگەهێن) عاقلن، وەکی هندەك زانایان سالۆخەت کری، رێژێن سیستەمی وەردگرن، و یێ مایی ژ ڤان رێژێن سیستەمی، ژ رێژێن زێدە، ژ شەکران، ژ خوێیان، ژ بەرمایکێن دەرمانان، هندەك دەرمانێن هەین د گەل میزێ دهێنە هاڤێتن، رەنگێ میزێ دهێتە گوهۆرین، ژ بەر کو ئەڤ دەرمانە کەرستەکێ غەریبە، گولچیسك ئێکسەر دەردکەت.

ئەڤ گولچیسکە کو قەبارێ وێ ژ هرمیکێ زێدەتر نینە ب بێدەنگی کار دکەت، و بێی بەرامبەر، بێی کرێ، بێی ژ کارکەڤتنا کاری، و مرۆڤ کار دکەت، و دنڤیت، و دخوینیت، و بازرگانییێ دکەت، دکریت و دفرۆشیت، و گەشتێ دکەت، و ئەڤ گولچیسکە بێ دەنگی کار دکەت، ژ بەر کو خوین سیە و شەش جاران د ئێك رۆژدا دچیتە د ناڤ هەردو

گولچیسکاندا، بەروڤاژی هندێ دەمێ مرۆڤ دشێت خوینا خۆ زەلال بکەت د گولچیسکەکا دەستکردا، و د سەر ڤێ چەندێڕا زانایان ئاشکەرا کر کو هەردو گولچیسك: دو رژێنن دەردانێن وان یێن نافخۆیینە، ئانکو هەردو گولچیسك هۆرموونان دەردکەن، پەستانا خوینێ رێك دئێخن (دپارێزن).

ئەگەر گولچیسکا مرۆڤی کول بوو دێ فشارا وی تێك چیت، و دێ ئەڤ کورچیسکە هۆرموونان دەرکەت بۆ رێکخستنا فشارا خوینێ، و دێ هۆرموونان دەرکەت دا کێم خوینی نەمینیت، و هۆرموونان دەرکەت بۆ رێکخستنا شلەیان.

و ئەگەر گولچیسك تووشی کولبوونێ بوو دێ هەڤسەنگییا شلەیان تێك چیت، و ئەگەر هەڤسەنگییا شلەیان تێك چۆ دێ ل سەر وی پێدڤی کەت ئەو ب رەخ حەنەفی و جهێ دەستئاڤێ بیت ب درێژاهییا ژیانا خۆ، ئەرێ ما ئەڤ چەندە پێدڤی ناکەت مرۆڤ سوپاسییا خودایێ خۆ بکەت ل سەر نیعمەتا گولچیسکێ؟

دەمێ پێغەمبەر ﷺ ژ دەست ئاڤێ دەردکەڤت دگۆت: ((الحَمْدُ للهِ الذِي أذهَبَ عَني الأذَى وَعَافَاني))[1].

ئەگەر گولچیسك ژ کار کەفت، و رێژا یوریا د ناڤ خوینێدا بلند بوو.. پسیارا نوژداران بکەن کا دێ چ روی دەت؟ دێ فرك (تشنج) مرۆڤی گریت، و دێ بیردانکا وی لاواز بیت، و کارێ وێ تێك دچیت، و مرۆڤ دێ تۆرە بیت ژ بێ بهاترین ئەگەر، و چێ دبیت تشتێن مالێ بشکێنیت، ئەو کەسێن گولچیسکێن وان ژ نیشکەکێڤە ژ کار دکەڤن، و رێژا یوریا د خوینێدا بلند بیت رەفتارێن غەریب ل دەڤ دیار دبن، خێزانێن وان خۆ ل بەر ناگرن، ژ بەر توندییا رەڤاتییا وان، و ژ بەر توندی و تیژییا وان، و ژ بەر توندییا تۆڕەبوونا وان بۆ بێ بهاترین ئەگەر، و دەمێ رێژا یوریا بەردەوام یا بلند بیت، دێ مرۆڤ هەر وێ گاڤێ مریت، ئەڤ هەردو نیعمەتە (هەردو گولچیسك) زێدەباری میزدانکێ، پێکڤە کۆئەندامەکێ مژدارێ گرنگ دورست دکەن.

---

(١) سبق تخریجه.

رومەتا مرۆڤی یا مەرجدایە ب ڤی کۆئەندامی، و هندەك جاران مرۆڤ د دانعەمرییێدا تووشی هندەك لاوازییێ دبیت د ماسۆلکاندا، مالا وی چ ژ وی گوهـ لێ دبیت؟ ئاخڤتنێن رەق، ئەڤێ نەشێت خۆ راگریت، هەلویستێ وی دێ گەلەکێ ب زەحمەت بیت، نیعمەتا میزدانکێ نیعمەتەکا دییە.

سوپاس بۆ خودێ ل سەر وێ نیعمەتێ کو نەمانا وێ ئێمنی بیت، و دەمێ مرۆڤ ژ جهێ دەستاڤێ دەرکەڤت بلا ڤێ دوعایێ بکەت: ((الحَمْدُ للهِ الذِي أذهَبَ عَنّي الأذَى وَعافانِي))[1] .

سوپاس بۆ وی خودایێ ئەڤ هەردو ئەندامە (هەردو گولچیسك) وەلێ کرین کو ب رێك و پێك کار بکەن، و ئەڤ سوپاسییە ل سەر نیعمەتا ساخلەمییا هەردو گولچیسکان، تەناهییەك بیت ژ کولبوونا وان، و تەناهییەك بیت ژ پویچبوونا وان، و تەناهییەك بیت ژ راوەستانا وان ژ نیشکەکێڤە.

(١) سبق تخريجه.

# هەردو گولچیسك كۆئەندامێ زەلالكرنا میزێنە

یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن دەمێ ئەو ژ جهێ دەستاڤێ دەردكەڤت وی دوعا دكر، و یا ژ ئەنەسێ كورێ مالكی هاتییە ڤەگوهاستن دبێژیت: دەمێ پێغەمبەر ﷺ ژ جهێ دەستاڤێ دەردكەڤت دگۆت: ((الحَمْدُ للهِ الذي أذهَبَ عَنّي الأذَى وَعَافَانِي))[1]، و دیسا دگۆت: ((الحَمْدُ للهِ الَّذِي أذَاقَنِي لَذَّتَهُ، وَأبْقَى فِي قُوَّتَهُ، وَأذْهَبَ عَنّي أذَاهُ))[2].

ڤێ خوارنێ و ڤەخوارنێ هێزەك و تامەك یێن تێدا، و بەرمایك، و تشتێن حێبەتی یێن د هەردو گولچیسكاندا، كورتییا گۆتنێ: ئالۆزترین كۆئەندام د لەشێ مرۆڤیدا پشتی مێشكی گولچیسكە، و د هندەك زانیارییێن سادەدا كو دهێنە هژماراتن ژ باوەرپێكرییێن ڤی زانستی كو د هەردو گولچیسكاندا دو ملیۆن یەكەیێن زەلالكرنێ یێن تێدا، ئانكو د هەر گولچیسكەكێدا ملیۆن یەكەنە، و ئەڤ یەكا زەلالكرنێ بۆرییەكا گەلەك هویربینە، و لولەیەكا گەلەك هویربین، كو د ئالاندینە ل دۆر خۆ هەتا دبیتە گولۆلكەك (تەپكەك)، ناڤێ وێ ل دەڤ زانایێن تویكارییا باگولۆلكە، ئەڤ باگولۆلكە پەردەكێ ل دۆرماندۆری وێ ب بۆرییەكێ ب دویماهی دهێت، چاوا میز دهێتە زەلالكرن؟ كریارەكا گەلەكا ئالۆزە، چاوا نە و من بۆ هەوە بەری نوكە گۆت كو ئالۆزترین كۆئەندام پشتی مێشكی گولچیسكە، و بەلگە ژی بۆ ڤێ چەندێ گولچیسكا دەستكرد (پیشەسازی) قەبارێ وێ مەزنترە ژ قەبارێ نڤێسینگەهەكا مەزن، و مرۆڤ دەمەك دڤێت بۆ زەلالكرنا خوینا وی كو پتر چوار دەمژمێران بیت، و ئەڤ زەلالكرنە ناگەهیتە هەمبەری زەلالكرنا گولچیسكا سروشتی، ئەڤ باگولۆلكە د گەل پەردە و بۆرییا خۆ، ب چاڤ ناهێتە دیتن، ئەگەر یەكەیێن زەلالكرنێ ئێك ل دویف ئێك بهێنە رێزكرن، دێ درێژاهییا وێ د هەردو

---

(١) ئیبن ماجە یا ڤەگوهاستی (٣٠١) ژ زارێ ئەنەس.

(٢) تەبەرانی د (الدعاء)دا (٣٧٠)، و (ابن السني) د (عمل اليوم والليلة)دا ژ ئیبن عومەر، و بەیهەقی د (شعب الايمان)دا (٤٤٦٩) ژ عائیشایێ.

گولچیسکاندا گەهیتە سەد و شێست کیلۆمەتران، ئەگەر رویینێن وێ ‌ێێن ژ نافدا بەلافەکەن دێ بنە هەشت مەترێن سێجایی، ژ بەر ڤێ چەندێ خوین د هەردو گولچیسکاندا دچیت ب رێکەکا درێژاهییا وێ د ئێك رۆژدا زێدەتر ژ سەد کیلۆمەتران بیت.

کێشا ڤان هەردو گولچیسکان پێکفە ژ سەد و چل گرامان زێدەتر نابۆریت، گولچیسکەکا ب تنێ رادبیت ب هندەك کاران مێشك نەشێت تێ بگەهیت کو کێشا ئێك گولچیسك زێدەتر نینە ژ حەفتێ گرامان، و ئەگەر سست بوو د کارێ خۆدا، یان ژ کارێ خۆ راوەستا دێ ژیانا مرۆڤی ب دویماهی هێت، و دێ د ژەهرێن وێدا خەندڤین، دەمێ پێغەمبەر ﷺ ژ جهێ دەستاڤێ دەردکەڤت دگۆت: ((الحَمْدُ للهِ الذِي أذهبَ عنّي الأذَى وَعَافَانِي))[١].

نەخۆشیێن هەردو گولچیسکان گەلەکن، ئەڤ کۆئەندامێ هویربین، ئەڤ کۆئەندامێ موکوم هاتییە چێکرن کو زیانێ بۆ مرۆڤی ناهێلیت ئەرێ ما تو سوپاسییا خودێ ل سەر ڤێ چەندێ ناکەی؟ دێ حالێ مرۆڤی چ بیت بێی میزدانك؟

هەر تشتێ من ل ڤێرێ بەحس کری، من بەحسێ ناڤ و نیشانان کر، و ژمارێن ب لەز داکو سەرنجا مرۆڤی راکێشیت بۆ وان کۆئەندامێن گەلەك هویربین یێن لەشێ وی پێك دئینن.

---

(١) سبق تخريجه.

# گولچیسك و پەیوەندییا وێ ب خوێڤە

ژ نیشانێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا خودێ، کو یا د ناڤ رەخێن مەدا، و د لەشێن مەدا، ئەڤ گولچیسکەیە، و لەشێ مرۆڤی نێزیکترین تشتە بۆ مرۆڤی، خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) [الذاريات: ٢١].

دەرکرنا خوێیا زێدە ئێك ژ کارێن ڤێ گولچیسکێیە، و خوێ رێژەکا هویربین یا هەی د خوینێدا، ئەگەر ڤێ رێژێ کێم کر، یا ن زێدە کر، دێ مرۆڤ تێ چیت، خوارنێ بێی حسێب دخۆت، چێ دبیت خوارنەکا سویر بخۆت، و چێ دبیت هندەك خوارنێ بخۆت خوێیەکا زێدە تێدا بیت، دخۆت وەکی دلێ وی دچیتێ، بەلێ رێژا خوێ د خوینێدا دڤێت د ناڤبەرا حەفت بۆ هەشت ژ هزارێ بیت، ئەگەر ڤێ رێژێ کێم کر یان زێدە کر مرۆڤ دێ تێ چیت، دێ ژیانا وی د مەترسیێدا بیت، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەڤ گولچیسکا ئەم ب بچویك دبینین ب کارەکێ مەزن رادبیت، گولچیسك یا بەرپرسە ژ دەرێخستنا خوێیا زێدە د خوینێدا.

گولچیسك زیرەڤانەکێ وەفادارە بۆ لەشی ژ زێدەبوونا خوێ و شەکرێ، مێشك د ڤێ چەندێدا هاریکارییا وێ دکەت کو فەرمانا دەربێخیت بۆ هەمی ئەندامێن لەشی.

ژ هویربینترین نموونێن ل سەر کارێ گولچیسکێ دەمێ مرۆڤ چەندییەکا زێدە ژ خوێ دخۆت د هندەك خوارناندا، دێ ئاماژەك بۆ مێشکی چیت کو ئەڤ خوێیە ژ راددێ وێ زێدە کرییە، و دێ مێشك فەرمانەکا هۆرموونی هنێریت بۆ گولچیسکێ ب رێکا رژێنا ژێر مەژی کو دەرکرنا ئاڤێ د کونێن پەدەکێن خۆدا راوەستینیت، د گولچیسکێدا کونێن پەدەکێن هەین ئاڤ یا تێدا، ئانکو رژێنا ژێر مەژی دێ فەرمانا گولچیسکێ کەت ب رێکا هۆرموونان کو دەرکرنا ئاڤا زێدە د کونێن خۆدا راوەستیت، بۆچی؟ چونکی خوێ چڕاتییا وێ زێدە دکەت، و دەمێ چڕاتییا خوێ زێدە بوو دێ بیتە مەترسی ل سەر مرۆڤی، ل ڤی دەمی دل دێ بانگەوازییەکێ ب رێکا هۆرموونەکێ دی بۆ کۆئەندامێ

هەرسکرنێ هنێریت دێ ئەڤ چەندە وەکەت گەلەك تێنی ببیت، و چو خوارنێن سویر نینە کو پشتی هنگی مرۆڤ پێدڤی ئاڤەکا زۆر نەبیت، ئەڤە تشتەکێ جێهگرە.

ئەڤ تێهناتییا توند مرۆڤی دکێشیتە هندێ کو ئاڤەکا زۆر ڤەخۆت، ئەڤ ئاڤە دێ هێتە ڤەگوهاستن ب دەمەکێ خەیالی (زوی) ژ مەعیدەی بۆ خوینێ، دا خوێیا زێدە هەرس بکەت، و دەمێ خوێیا زێدە هەرس کر، دێ فەرمانەکا بەروڤاژی هێت بۆ گولچیسکێ کو هەمی ئاڤا زێدە دەربکەت، ل ڤی دەمی گولچیسك دێ خوێ د ڤێ ئاڤا زێدەدا هەرس کەت، دێ هاڤێژیتە دەرڤەی گولچیسکێ، و تو نوزانی، تە خوارنەکا سویر خوار، و تە خۆشی پێ بر، و یا مایی ئەڤ ئەندامێ هویربین (گولچیسك) پێ رادبیت کو هویربینیا وێ ناهێتە زانین ب تنێ ژ لایێ خودێڤە نەبیت.

هەر کۆئەندامەکێ د مرۆڤیدا، و هەر ئەندامەکێ تێدا، و هەر هەستەوەرگرەکێ تێدا ئەگەر ئەم ل سەر راوەستین دێ حێبەتی بین، و دێ حێبەتییێن مەزن مە گرن، ئەڤ هەمی هویربینییە، و مرۆڤ یێ خافلە ژ خودێ!

تو هزر دکەی تو لەشەکێ بچویکی و د ناڤ خۆیا تەدا جیهانەکا مەزنتر یا هەی پێدڤییە تو بزانی ئەو پەرداغا ئاڤێ یا تو ڤەدخۆی و تو دەر دکەی، د کۆئەندامەکێ گەلەك هویربیندا دچیت، عەقل پێڤە حێبەتی دبیت ژ بۆ تێگەهشتنا وی بەری کو کارێ وی بزانیت، خودێ دبێژیت: ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ [النمل: ٨٨].

# میزدانك

ئەڤ میزدانکە، خودێ وەسا یا چێ کری کو دەمار د دیوارێن وێدا دانایینە، دەمێ تژی بوو، دێ دەمار هۆشدارییێ دەن، و دێ نامەکێ هنێرن بۆ سترییە مەژی کو هاتە تژیکرن، و دێ سترییە مەژی فەرمانەکێ هنێریت بۆ ماسۆلکێن میزدانکێ دێ هێتە ئێك، و فەرمانەکا دی دێ هێت بۆ کونا ژێرییا میزدانکێ، دێ ئەڤ ماسۆلکە سست بیت ئەوا کو ب بنەجهی هاتی گرتن، و دێ ڤەبیت، و چێکرنا خوجدێ حیکمەتەك یا تێدا کو پشتی ڤێ چو حیکمەتەکا دی نەبیت،، ئەڤ ماسۆلکێن سترییە مەژی فەرمان لێ کری کو بهێنە ئێك، و ئەڤ ماسۆلکا کو سترییە مەژی فەرمانا وی کری کو بهێنڤەدانێ بکەت، ئەڤ فەرمانە ناهێتە ب جهئینان ب تنێ پشتی ئاماژەك ژ مێشکی بۆ دهێت، کو ڤێ فەرمانێ ب جه بینیت، و بریاردانا ل سەر تشتی ناهێتە باوەرکرن ب تنێ ئەگەر ژ ژێدەرەکێ بلند نەهێتە ئیمزاکرن، ئەگەر تو د جهەکێ هەستیاردا بی، د کۆمبوونەکا گرنگ، و میزدانك پڕ بوو، و فەرمانەك ژ سترییە مەژی هات، و فەرمانا وێ هاتە ب جهئینان، کا پلەیا تە؟ کا کەسایەتییا تە، کا سەنگا تە؟ بەلێ ل ڤێرە فەرمانەکا حێبەتی یا هەی، ئەگەر مێشك قائیل نەبوو و رێك نەکەفت، و یێ بەردەوام بوو ل سەر ڤێ نەرازیبوونێ کو بگەهیتە وێ پلەیێ میز دەست پێ بکەت بچیتە د هەردو بۆرییێن میزێدا، دا بچیتە هەردو گولچیسکان، ل ڤی دەمی مەترسی یا هەی کو خوین هەمی ژەهراوی ببیت! ل ڤی دەمی سترییە مەژی چاڤەرێ قایلبوونا مێشکی ناکەت، بەلکو دێ فەرمانێ ل ماسۆلکێن میزدانکێ کەت، دێ هێنە ئێك، و دێ فەرمانێ ل کونا خوارێ ژی کەت، دێ ڤەبیت، و دێ میز دەرکەڤیت، و ئەڤە پاراستنەکە ل سەر ساخلەمییا مرۆڤی، ئەڤە چ نەخشەکێشانە؟ دێ ژیانا مە یا چاوا بیت بێی میزدانك؟ د هەر بیست چرکاندا دو چپك ژ هەردو گولچیسکا دهێنە خوار، ئەڤ عومبارا کو تێرا پتر ژ لیتر و نیڤا دکەت، مرۆڤ دشێت ل ترۆمبێلەکێ سوار بیت ب پێنج دەمژمێران، حەفت دەمژمێران، و تو یێ

د خوٚشترین هێمنییا خوٚدا، و کەسایەتییا خوٚ یا تامدا، خودێ دبێژیت: (أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ (٣٥)) [الطور].

کی ئەڤ ئامیرە ئافراندییە؟ ئەو خودایێ مەزنە.

گەردوون بەرفرەهترین دەرگەهە بوٚ بەرەف خودێ، تێڕا بچن، و دەرگەهێن وی د ڤەکرینە.

# پشکا پازدێ

# پێست و موی

١- جوداهییا رەنگێ مرۆڤان و پەیوەندییا ڤێ جوداهییێ ب میلانینێڤە

٢- پیری رۆناهییا باوەرداریێیە

٣- جهێن هەستان د پێستیدا

# جوداییا رەنگێ مرۆڤان و پەیوەندییا ڤێ جوداییێ ب میلانینێڤە

خودێ د پەرتۆکا خۆدا دبێژیت: (وَمِنْ آَيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ) [الروم:٢٢]، (ئانکو، ژ نیشانێت مەزناهی و دەستهەلاتا خودێ، چێکرنا ئەرد و ئەسمانان و جودایی و نەوەکهەڤییا زمان و رەنگێت هەوەیە، ب راستی ئەڤە نیشانێت ئاشکەرانە (ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتدارییا خودێ) بۆ مرۆڤێت زانا و تێگەهشتنی).

دا ب لەز ل سەر گۆتنا خودێ: (وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ) راوەستین.

یا هاتییە زانین ژ لایێ زانستیڤە: (د تەخا ژێرییا پیستی (تەخا دووێ یا پیستی) خانەیێن پیرتەڤنکی یێن هەین؛ ئانکو شێوێ ڤان خانەیان ل سەر شێوێ پیرتەڤنکێیە، و ل رەخێن وان زێدەهییێن تەنك هەنە، هژمارا ڤان خانەیان د هەر بوسەکا دوجاییدا دگەهیتە شێست هزار خانەیان).

و چو جودایی د ناڤبەرا هژمارا خانەیێن کەسێ سپی و رەشدا نینە، چونکی هژمارا خانەیان د مرۆڤێ سپیدا و د مرۆڤێ رەش یان ئەسمەردا هژمارەکا جێهگرە، بەلێ جوداییا رەنگی دەردکەڤیت ژ جوداییا تیراتییا کەرستێ رەنگین کو دبێژنێ (میلانین).

د ناڤبەرا مرۆڤێ رەنگێ وی ڤەبووی (سپی) و مرۆڤێ رەنگێ وی رەش د جوداییا ڤی کەرستێ رەنگیندا ژ گرامەکی پتر نینە، بەلێ تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە ئەڤ خانە بەرەڤ کێمییێڤە دچن ب رێژا دەه هەتا بیست ژ سەدێ هەر دەه سالان، ژ بەر ڤێ چەندێ پیستێ مرۆڤی د گەل چۆنا ژییێ وی بەرەڤ سپیتالییێ دچیت، بەلێ ل ڤێرە ئەڤە نەمەرما دیارکرنا مەیە، بەلکو تشتێ مە مەرەم پێ هەی دیارکەین پێڤەمانا

(گیرهەگرتنا) ڤی کەرستێ رەنگینە د خانەیێن پیرتەڤنکیدا ل بن پیستی، کو هژمارا وان د بوسەکا دوجاییدا پترە ژ شێت هزار خانەیان، و رێژا ڤی کەرستێ رەنگین جیناندەستنیشان دکەت د ناڤکا خانەیێدا.

بەلێ چ پەیوەندی هەیە، و چ شرۆڤەکرن هەیە بۆ گەلێن د هێلا کەمەریدا دژین کو رەنگێ وان یێ رەشە، و گەلێن ل جەمسەرێ باکووری یان باشووری دژین رەنگێ وان یێ سپییە؟ ل ڤێرە زانین و شارەزاییا خودێ دیار دبیت.

دبێژن: ژ تایبەتمەندییێن کەرستێ تاری یان رەش ئەوە تیشکا سەربنەفشی یا ب زیان دمێژیت، و ژ بەر کو تیشکا رۆژێ ل هێلا کەمەری ستوینییە و دژوارە، ئەڤ چەندەیە وەل پیستێ وان دکەت رەنگێ وان یێ رەش بیت.

و نوکە بەرەڤ ئایەتا پیرۆز، خودێ دبێژیت: (وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ) [الروم:٢٢].

ب راستی جوداییا رەنگێن مرۆڤان نیشانەکا روهن و ئاشکرایە ل سەر مەزناهییا خودێ، و پێدڤییە ئەم هویربینییێ تێدا بکەین، و ل سەر راوەستین، و وێ نهێنییا د ڤێ چەندێدا هەی ڤەکۆلین، ئەگەر تو ب چاڤێن خۆ بەرێ خۆ بدەیە سەروچاڤێن خەلکی تو نابینی رەنگێ مرۆڤەکی وەکی رەنگێ مرۆڤێن دی بیت، چێ دبیت ئەگەر تو ب کامیرێ وێنێن وان بگری رەنگێن وان نێزیکی ئێك بن، بەلێ دەمێ ئەم ب چاڤێن خۆ بەرێ خۆ بدەینێ، دێ بینین هەر مرۆڤەکی رەنگەکێ تایبەت یێ هەی، ژ بەر کو چاڤێ مرۆڤی یێ جێهگرە دشێت جوداکرنێ د ناڤبەرا هەشت سەد هزار پلەیاندا بکەت د ئێك رەنگدا! کو خودان هویربینییەکا بلندە ژ بۆ جوداکرنا د ناڤبەرا پلەیێن هویربین د رەنگیدا.

عن أبي نُضرَةَ حدَّثني مَنْ سَمِعَ خُطبَةَ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي وَسَطِ أيَّامِ التَّشرِيقِ فقَالَ: ((يَا أيُّهَا النَّاسُ ألا إنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، وَإنَّ أبَاكُمْ وَاحِدٌ، ألا لا فَضلَ لِعَرَبِيّ عَلَى أعجَمِيّ، وَلا لِعَجَمِيّ عَلَى عَرَبِيّ، وَلا لِأحمَرَ عَلَى أسوَدَ، وَلا أسوَدَ عَلَى أحمَرَ إلا بالتَّقوَى))[1]،

---

(١) أخرجه أحمد (٢٣٥٣٦).

(ئانكو، زار ئەبی نەزرەی دبێژیت: ژ وان كەسێن ل رۆژێن (التشریق)دا گوهـ ل گۆتارا پێغەمبەری ﷺ بوویی گۆتە من، پێغەمبەری ﷺ گۆت: گەلی مرۆڤان بزانن خودایێ هەوە ئێكە، و بابێ هەوە ئێكە، بزانن عەرەبی چو رێزەكا بلند ل سەر كەسێ نەیێ عەرەب نینە، و نەیێ عەرەب چو رێز ل سەر یێ عەرەب نینە، و یێ رەنگێ وی سۆر چو رێزەكا بلند ل سەر یێ رەنگێ وی رەش نینە، و یێ رەش ل سەر یێ رەنگێ وی سۆر نینە، ب تنێ د تەقوایێدا نەبیت ( ئانكو یێ ژ هەمییان پتر ژ خودێ دترسیت).

و ژ زار ئەبی هورەیرە گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((إِنَّ اللهَ لا يَنظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ))[1]، (ئانكو، ب راستی خودێ بەرێ خۆ نادەتە رەنگ و مالێ هەوە، بەلكو بەرێ خۆ ددەتە دل و كارێن هەوە).

خانی مالە، و ترومبێل مالە، و ((إِنَّ اللهَ لا يَنظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ)).

---

(١) موسلم (٢٥٦٤)، و ئەحمەد (٧٨١٤).

# پیری رۆناهییا باوەردارییە

ژ وان پێزانینێن ل سەر ئافراندنا مرۆڤی ئەوە د سەرێ هەر مرۆڤەکیڕا ژ سەد هزار هەتا دو سەد و پێنجی هزار موی یێن هەین، و ژییێ ئێك موی پتر ژ سێ سالان ڤەدکێشیت، و مرۆڤ پێدڤی ب دو سەد رۆژان هەیە هەتا موییێن سەرێ وی نوی دبنەڤە، و د لەشێ مرۆڤیدا کارگەهێن موییان یێن هەین ب هژمارا موییێن لەشێ وی، و هەر موییەکی کارگەهەك یا هەی، ڤی موی بەرهەم دئینیت و گەشە دکەت هەتا دگەهیتە رادەکی، پاشی پیر دبیت و دمریت.

و هەر موییەکی خوینهێنەرەك و خوینبەرەك یێ هەی بۆ خوارنێ، و ماسۆلکەك بۆ لڤاندنێ، ئەڤ ماسۆلکە د دەمێ سەرماییێدا کار دکەت، و هەر موییەکی دەمارەك یا هەی دلڤینیت دا راست ببیت، و هەر موییەکی رژێنەکا دوهنی و رژێنەکا بۆیاغێ یێن هەین، و هەتا نوکە ڤەکۆلەر نوزانن، بۆچی موی سپی دبیت؟! بەلێ هندەك ژ وان د نویترین ڤەکۆلیندا دبێژن: (سپییاتییا موی ـ پیری ـ ژێدەرێ وێ یێ دەمارییە، کو تەپکێن سپی یێن خوینێ دچن بۆ موی دێ بۆیاغا موی یا رەش خۆن)، و تشتێ ڤەبڕ ئەوە کو پیراتی وەکی زانا دبێژن: (نەخۆشییەکا پیستییە خودان ژێدەرەکێ دەماری یێ تێکئارییانێیە).

و قورئانا پیرۆز ئەڤ راستییە بەری هزار و چوار سەد سالان یا گۆتی، خودێ دبێژیت: (فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِنْ كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا) [المزمل:١٧]، (ئانکو: ئەگەر هوین باوەرییێ نەئینن، دێ چاوا خۆ ژ ئیزا و نەخۆشییا رۆژەکێ پارێزن، بچویکان پیر دکەت).

پیراتی ژ ترسەکا تێکئارییانێ دورست دبیت، ((عن ابن عباس قال: قال أبو بكر الصديق رضي الله عنه: يا رسول الله قد شبت، قال: شيبتني هودٌ والواقعةُ والمرسلاتُ وعم يتساءلونَ واذا الشمس كورت))[1]، (ئانکو: زار ئیبن عەباسی گۆت: ئەبو بەکری ﷺ

---

(١) ترمزی (٣٢٩٧)، و تەبەرانی د (الكبير)دا (٧٩٠)، ب گۆتنا: ((شيبتني هود وأخواتها)).

گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو پیر بووی، پێغەمبەری گۆت: سۆرەتا (هود، والواقعة والمرسلات وعم يتساءلون واذا الشمس كورت... ئەز پیرکرم).

سۆرەتا هوود بوو ئەو پیر کری، چێ دبیت ژ بەر ئایەتەکا د ڤێ سۆرەتێدا بیت، ئەو ژی خودێ دبێژیت: (فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) [هود:١١٢]، (ئانکو: رێکا خودێ بگرە و خۆ سەرڕاست بکە، هەر وەکی ئەمرێ تە و ئەوێت تۆبە کرین د گەل تە هاتییە کرن، و نەدەنە سەر تخویبێت خودێ و ب ڕاستی ئەو ب کار و کریارێت هوین دکەن بینەرە).

و د گەل چۆنا ژییێ هەر مرۆڤەکی تووشی وەستییانا دەماری دبیت، و ب پلەیێن ژێك جودا یێن پیرییێ: خودێ دبێژیت: (اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ) [الروم:٥٤]، (ئانکو: خودێ ئەوە یێ هوین ژ لاوازییێ (ئانکو ژ چیکەکا ئاڤێ) چێ کرین، و پشتی وێ لاوازییێ هوین ب هێز ئێخستن (مەخسەد هێزا تۆلازینییێ)، و پشتی ب هێزخستنا هەوە هوین لاواز و پیر کرن، ئەوی چ بڤێت چێ دکەت و ئەو یێ زانا و خودان شیانە).

پیری باراپتر یا د گەل ب ناڤ سالڤەچۆنا مرۆڤیڤە، و ئیمامێ قورتوبی پەیڤا (النذیر) د گۆتنا خودێدا راڤە دکەت: (وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ) کو پیراتییە[1] و ئەڤە بەرێخۆدانەکا جوانە ژ بال خودێڤە، ئەو ژی هەی بەندێ من چاڤپێکەڤتن نێزیك بوو، تە چ بۆ ڤێ چاڤپێکەڤتنێ ئامادە کرییە؟! بەندەیێ من دیتنا تە لاواز بوو، و سەرێ تە سپی بوو، و پشتا تە خوار بوو، شەرمێ ژ من بکە، ئەز شەرم ژ تە دکەم.

ل ڤێرە پسیارەکا هویربین حیکمەتا خودێ دوپات دکەت: بۆچی موییێن سەری درێژ دبن، و موییێن برو و مژیلانکان درێژ نابن؟! بۆچی موی د دفنێدا شین دبن و د ناڤ دەڤیدا شین نابن؟! و بۆچی شین دبن ل سەر پشتا دەستی و ل پانکا دەستی شین نابن؟!

فوا عجباً كيف يُعصى الإلهُ    أو كيف يجحدُه الجاحدُ
و في كلّ شيءٍ له آيةٌ    تدلُ على أنّه واحدُ

---

(١) تەفسیرا قورتوبی (٢٧٦/٧).

# جهێن هەستان د پیستیدا

خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا (٥٦)﴾ [النساء]، (ئانكو: ب ڕاستی ئەوێت باوەری ب نیشان و ئایەتێت مە نەئینایین، ئەم دێ وان هاڤێژینە د ناڤ ئاگریدا، هەر گاڤەکا چەرمێ (پیست)ێ وان سۆت و هاتە براشتن، ئەم دێ چەرمێ وان ب هندەك چەرمێ دی گوهۆرین دا تامکەنە ئیزایێ، ب ڕاستی خودێ یێ زال و کاربنەجهە).
هویربینیێ د ڤێ پەیوەندییێدا بکەن: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ﴾.

هەر وەکی ئەڤ ئایەتە ئاماژێ ب هندێ ددەت کو جهێن هەستپێکرن ب ئێشانێ و نەخاسمە ئێشانا سۆتنێ یێن د پیستیدا، و دا ئەو عەزابێ ببەن: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ﴾.

زانا دبێژن: (پیست ژ دو تەخان پێك دهێت، تەخا سەرڤە یا پیستی، ئەڤ تەخە ستویراتییا وی زێدە دبیت ل دویڤ جهێ وی د لەشیدا، و ل دویڤ تێکهوسوینا وی، و ل دویڤ ژینگەهێ، و ئەڤ تەخە ب خۆ ژی ژ سێ تەخا پێك دهێت، تەخا بلندا ژ دەرڤە، و ناڤین، و ژێری، و تەخا دووێ تەخا ژێری یا پیستییە، د ڤێ تەخێدا تشتێ حێبەتی یێ هەی، کو پێك دهێت ژ شانەکێ، و مولولەیێن خوینێ یێن تێدا، و دویماهیێن دەماری، و هندەك رژێن یێن هەین دوهنی دەردکەن، و رژێنێن خوهێ، و جهەکێ دوهنی ل ژێریا ڤێ تەخێ، و تەخا ژێری تەخەکا کاریگەر و چالاکە د پیستیدا).
ئەگەر مرۆڤ د کەش و هەوایەکێ گەرمدا بیت دێ رژێنا پەریزادێ هۆرموونان هنێریتە خانەیان، دێ چالاکییا وان زێدە بیت، و ژ زێدەبوونا چالاکییا وان دێ چەندییا گەرمێ ئەوا ئەڤ خانە بەلاڤ دکەن زێدە بیت، و ب ڤێ چەندێ لەش دێ د گەل کەش و هەوایێ گەرم گونجیت.

ئەڤە تشتەکێ ژ خەیالێ سەیرترە، ئەگەر مرۆڤ د کێش و هەوایەکی کو پلەیا گەرمییا وی چلا سەدیدا بیت، دێ چ د لەشێ مرۆڤیدا روی دەت؟ هندەك زانا دبێژن: (دو سەد هزار تەنوکێن بەربەلاڤ د پیستیدا یێن هەین، دەمێ پلەیا گەرمێ بلند دبیت و ژ رادەیێ بەرئاقل دەردکەڤیت ئەڤ تەنوکە دێ ئاماژێن دەماری هنێرن کو رویشالێن دەماری ڤەدگوهێزن بۆ مێشکی، و مێشك دێ فەرمانێ دەت بۆ بەرفرەهکرنا خوینبەرێن هویر د هەمی لایەکێ لەشیدا، و دەمێ پلەیا گەرمێ بلند دبیت، رەنگێ مرۆڤی بەر ب سۆراتییەکا ڤەبوویڤە دچیت)

# پشکا شازدێ

# کۆئەندامێ بەرگرییێ

١- تەپکێن سۆربێن خوینێ
٢- چارەسەربوونا خۆیەتی
٣- ڤەگرتن نینە

# تەپكێن سۆر يێن خوينێ

نينە زەلامەك يان ئافرەتەك و بچويكەك يان مەزنەك، خوين د خوينبەر و خوينهێنەرێن ويدا نەهێت و بچيت، و چێ دبيت مرۆڤ نەزانيت كا ئەڤە چ خوينە؟ و پێكهاتا وێ چييە؟ و قەبارێ وێ چەندە؟ و نهێنييێن وێ چنە؟ دەمێ تشتەك ل سەر راستييا وێ خوينا د لەشێ مرۆڤيدا دهێت و دچيت زانى، دێ دلێ وى ملكەچ بيت، و دێ سوجدێ بۆ خودێ بەت.

كى ژ مە باوەر دكەت د لەشێ هەر ئێكى ژ مەدا، زێدەترى بيست و پێنج مليۆن مليۆن تەپكێن سۆرێن خوينێ يێن هەين، وەكى پشكەكا سەرەكى د خوينا مەدا، و دهێت و دچيت د خوينبەر و خوينهێنەرێن مەدا، و هژمارا ڤان تەپكان د هەر ملليمەترەكا سێجاييدا كێمتر نينە ژ پێنج مليۆنان.

تەپكێن سۆر وەسا سالۆخەت دكەن، كو ئەو هەلگرن و وەستيانێ نوزانن، ئۆكسجينى دهەلگرن و دبەنە خانە، و شانە، و ئەندام، و كۆئەندامان، و دبەنە هەر جهەكێ د لەشێ مرۆڤيدا، و دزڤريت ب ئەنجامێن سۆتنێ، گازا داوان ئۆكسيدێ كاربۆنى ($CO_2$) دەر دكەت، كو ئەو هەلگرن نە وەستيانێ و نە بێزارييێ و نە زەحمەتێ نوزانن، ئەڤ تەپكە د لەشيدا هزار و پێنج سەد جاران د رۆژەكێدا دهێن و دچن.

و ژيێ ڤێ تەپكێ پترە ژ سەد و بيست رۆژان، و پاشى دێ مريت، د ماوێ ڤى ژييدا، پتر ژ هزار و سەد و پێنجى كيلۆمەتران دبڕيت د لەشێ مرۆڤيدا، و پتر ژ شەش سەد ليترێن ئۆكسجينى ڤەدگوهێزيت، و تيرا وێ ژ حەفت ميكرونا پتر نينە.

ئەگەر ئەم ڤەكۆلينێ د پێكهاتا ڤێ تەپكا سۆردا بكەين دێ بينين ژ پێنج سەد و حەفتێ و چوار ترشێن ئەمينى پێك دهێت، و ئەڤە دهێنە چێكرن د پێنج رۆژاندا، يان كێمتر ژ

ڤێ چەندێ، و دهێتە چێکرن د کارگەهاندا، کو ئەو ژی مەژییێ هەستیانە، و نیڤا هەستی کارگەهەکە تەپکێن سۆر بەرهەم دئینیت، کی ژ مە باوەر دکەت ئەڤ کارگەهە د هەر چرکەکێدا دو ملیۆن و نیف تەپکێن سۆر چێ دکەت، و چالاکترین کارگەهـ، بڕبڕا پشتێیە، پاشی هەستییێن پەراسییان، پاشی هەستییێ قەفەسا سینگی یا سەرەکی، پاشی هەستییێن رەخان (دەست و پێیان).

و خودێ وەسا لەشێ مرۆڤ چێ کرییە هندەك کارگەهێن یەدەك هەبن، ئەو ژی مێلاك و خالخالکە، و دەمێ کارگەهێن سەرەکی راوەستان، دێ مێلاك و خالخالك کارکەن ژ بۆ بەرهەمئینانا تەپکێن سۆر.

تشتەکێ گەلەکێ گرنگ.. ئەو ژی د هەردو گولچیسکاندا ناڤەندەکا هەی بۆ پالاوتنا خوینێ کار دکەت ل سەر زێرمڤانییا خوینێ ب شێوەکێ بەردەوام، و دەمێ خوین ژ ئاستێ خۆ یێ سروشتی کێم بوو دێ ئەڤ ناڤەندە فەرمانێن خۆ پێن هۆرموونی هنێریت بۆ کارگەهێن خوینێ، دێ هاندانا وان کەن کو بەرهەمی زێدەکەن، و دەمێ خوین ژ راددێ خۆ یێ سروشتی بۆری، دێ ئەڤ ناڤەندا د هەردو گولچیسکاندا فەرمانێن هۆرموونی هنێریت بۆ کارگەهێن تەپکان، دێ فەرمانێ لێ کەت سستییێ د بەرهەم هێنانێدا بکەت؛ ژ بەر ڤێ چەندێ پەیوەندییەك یا د ناڤبەرا فشارێ و کولبوونا هەردو گولچیسکاندا هەی، ئەڤە چ پەیوەندییە؟ چونکی د هەردو گولچیسکاندا ناڤەندەکا گەلەك هەستییار یا هەی، زێرمڤانییەکا بەردەوام د چەندییا خوینێدا دکەت.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئەگەر خوین ب رێیا (حجام)ێ هاتە کێشان، دێ خوین د خوینبەراندا کێم بیت، و کێمبوونا وێ د خوینبەراندا دێ وەل ناڤەندا پالاوتنا خوینێ کەت فەرمانا کارگەهێن خوینێ بکەت دا چەندییەکا خوینا زێدە چێ کەت، و ب ڤێ دێ کارگەهـ چالاك بن، و کارێ وان دێ باش بیت، ب درێژاهییا ژییێ مرۆڤی.

کێ ئەڤ سیستەمە رێکخستییە؟ کێ ئەڤ چێکرنە نەخشە کرییە؟ کێ ئەڤ رێکخستنە رێك و پێك کرییە؟ ئەرێ ما نە هەژی پەرستنێیە؟ ئەرێ ما یێ هەژی نینە گوهدارییا

وى بهێتەكرن؟ ئەرێ ما پێدڤى نینە ژێ بترسین؟ ئەرێ پێدڤى نینە ئەم تەقوایا وى بكەین؟ خودێ دبێژیت: (وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) [الذاريات: ٢١].

بابەتێ خوینێ ب گۆتارەكێ ب دویماهى ناهێت، و بەرگێن مەزن یێن هاتینە دانان ل دۆر خوینێ ب تنێ، هەتا تایبەتمەندییەكا هەى د نوژدارییێدا یا تایبەتە ب نەخۆشییێن خوینێڤە.

# چارەسەربوونا خۆیەتی

**شیانێن نوژدارییێ ـ دەرمان و تەکنیك ـ نوژدار نەشێن چارەسەرییا پتر ژ چارێك نەخۆشییان بکەن، و نەخۆشییێن دی یان ئە ب خۆ چارە دبن، یان چو چارەسەری نینە.**

**راستییا دووێ: نینە نوژدارەکی هندەك جارێن چارەسەربوونا نەخۆشییا مرنێ (عضال) بێی ئەگەرەکێ نوژداری یێ دیار نەدیتی یان نەبهیستی، چارەسەربوونا نەیا ئاشکەرا بۆ گەلەك نەخۆشییێن پیس و گران بەردەوام روی ددەن هەر ل دەمێ نوژداری پەیدا بووی، بەلێ نوژداری ل ڤێ چەندێ نەراوەستایە، چونکی هندەك ژ وان نەخۆشییان دزڤرن بۆ ئەگەرێن نەیێن زانستی، بەلێ ئەو د راستیدا دزڤرن بۆ دلۆڤانییا خودێ بۆ بەندەیێن وی، خودێ دبێژیت: (الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ (٧٨) وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ (٧٩) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ (٨٠) وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ (٨١) وَالَّذِي أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ (٨٢) رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (٨٣) وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ (٨٤) وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ (٨٥) [الشعراء]، (ئانکو، ئەوێ ئەز دایيم (ئەوە خودانێ هەمی جیهانان)، و ئەو دێ بەرێ من دەتە رێکا راست (نە بوتێت هوین دپەرێسن). و ئەوێ خوارن و ڤەخوارنێ ددەتە من (ئانکو من ب خوارن و ڤەخوارنا خۆ ساخ دهێلیت). و ئەو گاڤا ئەز نەساخ بووم، ئەو ساخی و سلامەتییێ ددەتە من، و من ساخ دکەت. و ئەوێ من دمرینیت، و پاشی پشتی مرنێ من ساخ دکەتەڤە. و ئەوێ ئەز ژێ ب هیڤی، کو گونەهێت من رۆژا قیامەتێ و جزادانێ ژێ ببەت. خودێوۆ زانین و تێگەهشتن و پێغەمبەراتییێ بدە من، و تو من (د دنیایێ و ئاخرەتێدا) بگەهینە مرۆڤێت باش و راستکار. و تو ناڤێ من ب قەنجی و باشی بهێلە د ناڤ واندا، یێت د دویڤ منرا دئێن (کو ب باشی بەحسێ من بکەن هەتا رۆژا قیامەتێ،**

ئەڤە د دنیایێدا). و تو من (رۆژا قیامەتێ) بکە ژ وێرسێت بەحەشتا پڕ خێر و بەرەکەت).

زانایەك دبێژیت: (کۆئەندامەکێ تایبەت یێ هەی بۆ چارەسەربوونا خۆیەتی، کو د ناڤەرۆکێن پەرتۆك و فەرهەنگێن نوژداریدا بەحس لێ نەهاتییە کرن، و هندەك حالەتێن نەخۆشییێن گران یێن هەین یێن چارەسەر دبن ب شێوەکێ نەیێ رۆهن و ئاشکەرا، و بێی ئەگەرەکێ دیار)، ژ ڤان کۆئەندامێن کو چارەسەربوونا خۆیەتی ب ستۆیێ خۆڤە گرتی کۆئەندامێ بەرگرییێیە، و ئەڤە ژ کۆئەندامێن هەری جوانە خودێ ئافراندی، چو جهێ تویکاری یێ جێهگر نینە، کۆئەندامەکێ گەرۆکە و یێ پرۆگرام کرییە دا هەر خانەکا غەریب بنیاسیت ژ خانەیێن نەیێن لەشی دا رابیت ب پویچکرنا وێ، و گرنگترین تشت د ڤی کۆئەندامیدا بیردانکا وی یا حێبەتییە، و ئەو چو جارا ژ بیر ناکەت، ئەو چەکەکە روی ب روی وی دژمنەکێ دبیت ب ماوەکێ درێژ، و ئەگەر کۆئەندامێ بەرگرییا وەرگر ئەڤ بیردانکا حێبەتی نەبا چو مفا ب هەمیڤە نەدبوو ژ پیتێنێ یا دژی نەخۆشییان، ئەڤ خانە خانەیێن کۆئەندامێ بەرگرییێ د مەژییێ هەستیاندا دهێنە چێکرن، و ئامادەکارییەکا تایبەت و ب هێز بۆ دهێتە کرن د رژێنا تیمۆسدا ل بن هەستییێ سینگی، و هەر وەکی ئەڤ رژێنە پەیمانگەهەکا ئامادەکرنا زۆرانبازانە، ئەڤ خانە هێلا بەرەڤانییا ئێکێنە د لەشیدا، دیسا ئەڤ خانە رادبن ب پاراستنا لەشی ژ نەخۆشییا پەنجەشێرێ، و چێ دبیت ئەڤە ژ دیارترین تایبەتمەندییێن وێ بیت، و ژ ڤان خانەیان خانەیێن سەحکرنێ یێن هەین بۆ نیاسینا میکرۆبان یان خانەیێن غەریب دێ کێرا خۆ هەلگرن، و دێ ب ڤێ کێرێ بەرەڤ خانەیێن چێکری چن دا چەکەکێ وێرانکەر بۆ وێ چێکەن، و هندەك ژ ڤان خانەیان دەرمانێ هەڤدژ دورست دکەن، و هندەك ژ وان خانێن شەرکەرن ڤی چەکی دهەلگرن، و دچنە جهێ شەڕی دا دەست ب سەر ڤی میکرۆبیدا بگرن، و هندەکێن دی خانەیێن داعویرانێنە، ئەڤ خانە هێرشێ دکەنە ڤایرۆسێ ئایدزێ و پویچ دکەن، ژ بەر ڤێ چەندێ نەخۆشییا ئایدزێ مەترسیترین نەخۆشییە تووشی مرۆڤایەتییێ بوویی نوکە، کو ئەڤ نەخۆشییە دبیتە

ئەگەرێ وێرانکرنا کۆئەندامێ بەرگرییا وەرگر، ئەوێ ب چارەسەربوونا خۆیەتی رادبیت.

ژ سەیرترین کارێن ڤان خانەیان، و ئەڤە مزگینییەکە بۆ وی کەسێ دڤێت کێشانا جگارا بهێلیت کو هندەك دچن بۆ هەردو سیهان، و هندەك ژ وان تشتێن ماینە ب هۆبێن هەواییڤە د هەردو سیهاندا شوینێن وان دادعویرن و ناهێلن، و بەرمایکێن جگارەکێشانێ.

و تشتێ نوی د ڤی کۆئەندامیدا ئەوە هندەك خانەیێن هەین ژ پێکهاتێن کۆئەندامێ بەرگرییا وەردگرن یێن هاتینە ئاشکەراکرن ل دویماهییا سالێن حەفتێیان، ئەڤ خانە د زکماکدا د کوژەکن، ئانکو ئەو دشێن خانەیێن نەڤۆلە (شاذ) بنیاسن بەری دەس ب نەڤۆلەییا خۆ بکەن، یان ئەوێن دبنە ئەگەرێ وەرەمەکێ.

و گرنگترین تشت د ڤی بابەتیدا ئەوە ل دۆر کۆئەندامێ بەرگرییێ هێزەکا دەرڤەی لەشی یا هەی چو پەیوەندی ب بەرگرییێڤە نینە، چێ دکەت، و پێشڤە دبەت، و فەرمانێ لێ دکەت، ئەڤ هێزا زال ل سەر نە ژ ناڤخۆیا لەشییە بەلکو ژ دەرڤەی لەشییە، و نوژدارێن رۆژئاڤا نوزانن ئەڤ هێزە چییە، ئەو هێزا خودێیە.

و راستییا زانستی کو خەمۆکی و مەلویلی و دلتەنگی و توندییا دەروونی، هێزا ڤی کۆئەندامی لاواز دکەن، و هیڤیبوون و ڤیان و بێدەنگی شیانێن ڤی کۆئەندامی زێدە دکەن، ژ بەر ڤێ چەندێ هەڤپشکی بۆ خودێ ڤی کۆئەندامی لاواز دکەت، خودێ دبێژیت: (فَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ) [الشعراء:٢١٣]، (ئانکو، چو پەرستییان د گەل خودێ نەپەرێسە (و بۆ نەکە هەڤپشك)، ئەگەر دێ بییە ژ وان یێت ب بەر ئیزایێ دکەڤن (ئانکو هەی موحەممەد، تو ژ خۆشڤیترین بەندەیێن منی، بەلێ د گەل هندێ ژی، ئەگەر تو پەرستییەکێ دی ژ بلی من بپەرێسی، دێ تە ئیزادەم).

و مرۆڤێ باوەردار فەرمانا وی رادەستکرن و راسپاردن و پشت بەستن و باوەرییە ب گۆتنا خودێ: (وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) [هود:١٢٣]، (ئانکو، زانینا غەیبا ئەرد و ئەسمانان ل دەڤ

خودێیه و هەمی کاروبار دێ ب بال ویڤه زڤڕن، ڤێجا وی بپەرێسه و خۆ هلپەسێره وی، و پشتا خۆ ب وی گرێده، و خودایێ ته ژ کار و کریارێت هوین دکەن نەیێ بێ ئاگەهه).
ئێکتاپەرێسی ساخلەمییه، چونکی رازیبوون و ئێمنایی و رەحەتی و باوەری ب خودێ و گەشبین ب پاشەرۆژێ، ئەڤه هەمی کۆئەندامێ بەرگرییێ ب هێز دئێخیت، ئەوا خودێ چارەسەربوونا خۆیەتی پێ سپاردی، بەلێ دودلی و ترس و نەڤیان ئەڤه کۆئەندامێ بەرگرییێ لاواز دکەن، و ئەڤ کۆئەندامه رها ساخلەمییا مرۆڤییه.

# ڤەگرتن نینە

بابەتێ ڤەگرتنێ پێغەمبەری ﷺ بەری چواردە سەدان پتر بێ دیارکری، د سەحیحا بوخاریدا زار ئەبی هورەیرە رضي الله عنه گۆت: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: ((لا عَدْوَى، وَلا صَفَرَ، وَلا هَامَةَ))، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ فَمَا بَالُ إِبِلِي تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ، فَيَأْتِي الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ بَيْنَهَا فَيُجْرِبُهَا؟ فَقَالَ: ((فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ؟))[1]، ئانکو: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: ((نە ڤەگرتن و نە مار و نە بێ ئیفلەحی و بێ وەغەری هەیە))، ئانکو: چو ئێش بێی حەزکرنا خودێ نابن، ئینا ئەعرابییەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ پا ئەو چییە حێشترێت من هەکو د ناڤ خیزیدا بن دێ بێژی خەزالن وەسا پاقژ و بزوین و ب هێزن، و ئەگەر حێشترەکا گوری چۆ د ناڤدا دێ هەمییا گوری کەت؟ گۆتێ: ((ئەو کار و حەزکرنا خودێیە))، پێغەمبەر ﷺ ژ دەڤ خۆ نەدئاخفت، بەلکو ئەو وەحی بوو بۆ دهات، دبێژیت ((لا عَدْوَى)) ئانکو ڤەگرتن نینە، و ڤەگرتن یا جێهگرە، ئەرێ ما د فەرموودەکا دیدا نابێژیت، زار ئوسامە کورێ زەیدی بۆ سەعدی دئاخڤیت ژ زارێ پێغەمبەری ﷺ دبێژیت: ((إِذَا سَمِعْتُمْ بِالطَّاعُونِ بِأَرْضٍ فَلا تَدْخُلُوهَا، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلا تَخْرُجُوا مِنْهَا))[2]، (ئانکو: ئەگەر هەوە های ژ نەخۆشییا تاعوونێ بوو ل جهەکی نەچنە وێرێ، و ئەگەر ل جهەکی ئەڤ نەخۆشییە چێ بوو و هوین ل وی جهی بوون ژێ دەرنەکەڤن)، بۆچی؟ ژ بەر ڤەگرتنێ، و نویترین ڤەکۆلینا د زانستێ میکرۆباندا ئەوە کو ڤەگرتن نینە، و میکرۆب، چێ دبیت ژ کەسەکێ نەخۆش بهێتە ڤەگوهاستن بۆ کەسەکێ دورست، و ئەڤ کەسێ دورست نەخۆش نەبیت، و چێ دبیت ژ کەسەکێ دورست بهێتە ڤەگوهاستن بۆ کەسەکێ دی یێ دورست و کەسێ

---

(١) بوخاری (٥٣٨٧)، موسلم (٢٢٢٠)، ئەبو داوود (٣٩١١)، ئەحمەد (٧٦٠٩).

(٢) بوخاری (٥٣٩٦)، موسلم (٢٢١٨)، ئەحمەد (٢١٨٤٦).

دورستێ دووێ نەخۆش بیت، و چێ دبیت ژ نەخۆشەکی بچیتە دورستەکی، و ئەڤ میکرۆبە ببیتە ئەگەرێ بەرگرییێ هێزا وی زێدە بکەت، و چێ دبیت ژ دورستەکی بۆ دورستێ ئێکێ، و یێ دووێ، و سێیێ، و چوارێ، و پێنجێ، و دەهێ بچیت، دێ دورستێ دەهێ تووش بیت و نەخۆش بیت.

و دەمێ پێغەمبەری ﷺ گۆتی: ((لا عَدْوَى، وَلا صَفَرَ، وَلا هَامَةَ))، ڤەگرتن نەخۆشییێ چێ ناکەت، بەلێ ڤەگرتن ئەگەرێن نەخۆشییێ ئامادە دکەت، ئەڤەیە رامانا گۆتنا پێغەمبەری و دویماهییا هویربینێیە[1].

و زار ئەبی هورەیرە دبێژیت من های ژ پێغەمبەری بوو ﷺ دبێژیت: ((فِرَّ مِنَ المَجْذومِ فِرارَكَ مِنَ الأسَدِ))[2]، (ئانکو: ژ وی برەڤە یێ خوریك (جذام) لێ هەر وەکی تو ژ شێری درەڤی). هەڤدژی ب هەمیڤە د ڤێ فەرمووودێدا نینە، ب ڤەگرتنێ ب تنێ نەخۆش نابیت، بەلکو ڤەگرتن ئەگەرێن نەخۆشییێ دابین دکەن.

تشتەکێ دی یێ هەی دبێژنێ (النسمة) ئانکو بێنتەنگی، و زانایان ئەڤە شرۆڤە کرییە کو گیانەوەرێن گەلەك بچویکن دبنە ئەگەرێ بێنتەنگییێ بۆ مرۆڤی، ئانکو: میکرۆبن، و پسیار ژ هندەك زانایێن میکرۆبان هاتە کرن: کیژ جهـ د لەشێ مرۆڤیدا پتر ڤەگرتن

---

(١) حافزێ کورێ حەجەری د (فتح الباري)دا د شرۆڤەکرنا خۆدا بۆ فەرموودا (العدوى) ئانکو: ڤەگرتن (٢٤١/١٠) دبێژیت: (ل سەر وێ چەندێ کو ئەوێن هزر دکەن بۆ ڤەگرتنێ، ئانکو ڤەگرتن ئەگەرەکە بۆ گریاتییێ، و ئەڤە هزرێن نەزانانە، کو هزر دکەن دەمێ نەخۆش دچیتە د ناڤ کەسێن دورستدا نەخۆش دکەت، ئەڤ چەندە یا هاتییە ژ کارئێخستن، چونکی دەمێ گۆمان بۆ وی کەسێ ئەعرابی چێ بووی پێغەمبەری ﷺ بەرسڤا وی دا و گۆت: ((کییە ڤەگرێ ئێکێ؟)) و ئەڤ بەرسڤە گەلەکا رەوانبێژ و ئێکتاییە (الرشاقة)، و ئەنجامێ وێ: ئەڤ گریاتییە ژ کیرێ هاتییە وەکی ئەو دبێژن کو یا هاتییە ڤەگرتن؟ ئەگەر بێژم: ژ حێشترەکا دی ئەڤە پێدڤی ب زنجیرەیی هەیە ئانکو ئێك بۆ ئێکێ، یان ئەگەرەکێ دی بلا ئاشکرا بکەت، و ئەگەر بەرسڤێ بدەم کو نەخۆشێ ئێکێ ئەوە یێ دووێ نەخۆش کری، ئەو ژی کو ئەوێ هەمی ئەڤە لێ کری ئەو ئافرێنەرێ خودان شیانە ل سەر هەمی تشتان، ئەو ژی خودێیە).

(٢) بوخاری (٥٣٨٠)، ئەحمەد د موسەنەدا خۆدا (٩٧٢٠).

هەیە، گۆتن: هەر چار دەست و پێ و دێم (سەر و چاڤ)، و ئەم دبێژین: دەستنڤێژ شویشتن چییە؟ پێدڤییە ئەم دەستێن خۆ بشۆین نە د ئامانیدا، چونکی پێغەمبەری ﷺ ئەم پێن دایە پاش دەستێن خۆ د ئامانیدا بشۆین، چونکی ئەگەر میکرۆب ب دەستانڤە بن ئەڤ میکرۆبە ناچنە د ئاڤا ئامانیدا، و پێغەمبەری ﷺ یا نیشا مە دای ئەڤ کون و رێکێن میکرۆب تێڕا دچنە د لەشێ مەدا، وەکی دفنێ، و دەڤی، و هەردو گوهان، ئەڤەیە بۆ مە دورست کری د شەڤ و رۆژاندا پێنج جاران بهێنە شویشتن.

دەستنڤێژ مەزنترین پاراستنە ژ ڤەگرتنێ، دەستنڤێژ ب تنێ، ئاڤ وەردانا دەڤی، و کفکرن، و شویشتنا ناڤچاڤا، و هەردو دەستان، و هەردو پێیان.

تشتەکێ دی، فەرمان یا ل مە کری ب کارئینانا سیواکی، و نویترین ڤەکۆلین ل سەر سیواکی هاتییە کرن کو تێدا کەرستەکێ هەی یێ کوژەکە بۆ میکرۆبان، ژ بەر ڤێ چەندێ د هندەك (معجون)اندا هویرکێ سیواکی تێدا ب کار دئینن.

تشتەکێ دی: ڤەگرتن دهێتە ڤەگوهاستن ب رێکا کۆئەندامێ هەناسێ، ژ بەر هندێ پێغەمبەری ﷺ گۆتە ئێك ژ هەڤالێن خۆ، ئاڤ ڤەدخوار: ((أبِنِ القَدَحَ عَنْ فِيكَ))[1]، (ئانکو: ئامانی ژ دەڤێ خۆ بدە پاش). ژ دەڤێ خۆ دویرکە دا هەناسە نەچیتە د ناڤدا.

و پێغەمبەری ﷺ نەهی یا کری مرۆڤ هەناسێ بکێشیت دەمێ ئاڤێ ب ئامانی ڤەدخۆت، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەڤ شیرەت و ئاراستەکرنێن پێغەمبەری ﷺ بەری پتری (١٤٠٠) سالانە رێك دکەڤن د گەل نویترین بابەتێن گرێدایی ب ڤەگرتن و میکرۆبانڤە.

و زار ئەبی هورەیرە گۆت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((لا يُورَدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ))[2]، (ئانکو، کەسێ نەساخ تێکەلی یێ ساخ نەبت). نابیت نەخۆشەك پەیوەندییێ ب مرۆڤەکێ دورست (ساخلەم) بکەت، ژ بەر فەرموودا پێغەمبەری ﷺ: ((إِذَا سَمِعْتُمْ بِالطَّاعُونِ بِأَرْضٍ فَلَا تَدْخُلُوهَا))[3].

---

(١) أخرجه أحمد (١١٥٥٨)، و مالك (١٦٥٠)، زار ئەبی سەعیدێ خودری.

(٢) موسلم (٢٢٢١)، ئەحمەد (٩٢٥٢).

(٣) سبق تخريجه ص٢٤٧.

پێغەمبەری ڤەگرتن نەفی نەکرییە، بەلکو یا نەفی کری ڤەگرتن ئەگەرێ نەخۆشییێ بیت، فەرمان یا ل مە کری ئەم پاراستنێ بکەین، بەلێ ڤەگرتن ب تنێ بەس نینە بۆ ڤەگوهاستنا نەخۆشییێ، چونکی گەلەك کاودانێن هەین ڤەگرتن بەسی نەخۆشبوونێ نینە، ئەڤ ئاراستەکرن و شیرەتکرنێن پێغەمبەری ژ هویربینترین ئاراستەکرنێن زانستینە، چونکی پێغەمبەر ﷺ ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت، چونکی زانیارییێن وی زانیارییێن چێکەری بوون (خودێ).

# پشكا هه‌ڤدێ

## نه‌خۆشی و نوژداری

# نوژداری د ئیسلامێدا

ئیسلام ئایینێ خۆرسکییە (فطري)، گەلەك گرنگییێ و پویتەی ددەتە ساخلەمییا لەشی، و پاقژییا نەفسێ، و هەڤسەنگییێ د ناڤبەرا ماددەی و رحێدا چێ دكەت، و پێدڤی و مفایان، و ئارمانجا وی ئەوە باشییا دنیایێ و ئاخرەتێیە، چونكی یا ئێكێ (دنیا) دەوار و پێگەهێ (مطية) یا دووێیە.

ب راستی ساخلەمییا لەشی یا پشت بەستییە ب سلامەتییا نەفسێ و بلندییا وێڤە، و یا پێنگاڤا ئێكێیە (منطلق) بۆ ساخلەمییا عەقلی و بلندبوونا وی، و خودێ ساخلەمییا لەشی، و هێزا وی، و دورستی و تەكووزییا عەقلی، و رۆناهییا وی ئەگەرێ هەلبژارتن و ژێكرتنێیە، خودێ دبێژیت: (وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوا أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) [البقرة:٢٤٧]، (ئانكو: پێغەمبەرێ وان گۆتە وان: خودێ (طالوت) بۆ هەوە ب میرینی هنارتییە، گۆتن: (گۆتنە پێغەمبەرێ خۆ) دێ چاوا بیتە میرێ مە و ئەم ژ وی هێژاتری میرینییێینە، و ئەو نەگەلەكێ ب مالە؟! (پێغەمبەری وان) گۆت: خودێ ئەو ل سەر هەوە هلبژارتییە (و خودێ ژ كەرەما خۆ زێدە زانین و قەلافەت و گەودەكێ باش ژی یێ دایێ، و خودێ ملك و مالدارییا خۆ ددەتە وی یێ وی بڤێت، ب راستی (د دلۆڤانی و كەرەما خۆدا) خودێ یێ بەرفرەهـ و زانایە).

و خودێ یا بۆ مە دیاركری هێز و ئێمانەت، و ب زمانێ سەردەمی شیان و دلسۆزی ئەڤ هەردویە پیڤەرێن دورستن كو ب ڤان ئەم كەسان دهەلسەنگینین دەمێ ئەم د هندەك كاراندا چاڤ ل وان دكەین، و ئەڤ هەردو پیڤەرە د قورئانا پیرۆزدا هاتینە، خودێ

دبێژیت: ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ [القصص:٢٦]، (ئانكو: ئێكێ ژ وان هەردو كچان، گۆت: باب ب شڤانی بگرە، ب ڕاستی یێ ژ هەمییان چێتر تو ب شڤانی بگری، ئەوە یێ ب هێز و ئەمین).

و پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((...المُؤمنُ القَويُّ خَيرٌ وأحَبُّ إلى الله مِنَ المؤمِنِ الضَّعِيفِ...))، (ئانكو: باوەرداریێ ب هێز باشتر و خۆشڤیتره ل دەڤ خودێ ژ باوەرداریێ لاواز)، و نەگۆت: مرۆڤێ ب هێز باشترە ژ باوەرداریێ لاواز، چونكی هێزی ژ بلی باوەرییێ ژ ناڤچۆنە بۆ خودانێ وێ و بۆ جڤاكی، بەلێ دەمێ هێز دچیتە د گەل باوەرییێ دێ موعجیزێن باشییان چێ كەت، و زار ئەبی هورەیرە رضي الله عنه گۆت: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلی الله علیه وسلم): ((المُؤمنُ القَويُّ خَيرٌ وأحَبُّ إلى اللهِ مِنَ المُؤمِنِ الضَعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيرٌ، احْرِصْ عَلى مَا يَنْفَعُكَ، واستَعِنْ بِاللهِ، وَلا تَعجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيءٌ فَلا تَقُلْ: لَوْ أَنّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفتَحُ عَمَلَ الشَّيطَانِ))[1]، (ئانكو، باوەرداریێ ب هێز باشتر و خۆشڤیتره ل دەڤ خودێ ژ باوەرداریێ لاواز، و خێر یا د هەردوكاندا، هشیاری وی تشتی بە یێ مفایی ل تە دكەت، و هاریكارییێ ژ خودێ بخوازە، و بێ هیڤی نەبە و دەستا نەداهێلە، و ئەگەر تشتەك ب سەرێ تە هات نەبێژە: ئەگەر من هۆ و هۆ و هۆ كربا، بەلكی بێژە: ئەڤە قەدەرا خودێیە و یا وی بڤێت دكەت، هندی پەیڤا (ئەگەر)ـە كارێ شەیتانی ڤەدكەت).

بەلكو پێغەمبەری ﷺ ساخلەمییا لەشی كرییە سێكا دنیایێ، (فَعَنْ سَلَمَةَ بْنِ عُبَيْدُ اللهِ بْنِ مِحْصَنٍ الخَطمِيِّ عَنْ أَبِيهِ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلی الله علیه وسلم): ((مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِناً فِي سِرْبِهِ، مُعَافىً فِي جَسَدِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنيَا))[2]، (ئانكو، هەچییێ ژ هەوە سپێدێ رابوو ژ مالا خۆ ئێمن بیت، و ژ

---

(١) موسلم (٢٦٦٤)، و ئیبن ماجه (٧٩).

(٢) ترمزی (٢٣٤٦)، و دبێژیت: ئەڤ فەرموودە (حسن غريب)ـە، ئەم ڤێ فەرموودێ ب تنێ ژ فەرموودا مەروانێ كورێ موعاوییەی دزانین، و ئیبن ماجه (٤١٤١).

لەشێ خۆڤە یێ ساخلەم بیت، و قویتێ رۆژا خۆ هەبیت، هەر وەكی دنییا ب بەرڤە هاتی).

و ئیمام عەلی ﷺ نەخۆشی وەسا یا سالۆخەت كری كو ژ هەژارییێ ژی نەخۆشترە، و سڤكترە ژ كوفرێ، و ساخلەمی وەسا دیار كرییە نیعمەتەكە باشترە ژ زەنگینییێ، و كێمترە ژ باوەرییێ، دبێژیت: (ألا وإِنَّ منَ البَلاءِ الفاقةَ، وأشد من الفاقة مرض البدن، و أشد من مرض البدن مرض القلب، ألا وإنَّ من النِّعَم سَعةَ المالِ، وأفضَلُ من سعةِ المال صحةُ البدنِ، وأفضلُ من صحةِ البدن تقوى القلبِ). (ئانكو: هەژاری ژ بەلایێ یە، و یا خرابتر ژ هەژارییێ نەساخبوونا لەشییە، و یا خرابتر ژ نەساخبوونا لەشی نەساخبوونا دلییە، و دەولەمەندی ژ قەنجی و كەرەمانە، و ساخلەمییا لەشی باشترە ژ دەولەمەندییێ، و تەقوایا دلی باشترە ژ ساخلەمییا لەشی).

نوژداری د ئیسلامێدا ژ نوژدارییا سروشتی، و یا دەروونی، و یا پاراستنێ، و یا چارەسەرییێ پێك دهێت.

ژ نوژدارییا سروشتی ئەوە كو كەسایەتییا موسلمانی یا پشت بەستییە ل سەر دانێ نە ل سەر وەرگرتنێ، و ل سەر مەزاختنا شیانێ نە ل سەر مەزاختنا شیانا كەسانێن دی، و ل سەر كاری نە ل سەر هیڤییێ، و ل سەر هندێ مرۆڤی یا باشتر بۆ هەڤالێ خۆ بڤێت بلا مرۆڤ پێدڤی ژی بیت، و ل سەر قوربانیدانێ بیت نە ل سەر دلخوازییێ، و ل سەر ئینكارا خۆیی نە ل سەر دوپاتكرنا وێ، و ب راستی مەزاختنا شیانێ ب خۆ ساخلەمییە، و چ تەندروستی بیت.

د هندەك كۆنگرێن نوژداریدا ئەوێن هاتینە گرێدان بۆ ڤەكۆلینا نەخۆشییێن دلی ئامادەبوویێن كۆنگرەی رێككەفتینە كو ساخلەمییا دلی د مەزاختنا شیانێدایە، و دیسا تەناهییا دەروونی، و سروشتێ سەردەمێ نوی (نوكە) تەمبەلییا ماسۆلكەیی، و تێكچۆنا دەروونی، ئەڤ هەردویە یێ ل پشت زێدەبوونا نەخۆشییێن دلی ل بارا پتری وەلاتێن پێشكەفتی یێن ژ لایێ ماددیڤە پێشكەفتی.

مەزاختنا شیانا ب خۆ ساخلەمییە بۆ دلی و لۆلەیێن خوینێ، و تەندروستییە بۆ ماسۆلکان و کۆئەندامان، و پێغەمبەر ﷺ د ڤێ چەندێدا چاڤلێکرییە بۆ مە، یا دیار بووی د هندەك جەنگێن (غزوات) ویدا ژمارا دەواران تێرا هەڤالێن وی نەدکر، فەرمان کر هەر سێ ژ وان گەرەکا سواربوونێ هەبیت، پاشی گۆت: ((أنا وَعليٌ وَأبو لُبَابَةَ عَلى رَاحِلَةٍ))، (ئانکو، ئەز و عەلی و ئەبو لوبابە دێ گەرا مە  یا سویاربوونێ پێکڤە بیت).

پێغەمبەری ﷺ خۆ وەکی هەڤالێن خۆ لێ دکر د مەزاختنا شیانان‌دا، و دەمێ گەرا وی دهات ب پێیان، داخوازا هەردو هەڤالێن خۆ دکر کو سوار ببن، و پێغەمبەر ب پێیا ب رێڤە دچۆ، ئەڤە گوپیتکا جڤاکێ ئیسلامییە، هەردووان (عەلی و ئەبو لوبابە) گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بمینە سوار، ئینا پێغەمبەری گۆتنا خۆ یا ناڤدار گۆتە وان: ((ما أنتمَا بأقْوَى مِنِي عَلى السَّيرِ، وَلا أنَا بأغنَى مِنكُمَا عَنِ الأجْرِ))[1]، (ئانکو: هوین هەردو نە ژ من بهێزترن بۆ رێڤەچۆنێ، و نە ئەز ژ هەوە زەنگینترم ژ خەلاتی).

مەزاختنا شیانا ساخلەمییە بۆ دلی و لۆلەیێن خوینێ، و ساخلەمییە بۆ ماسۆلکان و کۆئەندامان، و ساخلەمییە بۆ ژیانا جڤاکی، و موکوم کرنەکە بۆ پێگرییێن وێ، و مەزاختنا شیانا تێگەهشتنەکا دورستە بۆ راستییا ژیانا دنیایێ، کو ئەڤە مالەکا راسپاردییە، و مالا ئاخرەتێ مالەکا رێزلێنانێیە.

ئەڤە هندەك بوو د نوژدارییا سروشتیدا.

و نوژدارییا دەروونی دێ بینین کو گەلەك نەخۆشی ژ وانان یێن مرنێنە، و هندەك ژ وان د کوژەکن، وەکی نەخۆشییێن دلی و خوینبەران، و نەخۆشییێن کۆئەندامێ هەرسکرنێ، و هەردو گولچیسکان، و نەخۆشییێن دەروونی یێن دەماری ئەگەرێن وێ یێن سەرەکی دزڤرن بۆ تێکچۆن و ئارێشەیێن دەروونی کو مرۆڤێ هەڤپشکییا بۆ خودێ چێ دکەت د سەر دەمێ نویدا تووش دبیتێ، چونکی ئەوێ هەڤپشکی بۆ خودێ چێ کر خودێ ترسێ دکەتە د دلێ ویدا، خودێ دبێژیت: ﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ

---

(١) ئەحمەد د موسنەدا خۆدا (٣٩٠١)، و نەسائی د (سنن الکبری)دا (٨٨٠٧)، و حاکم د (المستدرك)دا (٤٢٩٩).

بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ) [آل عمران: ١٥١]، (ئانكو، ئەم نێزيك دێ ترس و لەرزێ ئێخينە د ناڤ دلێ گاوراندا، ژ بەر شركا وان دكر ژ نەهەقى و بێ تشتەك بۆ هەبيت، و جهێ وان دۆژەهە و چ پيسە جهە جهێ ستەمكاران).

پێشبينيكرنا موسيبەتەكێ موسيبەتەكا مەزنترە، و تو ژ ترسا هەژارييێ يێ د هەژارييەكا ديدا، و تو ژ ترسا نەخۆشييێ يێ د نەخۆشييەكا ديدا، خودێ دبێژيت: (إِنَّ الْإِنْسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا (١٩) إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا (٢٠) وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا (٢١) إِلَّا الْمُصَلِّينَ (٢٢) الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ (٢٣) وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ (٢٤) لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ (٢٥) وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ (٢٦)) [المعارج]، (ئانكو، مرۆڤ چاڤترسيايى و بێنتەنگ يێ هاتييە چێكرن. ئەگەر نەخۆشى گەهشتێ (چ نەساخى و چ هەژارى و هەر نەخۆشييەكا دى) يێ خەمگين و بێ هيڤى و ب ئاخ و ئۆفە. و ئەگەر خودێ ڤەنجى د گەل كر و دەستێ وى فرەه كر، چو ژ دەستان دەرناكەڤيت. نڤێژكەر تێ نەبن. ئەوێت ل سەر كرنا نڤێژان بەردەوام. و ئەو تێ نەبن ئەوێت بارا خودێ دئێخنە د ناڤ مالێ خۆدا. بۆ فەقير و ژار و خوازخوازۆكان. و ئەو تێ نەبن ئەوێت باوەرييێ ب رۆژا جزادانێ دئينن).

و نوژدار دبينن فشارا خوينێ د راستييا خۆدا فشارا خەمێيە، و دەمێ مرۆڤ ئاگەه ژ راستييێن ئێكتاپەرێسييێ نەمينيت، و كەڤتە د ناڤ هەڤپشكييێدا، دێ دەرگەهێن ئيزايا دەروونى بۆ ڤەبن، خودێ دبێژيت: (فَلَا تَدْعُ مَعَ اللهِ إِلَهاً ءَاخَرَ فَتَكُونُ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ) [الشعراء:٢١٣]، (ئانكو، چو پەرستييان د گەل خودێ نەپەرێسە (و بۆ نەكە هەڤپشك)، ئەگەر دێ بييە ژ وان يێت ب بەر ئيزايێ دكەڤن (ئانكو هەى موحەممەد، تو ژ خۆشڤيترين بەندەيێت منى، بەلێ د گەل هندێ ژى، ئەگەر تو پەرستييەكێ دى ژ بلى من بپەرێسى، دێ تە ئيزادەم).

و باوەرى ب خودێ كو ئافرێنەر و پەروەردەكار و رێڤەبەر... و هەمى كار و فەرمان بۆ وى دزڤرن، ئەڤ باوەرييە نەفسا مرۆڤى تژى هەستێ تەناهييێ دكەت كو ئەو بهاترين و

بەختەوەرترین تشتە د ژیانا دەروونیدا، و وێ دودلییا کو وی پویچ کەت ژ سەر رادکەت، و ئەوا کو ژیانا دەروونی دکەتە دۆژەهەکا خۆلبەرگرتن نەبیت، خودێ دبێژیت: (وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٨١) الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ (٨٢) [الأنعام]، (ئانکو، ئەز چاوا ژ وان تشتان ئەوێت هوین دکەنە هەڤپشك بترسم؟! و هوین بێ ترس و بێی هەوە بەلگە و نیشانەك هەبیت هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن، ئەرێ کی ژ مە هێژاتری ئێمنیییێیە ئەگەر هوین ئەو بن یێت دزانن؟!. ئەوێت باوەری ئینایین و ستەم و شرك تێکەلی باوەرییا خۆ نەکرین، ئەها ئێمنی (ژ ئیزایا خودێ) بۆ وانە و ئەون یێت هاتینە راستەرێکرن).

ئەگەر ساخلەمی رامانا نەرویدانا نەخۆشییێ بیت، بەلێ تەناهی بێی پێشبینیکرنا نەخۆشیییێیە، خودێ دبێژیت: (قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ) [التوبة: ٥١]، (ئانکو، بێژە ب راستی چو بەلا و ئاتاف مە ناهنگێڤن، ئەو نەبن یێت بۆ مە نڤیسین هەر ئەوە (خودێیە) پشتەڤان و هاریکارێ مە، ڤێجا بلا خودان باوەر پشتا خۆ ب خودێ گرێ بدەن).

ئەڤ باوەرییە نەفسێ رەحەت دکەت بۆ دادپەروەرییا خودێ، چونکی هەمی فەرمان د دەستێ خودێدانە، ب چو تشتان ستەمێ ل خەلکی ناکەت، (وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ) [الأنبياء:٤٧]، (ئانکو، خۆ ئەگەر (خرابی یان باشییا وی) تەمەتی دندکەکا تۆڤێ خەندەلکێ ژی بیت، ئەم دێ ئینین (و بۆ کێشین)، ژ خۆ بۆ حسێب و هژمارتنێ، ئەم بەسی خۆینە).

خودێ بەرەڤانییێ ژ باوەرداران دکەت، و وان رزگار دکەت ژ هەمی نەخۆشییان، و وان سەر دئێخیت ل سەر دژمنێ وان.

ئەڤ باوەرییە نەفسێ تژی دکەت ژ هەستەکرنا ب سەرکەفتن و سەرفەرازی و پلەبەرزییێ، و ب دەستڤەئینانا رازیبوونا خودێ کو ب بهاترین سەرکەفتنە مرۆڤ ل سەر روییێ ئەردی ب دەست خۆڤە دئینیت.

و باوەری دەروونی تژی رەحەتی و ئارامی و هیڤی دکەت، و پشت بەستن و رازیبوون ب قەزایا خودێ کو نائینیتە سەرێ بەندەیێ خۆ یێ باوەردار ئەگەر ب راستی و باشییا وی نەبیت، و یا هاتییە ڤەگوهاستن: ((الإِيمَانُ بِالْقَدَرِ يُذْهِبُ الْهَمَّ وَالْحَزَنَ))[1]، (ئانکو، باوەری ب قەدەرێ دلتەنگییێ و خەمێ دبەت).

ئەڤ هەستە شادییەکا دەروونی دورست دکەن، و شادییەکا کو ئەوێ تام نەکربیتێ نوزانیت، ژ بەر کو ساخلەمییا دەروونی بنیاتێ ساخلەمییا لەشییە، هەتا یا هاتییە گۆتن: ((دلۆڤانییا دەروونی تێرا هندێ هەیە لێدانێن دلی یێن ب لەز بۆ سروشتێ وان بزڤرینیت، و فشارا خوینێ یا بلند بۆ ئاستێ وێ یێ سروشتی)).

و نوژدارییا پاراستنێ د ئیسلامێدا دەست پێ دکەت ژ نەهێلانا ئەگەرێن نەخۆشییێ کو چێتر و ب ساناهیترە ژ نەهێلانا نیشانێن وێ، و نەخۆشی، ئەگەر نیشانێن وێ ب دەرمانان چۆن دێ شوینوارێن لایەکی (جانبية) هەبن د دەمەکێ دویڤدا، دیار دبن ل سەر شێوێ نەخۆشییێن دلی و نەخۆشییێن خوینێ و گولچیسکی بێی ئەگەرەکێ ئێکسەر.

و نوژدارییا پاراستنێ دهێتە هژمارتن سەروەرا هەمی نوژدارییا مرۆڤی، چونکی هێزا ئوممەتێ یا د هێزا تاکێن وێدا، و داهاتێ وێ ب داهاتێ وان دهێتە پیڤان، و ئەو گەلێ نەخۆشی کەڤتنە د ناڤدا و جهێ خۆ کر دێ تووشی خوسارەتییەکا مەزن بیت، چ ئەڤ هێزا مرۆڤی یا نەخۆشا بێکار یا کو د شیاندایە شیانێن خۆ د زێدەکرنا داهاتێ خۆدا بمەزێخیت، یان ڤان سامانێ مەزن یێ کو دمەزێخن د چارەسەرکرنا ڤان نەخۆشییان، و د شیاندایە کو بمەزێخن د ئاڤاکرنا نیشتمانیدا، دێ بیتە هاریکار د نەهێلانا وێدا، و ل سەر راگرنا وێ.

و د سەر ڤێ چەندێرا کو بهایێ بارا پترێ دەرمانان پارەکێ بیانی یێ ب زەحمەت لێ دهێتە مەزاختن و مە گەلەك پێتڤی یا پێ هەی ژ بۆ ب جهئینانا پرۆژێن بەرهەمهێنانێ کو مفایەکێ گشتی دگەهینیتە ئوممەتێ.

---

(١) مسند الشهاب (٢٧٧) ژ زارێ ئەبی هورەیرە.

و چارەسەرکرنا نەخۆشیێ ئێشا زراڤ (سل) ب رادەکێ ناڤنجی نەهـ هەیڤان ڤەدکێشیت، و نەخۆش و دەولەت پارە و شیانێن گەلەك دمەزێخن، زێدەباری کو نەخۆش ئێشان و دودلییێ دبەت، و پاراستن ژ ڤێ نەخۆشییێ ب تنێ پێدڤی دەرزیکدانەکێیە کو هندەك (ڤرویش) دهێنە مەزاختن.

پاقژی ژ نوژدارییا پاراستنێیە، و ئیسلامێ فەرمان ب ڤێ چەندێ یا ل مە کری، کو ئەڤە پاراستنە ژ ڤەگوهاستنا گەلەك نەخۆشییێن دهێنە ڤەگوهاستن، کو دهێنە ڤەگوهاستن ب پیسبوونا دەستان، وەکی کۆلێرا، و زکچۆن و کولبوونا رویڤیکان.

و پاقژی زڤرۆکا خوینێ چالاك دکەت، ب هۆشدارییا دەماران، و ئەندامان نەرم دکەت، و کارێن پیستی دپارێزیت کو ژ کار بکەڤن، زێدەباری کاریگەرییا پاقژییێ د ئاڤاکرنا کەسایەتییێدا، و د پەیوەندییێن جڤاکیدا.

خودێ هاندانا مە دکەت بۆ پاقژییێ، و کرییە ئەگەر بۆ حەژێکرنا خۆ، خودێ دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمَتَطَهِّرِينَ) [البقرة:٢٢٢]، (ئانکو، ب راستی خودێ حەژ تۆبەداران دکەت، و هەروەسا حەژ پاقژان ژی دکەت).

و ئیمام غەزالی ل سەر چوار ئاستان ژ ڤێ ئایەتێ گەهشتییە:

ئێك: پاقژکرنا دێمان و تشتێ ل بەرچاڤ ژ پیساتییان.

دو: پاقژکرنا ئەندامان ژ گونەهـ و خرابییان.

سێ: پاقژکرنا نەفسێ ژ رەوشتێن خراب و کارێن شکەستی یێن نەڤیان ژێ هەی.

چوار: پاقژکرنا نەفسێ وەکی خودێ دڤێت.

و یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن کو بەرەکەتا خوارنێ یا د دەستشویشتنا دەستاندا بەری خوارنێ: ((بَرَكَةُ الطعَامِ الوُضوءُ قَبْلَهُ وَالوُضوءُ بَعْدَهُ))[1]، (ئانکو، بەرەکەتا خوارنێ دەستنڤێژ شویشتن بەری و پشتی خوارنێ هەبیت).

و ناهێتە ڤەشارتن کو دەستنڤێژ شویشتنا خوارنێ شویشتنا دەستا و دەڤییە.

---

(١) ترمزی (١٨٤٦)، و ئەحمەد (٧٠٨٢)، و حاکم (٦٥٤٦) زار سەلمانی.

و پێغەمبەری ﷺ شویشتنا رۆژا ئەینی کرییە ئەرك دبێژیت: «حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ أن يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أيَّامٍ يَوْماً يَغْسِلُ فِيهِ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ»[1]، (ئانکو، ئەرکە ل سەر هەر موسلمانەکی هەر حەفت رۆژان جارەکێ سەر و لەشێ خۆ بشۆت).

و نە ب تنێ گرنگیا پاقژییێ د ئیسلامێدا کرییە مەرجەك بۆ دورستییا نڤێژێ: خودێ دبێژیت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [المائدة:٦]، (ئانکو، گەلی خودان باوەران، ئەگەر هەوە ڤیا رابن نڤێژێ بکەن (و هوین یێت بێ دەستنڤێژ بن) ئێدی هوین سەر و چاڤێت خۆ و دەستێت خۆ هەتا ئەنیشکا بشۆن، و سەرێ خۆ ڤەمالن، و پێت خۆ هەتا گۆزەکان بشۆن، و ئەگەر هوین د بێ نڤێژ بن (ب جەنابەت بن) خۆ بشۆن، و ئەگەر هوین د نەساخ بن، یان ل سەر وەغەرێ بن یان ئێك ژ هەوە ژ تارەتێ (دەستاڤێ) هات، یان هوین چۆبنە نڤینا ژنێ، و ئاڤ ب دەست هەوە نەکەڤت (کو تێرا هەوە بکەت دەستنڤێژێ پێ بگرن یان سەرێ خۆ پێ بشۆن)، ب ئاخەکا پاقژ تەیەمومێ بکەن و ناڤچاڤ و دەستێت خۆ پێ ڤەمالن، خودێ (ب ڤێ فەرمانێ کو هوین ب ئاڤێ یان ب ئاخێ خۆ پاقژ بکەن، وەختێ هەوە دڤێت نڤێژان بکەن یان ب هەمی فەرمانێت خۆ) نەڤێت بەرتەنگی و زەحمەتێ بۆ هەوە چێکەت، بەلێ دڤێت هەوە ژ گونەهان پاقژ بکەت و خنێکێت خۆ ل سەر هەوە تەمام بکەت، دا هوین سوپاسییا وی بکەن).

و خودێ ئاڤا پاقژا پاقژکەر ژێ گرتییە بۆ مە، داکو خۆ پێ پاقژ بکەین، خودێ دبێژیت: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا﴾ [الفرقان:٤٨]، (ئانکو، هەر ئەوە (خودێ) بای بەری دلۆڤانییا (بارانێ) ب مزگینی

---

(١) بوخاری (٨٥٦) ژ زار ئەبی هورەیرە.

دهنێريت، و مه ئاڤەكا پاقژ ژ عەوران داڕێت). و خودێ دبێژيت: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ وَيُذْهِبَ عَنْكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ﴾ [الأنفال:١١]، (ئانكو، بيننه بيرا خۆ دەمێ خەوەكا سڤك دلێ هەوە گرتی، و خودێ ژ نك خۆ هوين پێ دلتەنا كرين و باران بۆ هەوە ژ ئەسمانی باراندی، دا هەوە پێ پاقژ بكەت (شويشتنێ ل سەر خۆ ڕاكەن، و دەستنڤێژێت خۆ بگرن و نڤێژێت خۆ بكەن)، و دا ئاوازێت شەيتانی ژ دەڤ هەوە ببەت (هوين نەبێژن ئەم د كێمين و ئەو گەلەكن)، و دا دلێت هەوە ب بێنفرەهيێ موكوم بكەت، و پێيان پێ ڕاگريت (و ل بن پێت هەوە گزر بكەت و نەبنە تەقن).

و نافنجيكرن د خوارن و ڤەخوارناندا و هەمی وان تشتێن ڕێك پێ هاتييه دان (حلال) ژ نوژدارييا پاراستنێيه، خودێ دبێژيت: ﴿يَا بَنِي آَدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ [الأعراف:٣١]، (ئانكو، گەلی مرۆڤان، د گەل هەر نڤێژەكێ يان تەوافەكێ جلكێت خۆ يێت جوان بكەنە بەر خۆ و بخۆن و ڤەخۆن و دەرێژی و دەستدرێيانێ نەكەن، ب ڕاستی خودێ حەژ دەستدرێيايان ناكەت).

دەڤێ ڤێ ئايەتێ فەرمانێ ل نافنجيكرنێ د خوارنێ و ڤەخوارنێدا دكەت، بەلێ دانەپاش ژ دەستدرێيانێ نە ب تنێ خوارنێ و ڤەخوارنێ دگريت، بەلكو هەمی تشتی دگريت، و ئەو تشتێ د قورئانێدا رەهايی هاتی دێ مينيت ل سەر رەهاييا وی.

و پێغەمبەری ﷺ تخوبێ ڤێ نافنجيكرنێ دياركرييه دبێژيت: ((مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًا مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لا مَحَالَةَ فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفْسِهِ))[1]، (ئانكو، مرۆڤی ئامانەك پڕ نەكرييە خرابتر ژ زكێ خۆ، چەند پارييەك بەسی مرۆڤينە پشتا خۆ پێ ڕابگريت، هەكە هەر دێ ژ وان پارييان بۆريت، بلا سێك بۆ خوارنا وی بيت، و سێك بۆ ڤەخوارنا وی، و سێك بۆ بێهنا وی.

---

(١) ترمزی (٢٣٨٠)، زار ميقدامێ كوڕێ مەعدی كەريبە، و د ڤەگوهاستنا ئيبن ماجەدا (٣٣٤٩): لُقَيْمَات بَدَلَ أُكُلَات.

و یا بەرنیاسە د نوژدارییێدا و د زانستێ خوارنێدا: (دەهێکا ئەم دخوین تێرا مە هەیە ئەم بمینینە ساخ، و نەھ ژ دەهێ ئەوا ئەم دخۆین تێرا هندێ هەیە نوژدار بمیننە ساخ).

و پێغەمبەری ﷺ یا دیار کری خۆشی و تاما خوارنێ ب باشترین و خۆشترین خوارن ب دەستڤە نائێت، بەلکی ئەڤ خۆشی و تاما خوارنێ دەمێ برساتییێ ب دەستڤە دئێت.

خوارنا د دەمێ برساتییێدا بنیاتە د نوژدارییا پاراستنێدا، چونکی مفاوەرگرتن ژ خوارنێ دورست نابیت ئەگەر وەرگرتنەکا دورست نەبیت، و هەرسکرن و وەرگرتن دورست نابن ئەگەر شلەیێن هەرسکرنێ نەهێنە هاڤێژتن ل سەر خوارنێ، و ئەڤ هاڤێژتنە نابیت ب تنێ د برسێدا نەبیت.

و ناڤنجیکرن د خوارن و ڤەخوارن و هەمی ئەوێن حەلال بنیاتێ نوژدارییا پاراستنێیە.

و د ئیسلامێدا نوژدارییا چارەسەرییێ یا هەی... ئەو ژی دانا دەرمانییە. و وەرگرتنا ئەگەرێن چارەسەربوونێ، و نوژدارییا چارەسەرییێ د گەل عەقلی و شەریعەتی رێك دکەڤیت؛ یا رێککەڤتییە د گەل عەقلی چونکی د کارئینانا دەرمانیدا مفایی دگەهینیت، و زیانێ دبەت، و یا رێککەڤتییە د گەل شەریعەتی ژ بەر گۆتنا خودێ: ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ [الشعراء: ٨٠]، (ئانکو، ئەوێ گاڤا ئەز نەساخ بووم، ئەو ساخی و سلامەتییێ ددەتە من، و من ساخ دکەت).

و پێغەمبەری ﷺ ئەوا ئەڤ ئایەتە ڤەدگریت، دبێژیت: ((تداوَوْا، فإنَّ اللهَ لمْ يُنزِلْ داءً إلَّا أنْزَلَ لهُ شِفَاءً، علِمَهُ مَنْ علِمَهُ، وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ))[1]، (ئانکو، خۆ چارەسەر بکەن (خۆ دەرمان بکەن) خودێ دەرد (نەخۆشی) نەداینە ئەگەر چارەسەرییا وی نەبیت، یێ زانی زانی و یێ نەزانی نەزانی).

و پێغەمبەری ﷺ یا دیار کری چارەسەربوون ژ نەخۆشییێ پێدڤی ب دو مەرجانە: ئێك: دورستییا دەستنیشانکرنا نەخۆشییێ، و دورستییا هەلبژارتنا دەرمانی بۆ ڤێ نەخۆشییێ، و ئەڤ مەرجە پێدڤییە و نەیێ تمامە.

---

(١) ئەحمەد (٤٢٣٦) و حاکم (٧٤٢٤).

دو: ب شیانا خودێ بۆ ڤی دەرمانی دێ کارێ خۆ کەت، دێ ئەگەر و نیشانێن نەخۆشییێ بەت، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ تَعَالَى))[1]، (ئانکو، هەر دەردەکی (نەخۆشییەکێ) دەرمانەك یێ هەی، و ئەگەر دەرمانێ نەخۆشییێ هاتە دان ب شیانا خودێ دێ نەخۆشی چیت).

إنَّ الطَّبيبَ له علمٌ يدلُّ بهِ إنْ كانَ للناسِ فِي الآجالِ تأخيرُ

حتى إذا انقضتْ أيّامُ رِحلتهِ حارَ الطبيبُ وَخانَتهُ العقاقيرُ

و خۆچارەسەرکرن (دەرمانکرن) نەیا هەڤدژە د گەل باوەری ب قەدەرێ، و نەیا هەڤدژە د گەل پشت بەستن ب خودێ.

و ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: عومەرێ کورێ خەتابی دەرکەفت چۆ شامێ هەتا گەهشتییە سەرغ (جهێ ڤۆناغا حەجییان) سەردارێن لەشکەری ئەبو عوبەیدەیێ کورێ جەڕاحی و هەڤالێن وی گەهشتنێ، و گۆتنێ تاعوون یا کەتییە شامێ، ئیبن عەباسی گۆت: عومەری گۆتە من: بۆ من گازی مشەختییێن ئێکێ بکە، من گازی وان کر، و مشێورەتا وان کر و گۆتە وان تاعوون یا کەتییە شامێ، ژێك جودا چۆن، هندەکان گۆت: تو بۆ کارەکی یێ دەرکەفتی و ئەم نابینین تو ژێ بزڤڕی، و هندەکان گۆت: خەلکێ دی و هەڤالێن پێغەمبەرێ خودێ ﷺ یێن د گەل تە، و ئەم نابینین تو بەری وان بکەڤی بەرێ وان بدەیە ڤێ تاعوونێ، گۆت: هلۆن ژ دەڤ من رابن، پاشی گۆت: بۆ من گازی ئەنساران (خەلکێ مەدینێ) بکە، من گازی وان کر، و مشێورەتا وان کر، وان ژی رێکا مشەختان گرتن، و وەکی جودابوونا وان جودا چۆن، گۆت: هلۆن ژ دەڤ من رابن، پاشی گۆت: کا کی ل ڤێرێیە ژ رویسپییێن قورەیشییان ژ وان یێن پشتی فەتحا مەکەهێ موسلمان بووین گازیکە، من گازی کرن، دو زەلام ژی ژ وان د گەلێك جودا نەبوون، گۆتن: ئەم دبینین تو ب خەلکیڤە بزڤڕی و بەرێ وان نەدەیە ڤێ تاعوونێ. عومەری رضي الله عنه گازی خەلکی کر: ئەز سپێدێ یێ ل سەر وەغەرێ

---

(١) موسلم (٢٢٠٤) زار جابری.

هوین ژی سپێدێ وەغەرێ بکەن، ئەبو عوبەیدەیێ کوڕێ جەراحی گۆت: دێ ژ قەدەرا خودێ رەڤی؟ عومەری ﷺ گۆت: هەکە ئێکێ دی وەگۆتبا یا ئەبو عوبەیدە!! (و عومەری نەدڤییا خیلافا وی بێتە کرن) بەلێ دێ ژ قەدەرەکا خودێ بۆ قەدەرەکا دی یا خودێ رەڤین، بێژە من هەکە تە حێشتر هەبن و بچنە نهالەکێ دو رەخ هەبن رەخەکێ قەلەو بیت و یێ دی یێ رویت بیت، ما نە هەکە تە رەخێ قەلەو چەراند تە ب قەدەرا خودێ چەراند و هەکە تە رەخێ رویت چەراند تە ب قەدەرا خودێ چەراند؟ عەبدولرەحمانێ کورێ عەوفی ﷺ هات و ئەو بۆ هەوجەیەکێ نەیێ ئامادەبوو گۆت: ب راستی من زانینا ل سەر ڤێ هەی، من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو ﷺ دگۆت: ((إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلا تَقْدَمُوا عَلَيْهِ وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلا تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ)) هەکە هەوە گوه لێ بوو ل ئەردەکی یێ هەی نەچنە وێرێ، و هەکە کەفتە ئەردەکی و هوین ل وێرێ بن، ژێ نەدەرکەڤن ژێ برەڤن. عومەری ﷺ حەمدا خودێ کر و چۆ[1].

فقهناس دبێژن: (ب کارئینانا دەرمانێن مفایێ وان یێ ڤەبڕ ب گۆتنا نوژداران بۆ چارەسەرییا نەخۆشییەکێ کو نەخۆش پێ رابیتەڤە ژ کرنا ئەرکێن خۆ بەرامبەری خودێ و خەلکی، یان نەخۆشییەک بیت کو دویماهییێ ب ژیانا وی بینیت، یان ئەندامەک بیت ژ ئەندامێن وی ئەرکەکێ ئایینییە دگەهیتە ئاستێ فەرزێ).

و ل ڤێرە جهێ ئاماژێیە بۆ هندێ نوژداری د ئیسلامێدا تایبەتمەندییەکە (بسپۆری)، و د فەموودێدا ژ زارێ عەمرێ کوڕێ شوعەیبی زار بابێ خۆ ژ باپیرێ وی دبێژیت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((مَنْ تَطَبَّبَ وَلَمْ يُعْلَمْ مِنْهُ طِبٌّ قَبْلَ ذَلِكَ - أي معرفة بالطب - فَهُوَ ضَامِنٌ))[2]، (ئانکو: ئەوێ نوژدارییێ دکەت و بەری هینگێ چو نوژداری نەزانی بیت - ئانکو زانین د نوژدارییێدا نەبیت - ئەو کەفیلە (بەرپرسە ژ ڤێ چەندێ).

---

(١) بوخاری (٥٣٩٧)، موسلم (٢٢١٩).

(٢) ئەبو داوود (٤٥٨٦)، نەسائی (٧٠٣٤)، ئیبن ماجە (٣٤٦٦).

# هەر دەردەکی دەرمانەکێ هەی پێ دهێتە چارەسەرکرن

و ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا موحەممەدی ﷺ ئەوا موسلمی د سەحیحا خۆدا زار جابری ژ پێغەمبەری ﷺ ڤەگوهاستی، گۆت: ((لِكُلِّ داءٍ دَوَاءٌ، فإذا أُصيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ بَرَأَ بإذْنِ اللهِ عزَّ وَجَلَّ))[1].

و رامانێن مەزن یێن د ڤێ فەرموودێدا هەین، چونکی گۆتنا پێغەمبەری ﷺ: ((لِكُلِّ داءٍ دَوَاءٌ)) گیانێ ورەی یێ نەخۆشی بلند دکەت، و کاودانێ وی یێ دەروونی کو گەلەك هاریکاریيا وی دکەت بۆ چارەسەربوونا نەخۆشییا وی، و د ڤێ فەرموودێدا هاندانەکە بۆ زانا و ڤەکۆلەران ل سەر خۆزەحمەتدان و ڤەکۆلینێ بۆ چارەسەرییا هەر نەخۆشییەکا چارەسەرییا وێ نەهاتبیتە ئاشکەراکرن، و د ڤێ فەرموودێدا هشیارکرنەکە بۆ هویربینییا دەستنیشانکرنێ بۆ گەهشتنا هەلبژارتنا چارەسەرییا گونجایی.

و گۆتنا پێغەمبەری ﷺ: ((فإذا أُصيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ)) د ڤێدا ئاماژەکە بۆ پێدڤییا هویربینییا دەستنیشانکرنێ بۆ نەخۆشییێ، و ئاماژەکە بۆ پێدڤی دیتنا باشییا هەلبژارتنا دەرمانێ گونجایی بۆ ڤێ نەخۆشییێ، ژ لایێ جۆری و چەندییێ، و براندنا دورستبوونا کێمترین نیشانێن زەرەرمەند.

بەلێ ل دویماهییێ چارەسەربوون نابیتە تشتەکێ تمام دەمێ دەستنیشانکرن دهێتە کرن، و هەلبژارتنا دەرمانێن گونجای ب چەندییا گونجای، و د دەمێ گونجاییدا، ئەڤە هەمی مەرجێن پێدڤینە، بەلێ بەس نینن، دێ پێدڤی کەت خودێ ب حەزکرنا خۆ ئەڤ دەرمانە کریارا خۆ بکەت د هۆکارێ نەخۆشییێدا، وەك چارەسەربوونەك یان

---

(١) موسلم (٢٢٠٤).

سڤككرنەك بۆ نەخۆشییێ، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ)).

ئەوا وەرگرتنا ئەگەران تمام دکەت چۆنا بەرەڤ خودێیە ب دوعاکرنێ، چونکی ئەو پەیداکەرێ ئەگەرانە، ژ بەر ڤێ چەندێ یا ژ زارێ پێغەمبەری ﷺ هاتییە گێران، دبێژیت: ((دَاوُوا مَرْضَاكُمْ بِالصَّدَقَاتِ))[1]، (ئانکو نەخۆشێن خۆ ب دانا خێران (صدقات) چارەسەر بکەن). و یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن: ((الصَّدَقَةُ فِي السِّرِّ تطفِئُ غَضَبَ الرَّبِّ))[2]، ئانکو، سەدەقەیا د نهێنیدا تۆڕەیا خودێ ڤەدمرینیت (ناهێلیت). دیسا یا ژێ هاتییە ڤەگوهاستن: ((بَاكِرُوا بِالصَّدَقَةِ، فَإِنَّ الْبَلَاءَ لَا يَتَخَطَّاهَا))[3]، (ئانکو: لەزێ د خێرێدا بکەن، هندی بەلایە ژێ دەرباز نابیت).

---

(١) بەیهەقی د سونەنێدا (٦٣٨٥) زار عەبدوللایێ کورێ مەسعودی.

(٢) حاکم د موستەدرەکێدا (٦٤١٨) زار عەبدوللایێ کورێ جەعفەری.

(٣) (سنن) یا بەیهەقی (٦٧٢٠)، و شعب الایمان (٣٣٥٣) زار ئەنەسی.

# کارێن پەرستنێ چارەسەرینە بۆ گەلەك نەخۆشییان و ئەو ئەگەرن د بەرژەوەندییا ئافراندییاندا

ئیمام شافعی دبێژیت: (العِبَادَاتُ مُعَلَّلَةٌ بِمَصَالِحِ الخَلْقِ)، (ئانکو: کارێن پەرستنێ ب بەرژەوەندییا ئافراندییانڤە د خویاکرینە). ئانکو کارێن پەرستنێ ئەگەر بهێنە کرن ل دویڤ وێ یا خودێ دڤێت دێ باوەرداری کەتە کەسەکێ زیرەك، دێ کەسان بۆ خۆ کێشیت، و دێ چاڤ میننە پێڤە، و ژ رۆناهییا وی دێ دل راستەرێ بن.

ئەگەر خودان باوەری کارێن پەرستنێ کرن ل دویڤ وێ یا خودێ ڤیای دێ باوەرداری کەتە کەسەکێ هش و بیر رۆهن و د گەل دلی، دیتن تیژ و عەقل هەمی پێکڤە، دێ هزر و دلچۆنا وی ئێکگرن، نوزانیت کی ژ وان بەری یێ دییە؟ راستگۆیا رەوشتێ وی یان باشییا زانینا وی؟! و نوزانیت کی ژ وان جوانتر و باشترە؛ تێرییا نەفسا وی یان تێگەهشتنا عەقلێ وی؟

ئەگەر خودان باوەری کارێن پەرستنێ کرن ل دویڤ وێ یا خودێ ڤیای دێ باوەرداری کەتە خودان ئاسۆیێن بەرفرەه، و دیتنەکا دویربین، و خودان حیکمەتەکا ساخلەم، و دێ وەلێ کەت د بەختەوەرییێدا نقۆ بیت کو خۆشییێن عەردی یێن هەست پێ کری وی ژ ڤێ چەندێ ڤەکەن، و دێ وی کەنە خودان رەوشتەکێ رەسەن، کو پرتێن تەیسی یێن زێری و فشارێن رێگر نەشێن وی بشکێنن.

باوەرداری راستەقینە وەکی چیایەکێ خۆجه و نەلڤە، و وەکی کەڤرێ موکوم و رەقە، و وەکی رۆژا رۆهنە، و وەکی دەریایێ کویرە، وەکی عەسمانێ ساهییە، و وەکی بهارا سەرنجراکێشە، و وەکی ئاڤێ یا خۆشە (شرینە)، و وەکی کچا کچین (نەشویکری) یێ شەرمینە، و وەکی زارۆکی یێ ئارامە.

بەلێ دەمێ مرۆڤ ژ (فطرة)تا خۆ دەرکەڤت، و پەرستنا خودێ نەکر، و تخویبێن مرۆڤایەتییا خۆ ب گونەهێ و دژمناتییێ شکاندن دێ هەڤسەنگییا ناڤەکییا وی تێك چیت، و دێ هەست ب غەمگینییەکا وێرانکەر بۆ ساخلەمییا دەروونێ خۆ کەت، و زانایێن دەروونی یان نوژدارێن دەروونی دبێژنە ڤێ چەندێ توندبوونا دەروونی (دلتەنگی)، کو ئەگەرەکێ سەرەکییە بۆ گەلەك نەخۆشییان، و ب ڤێ ئەم دێ گەهینە راستییەکا مەترسی، و ئەو ژی کو گەلەك نەخۆشی ئەگەرێن وێ بۆ توندییێن دەروونی، و تەمبەلییا ماسۆلکەیی دزڤرن.

ژ نەخۆشییێن ئەندامی خودان ئەگەرێن دەروونی لەزبوونا لێدانێن دلییە، و تێکچۆنا سیستەمێ دلی، و تەنگبوونا خوینبەران، و بلندبوونا فشارا خوینێ کو ئەگەرێ وێ یێ دەماری بیت، و برینێن کۆئەندامێ هەرسکرنێ، و نەخۆشییێن هەستیاری (حساسية)، و نەخۆشییێن دەماران، و فالنجا ئەندامی ژ ئەگەرێ دەروونی دورست دبیت، و دەمێ مرۆڤ د گەل خودێ ئاشت بوو، و تۆبە ژ گونەهێن خۆ کر، و ما ل سەر فەرمانا خودایێ خۆ، و کارێن چاك کرن ژ بۆ نێزیکبوونێ ژ وی، دێ هەست کەت وی کابووسەکێ فشارکری ژ سینگێ خۆ دەرئێخست و بر، هەر وەکی چیایەکێ ب عەردیڤە نسیایی، و تاریاتییێن ل سەرێك دێ ل بەر وی بەلاڤە بن و چن.

باوەردار هەست ب شادییەکێ دکەت ناهێتە سالۆخەتکرن، و هەستێن غەمگینی و دامایینی و دلتەنگییێ دێ بەرزە بن و نازڤرن، و ل ڤێرە هەست دکەت تەناهی و شادی یا د دلێ ویدا، ئەگەر ل سەر خەلکێ وەلاتەکی لێکڤە بکەن دێ هەمییان کەیفخۆش و شاد کەت، و ل ڤێرە ئەندامی ب ڤێ ساخلەمییا دەروونی کاریگەر دبیت ب کاریگەرییەکا ئەرێنی، و دێ باراپترێ نیشانێن نەخۆشییێن ئەندامی یێن ب ئەگەرێ دەروونی دورست دبن بەت.

ب راستی تۆبە و کارێن چاك بنیاتێ ساخلەمییا دەروونینە، و ئەگەر تە بڤێت دەروونەکێ ساخلەم کو خودان ورەیێن بلند و گەشبین بیت ل سەر تە پێدڤییە ئاشبوونێ د گەل خودێ بکەی (بزڤری بۆ لایێ خودێ)، و ئەگەر تە ئاشبوون د گەل کر

دێ ژیانا ته هەمی دورست بیت، ژ بەر ڤێ چەندێ یا ژ زارێ پێغەمبەری ﷺ هاتی: ((استقيمُوا ولَن تحصُوا))[1]، ئانکو: ئەگەر هەوە خۆ راستەرێ کر هوین باشییان ناهژمێرن ئەوێن هوین ژ رێکا راستییا خۆ دکەن و ب دەستڤە دئینن.

و گۆمان تێدا نینە کارێن پەرستنێ ژ نڤێژ و رۆژی و حەج و زەکاتێ پەرستنن خودێ فەرمان ب کرنا وان یا ل مە کری، و قورئانا پیرۆز یێن کرینە ئەگەر ب ئەگەرەکێ نوژداری خودێ دبێژیت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ [التوبة:١٠٣]، (ئانکو، زەکاتێ ژ مالێ وان وەرگرە، وان پێ پاك و پاقژ بکە ژ گونەهان، و بۆ وان (پشتی تو زەکاتێ ژ وان وەردگری) دوعایان بکە، ب راستی دوعایێت تە بۆ وان ڤەهەسیان و دلرەحەتییە و خودێ ب خۆ گوهدێر و دلۆڤانە). و خودێ دبێژیت: ﴿اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ [العنكبوت:٤٥]، (ئانکو: (هەی موحەممەد) هەر وەحییەکا بۆ تە ژ ڤێ قورئانێ هاتی، بخوینە (بخوینە و باوەر پێ بکە، و بکە کار)، و (وەسا) نڤێژێ بکە (وەکی فەرمانا تە پێ هاتییە کرن)، ب راستی نڤێژ بەرێ مرۆڤی ژ هەمی گونەهێت زێدە پیس، و کریارێت نە د گەل سروشتێ مرۆڤان و کریارێت کرێت و نەشرین (ئەوێت شەریعەتی دورست نەکرین) وەردگێریت). و خودێ دبێژیت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ [البقرة:١٨٣]، (ئانکو، گەلی خودان باوەران رۆژی ل سەر هەوە هاتە نڤێسین، هەر وەکی ل سەر یێت بەری هەوە ژی هاتییە نڤێسین، بەلکی هوین پارێزکارییێ بکەن).

ئەڤ کارێن پەرستنێ خودێ حیکمەتا وان یا بۆ مە دیار کری، بەلێ ئەڤ دیارکرنا خودایی وێ چەندێ ناگەهینیت کو گەلەك حیکمەتێن دی نەبن، بۆ نموونە: زانایێن پەروەردەییا لەشی نەخشە و پلە دانایینە بۆ راهێنانێن ناڤنجی کو هەمی کەس بشێن د هەمی ژییاندا و ل هەمی دەم و جهان بکەن، و زیان نەگەهیتە دلێن وان، و ماسۆلکەیێن وان هشك نەبن، نەخشە بۆ لڤین و راوەستان و راهێنانێن وان یێن دانایین کو د گەل

---

(١) ئەحمەد (٢٢٤٣٢)، ئیبن ماجە (٢٧٧)، ئەلدارەمی (٦٥٥)، زار سەوبان ب سەنەدەکا سەحیح.

لڤینێن نڤێژێ ب تامی رێك دكەڤن، ژ بەر كو ئەڤ نڤێژا خودێ كرنا وێ فەرمان ل مە كریە زێدەباری كو مە نێزیكی خودێ دكەت، و مە دگەهینیتە وی، د هەمان دەمدا ژی مفایە بۆ لەشێن مە، ژ بەر كو ئەو لڤین و رابوون و چەمیان و سوجدە گەلەك مفا یێن هەین بۆ لەشێ مە.

ب راستی هندەك وەلاتێن پاشكەفتی ژ گەلەك نەخۆشییان دنالن و د بەربەلاڤن، نەخۆشییەكا هەی تووشی هەردو چاڤان دبیت، بەلێ ئەڤ نەخۆشییە د وەلاتێن ئیسلامیدا گەلەكا كێمە ب ئەگەرێ دەستنڤێژ شویشتنێ، كی ژ مە باوەر دكەت دەستنڤێژ شویشتن و لڤینێن نڤێژێ ئەڤە فەرمانێن پەرستنێ ب تنێنە، بەلێ د راستییا وێدا دیسا زێدەباری مفایێن وێ یێن روحی و پەرستنێ گەلەك نەخۆشییان ژ مرۆڤی دویر دئێخیت، و ئەز ژ بیر ناكەم ژنەك چۆ وەلاتەكێ رۆژئاڤا دا نەخۆشییا شەقەسەرێ چارەسەر بكەت، ئێشانێن بەردەوام د سەریدا، نوژدارەك بوو خودێ نەنیاسی پسیار ژ ڤێ ژنێ كر: تو ژ كیرێ هاتی؟ گۆت: ژ سوریا، گۆتێ: ئەرێ تو نڤێژا دكەی؟ گۆت: نەخێر، ئینا نوژداری گۆتێ: نڤێژا بكە و هەرە چو ل تە نینە! ما حێبەتی و تێك چۆ، ما حێبەتی كو ئەو یا ل فرۆكێ سویار بووی، و هزارەها دۆلار یێن مەزاختین هەتا هاتییە ڤێرێ و بێژیتە وێ: نڤێژا بكە، بەلێ حیبەتی نەبوو دەمێ نوژداری بۆ دیار كری كو ئێك ژ ئەگەرێن شەقەسەرێ لاوازییە د تەربوونا خوینبەرانە د مێشكیدا، و سوجدە خوینبەران فرەه دكەت، و وەدكەت كو خوین بۆ سەری بهێت، ئەڤ سوجدە و ركوعە (چەماندن) و ئەڤ شویشتنا دەستنڤێژێ، ئەڤە هەمی د بنیاتدا پەرستنن، و نێزیكبوونن، و پەیوەندییە ب خودێ، بەلێ ئەگەر زانایەكێ بسپۆر ڤەكۆلین كر، و زانایێن پەروەردەیا لەشی، و زانایێن نەخۆشییێن لولەیێن خوینێ و خوینبەران دێ حێبەتییێن مەزن بینن.

# نوژدار ژێکڤەکرنا د ناڤبەرا ئايينى و زانستيدا دهێلن

د ژۆرەکا پشکنينێدا د ناڤەندەکا نوژداری یا ئێك ژ زانینگەهێن مەزندا نوژدارەکا ژن گوهدانا نەخۆشەکا خۆ دکر، د ژیێ پێنجی و چوار سالییێدا بوو، تووشی کێشەکا دلی ببوو، و تەنگییا هەناسێ، بەلێ پشتی سەحلێکرنێ بۆ ڤێ نوژدارێ دیار بوو کو نەخۆشا وێ پێدڤی ب چو دەرمانا ب هەمیڤە نینە، و شوینا ڤێ چەندێ ڤێ نوژدارێ چارەسەرییەکا دی دانا کو تێدا سەلماند هێزەکا مەزن یا چارەسەرییێ یا هەی د گەلەك ڤەکۆلینانـدا، ئەڤ دەرمانە چییە؟ ڤێ نوژدارێ پێشنیار کر نەخۆشا وێ نڤێژا بکەت، و ل سەر ڤێ هەردو ژن پێکهاتن و چۆنە دەستێن ئێك، و سەرێن خۆ چەماندن بەحسێ نڤێژێ کر.

ئەڤ چاڤپێکەڤتنە و ئەڤ چارەسەرییە بەلگەکە ل سەر گوهۆرینا هێدی هێدی و هێمن کو پیشەیا نوژدارییێ شادەییێ بۆ ددەت، و تو بۆ نەخۆشی شیرەتەکێ سالۆخەت بکەی و بێژییێ نڤێژا بکە، و پەیوەندییێ ب خودێ بکەت، و بزڤریت بۆ لایێ خودێ، و ئاشبوونێ د گەل خودێ بکەت، و ئەڤە پشکەکە ژ چارەسەرییێ، و ئەڤە هاتە ئاشکەراکرن نە ژ لایێ بابەتێ پەرستنێ، و نە ژ بابەتێ ب جهئینانا رێبازا خودێ، بەلکو هاتە ئاشکەراکرن ژ تاقیکرنان.

و کەس نوزانیت کا چەند نوژداران فەرمانا کرنا نڤێژان ژ نەخۆشێن خۆ کرییە، بەلێ ژمارەکا زێدە ژ نوژداران د هەمی ویلایەتێن ئێکگرتییێن ئەمریکی ژێکڤەکرنا د ناڤبەرا ئايينى و زانستيدا دهێلن، و مفایێن چارەسەرییێ یێن نڤێژێ ئاشکەرا دکەن.

و ڤەکۆلینەکێ دیار کر کو د کۆمبوونەکا سالانەدا هاتبوو کرن پتر ژ دو سەد و پێنجی نوژداران پێك هاتبوو ، کو نۆت و نەهـ ژ سەدێ ژ نوژداران دیت مفایەکێ باش و ئاشکەرا یێ هەی ل دەڤ نەخۆشێن وان دەمێ داخوازێ ژ وان دکەن بۆ کرنا نڤێژێ.

و ل زانکویەکا دی پتر ژ هزار کەسێن د بیاڤێ ساخلەمییێدا کار دکەن ل کونگرەکی ئامادەبوون، تێدا دوپاتی ل سەر پەیوەندییێ د ناڤبەرا ساخبوونێ و نڤێژێدا کر.

و هندەكان ژ وان گۆت: (بۆچۆنا بارا پتر یا بەری نوكە ئەو بوو كو زانست د گەل ئایینی ناگونجیت)، و ئەڤە ژی وان گۆت: (هەتا نوكە ژی وێرەكییێ نادەنە خۆ دانپێدانێ ب هێزا كاریگەرییا نڤێژێ بكەن، و بۆشاییەك یا هەی یا گرێدایی ب چاڤدێرییا تمام بۆ نەخۆشێن مە).

ئەڤ نەخۆشە دەمێ ئاشبوون و پەیوەندییێ د گەل خودێ دكەت كۆئەندامێ بەرگرییا وی ب هێز دكەڤیت، و ئەڤە راستییەكا زانستییە.

كۆئەندامێ بەرگرییێ ئەڤ كۆئەندامێ حێبەتی، كو خودێ چێكرییە د مرۆڤیدا بۆ بەرسینگگرتنا نەخۆشییێ، بۆ بەرسینگگرتنا پەنجەشێرێ، بۆ هەمی تێكچۆنێن د لەشێ مرۆڤیدا، ئەڤ كۆئەندامێ گرنگ ب هێز دكەڤیت ب پەیوەندییا د گەل خودێ، ب هێز دكەڤیت ب ڤیانێ، و ب كاودانێ هێمنی و رەحەتی و باوەرییێ.

و ئەڤ كۆئەندامە ب دودلییێ لاواز دبیت، ژ بەر كو باوەری ساخلەمییە، ب رامانەكا هویربین بۆ ڤێ گۆتنێ، ب رامانەكا زاراڤی.

و ئێكێ دی دبێژیت، كو رێڤەبەرێ پەیمانگەها نشتیمانی بوو بۆ ڤەكۆلینێن زانستی: (مە بەری نوكە هزر دكر بەحسكرنا بابەتی ئایینی د گەل نەخۆشێن مە تشتەكە دژی رێنماییێن پیشەیا نوژدارییێیە، بەلێ نوكە یا بوویە پێدڤی بۆ سروشتێ ڤێ پیشەیێ، و پێدڤییا نەفسێ).

ئەو پالدەرێ نوژداران گرنگی ب ئایینی دای ئەو بوو نەخۆشێن وان ژ نوژدارێن خۆ دڤیا شیرەتێن روحی ژێ وەرگرن د چارەسەرییێدا، ژ بەر ڤێ چەندێ هندەك ئامارێن دویماهییێ دیار كرییە هزار مرۆڤان پسیارا پەیوەندییا چارەسەرییێ ب نڤێژێڤە دكر، شێست و چوار ژ سەدێ ئەوێن كەڤتییە بن ڤێ پشكنینێ دویات كرییە كو پەیوەندییەكا ب هێز یا هەی د ناڤبەرا چارەسەربوونێ و دیندارییا دورستدا، یان پەیوەندییا ب خودێڤە.

ژنەکا نەخۆش دبێژیت: (ئەز هەست ب باوەرییەکا بێ تخویب دکەم دەمێ هەست دکەم نوژدار یێ ب هێزەکا بلندڤە گرێدایی (خودێ)، و شیرەتان ل من دکەت ژ دەڤ خودێ)، و ئەڤ هزرە هاریکارییا لەشێ وێ دکەت بۆ چارەسەرییێ.

و هندەك بەلگەیێن زانستی ب شێوەکێ زێدە دیار دکەن کو نڤێژ دشێت گەلەك نەخۆشییان سڤك بکەت، هەتا ئەو نەخۆشییێن دیار کو دەردەکێ بێ دەرمانە و چارەسەری بۆ نینە، و ڤەکۆلینێن دویماهییێ ل سەر پترى دو سەد کەسان کرییە دیار بوو کو مرۆڤێن دیندار فشارا خوینا وان سڤکترە، و دلێن وان پتر د ساخلەمن.

چونکی فشارا خوینێ بنیاتێ وێ فشارا دلتەنگی و خەمێیە، و خەما باوەرداری یا خودێیە، هەمی خەما بکە د ئێك خەمدا چو خەمێن دی ل دەڤ تە نامینن، کار بکە بۆ روییەکێ ب تنێ تێرا تە هەیە شوینا هەمی روییان.

و ڤەکۆلینان دیسا ئاشکەرا کرییە ساخلەمییا عەقلی باشترە ل دەڤ نەخۆشێن نڤێژا دکەت، ئەو کێمتر تووشی بێهیڤیبوون و پویچبوونێ دبن، و کێمتر تووشی نەخۆشییێن دۆمدرێژ دبن، دیسا ئەو پەنایێ نابەنە بەر خۆکوشتنێ.

ب راستی مرۆڤێ دیندار فشارا وی یا سروشتییە، و دلێ وی یێ ب هێزە، و ئەگەر ژی ئەوە یێ هێمن و تەنایە ب خودێ، یێ خۆرادەستکرییە بۆ فەرمانا وی، (قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ) [التوبة:٥١]، (ئانکو، بێژە ب راستی چو بەلا و ئاتاف مە ناهنگێڤن، ئەو نەبن یێت خودێ بۆ مە نڤێسین، هەر ئەوە (خودێیە) پشتەڤان و هاریکارێ مە، ڤێجا بلا خودان باوەر پشتا خۆ ب خودێ گرێ بدەن)، ل دویڤ رێبازا خودێ بچیت، و خۆ رادەستی وی بکەت، هویربینییێ بکەن د ڤێ فەرموودا سەحیحدا، زار موعازی ﷺ دبێژیت: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ عُفَيْرٌ: فَقَالَ : ((يَا مُعَاذُ، هَلْ تَدْرِي حَقَّ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ، وَمَا حَقُّ العِبَادِ عَلَى اللهِ))؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((فَإِنَّ حَقَّ اللهِ عَلَى العِبَادِ أَن يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَحَقَّ العِبَادِ عَلَى اللهِ أَلَّا يُعَذِّبَ مَنْ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا)) فَقُلْتُ: يَا

رَسُولَ اللهِ أفلا أبَشِّرُ بِهِ النَّاسَ؟ قَالَ: ((لا تبَشِّرْهُمْ فيَتَّكِلُوا))[1]، (ئانكو، ئەز ل پشت پێغەمبەری ﷺ ل كەرەكی یێ سوار بووم دگۆتنێ عوفەیر، ئینا گۆتە من: هەی موعاز ئەرێ تو دزانی مافێ خودێ ل سەر بەندەیێ وی چییە؟ ئینا من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: ((هندیكە مافێ خودێیە ل سەر بەندەیێ وی وی بپەرێسن و چو هەڤپشكا بۆ وی چێ نەكەن، و مافێ بەندەی ل سەر خودێ ئەوە وی كەسی ئیزا نەدەت یێ چو هەڤپشكان بۆ وی چێ نەكەت)) ئینا من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ ئەز مزگینییێ ب ڤێ چەندێ نەدەمە خەلكی؟ گۆت: ((مزگینییێ نەدەیێ دێ خۆ پشتراست كەن)).

خودێ بۆ مە مافەك یێ ل سەر خۆ دانای؛ ئەو مە ئیزا نەدەت، چونكی دەمێ باوەرداری پەیوەندی ب خودێ كر، و گوهدانا فەرمانا وی د هەمی كاروبارێن ژیانا خۆدا كر دێ هەست ب ئارامییێ كەت، خودێ ل سەر ئەزمانێ پێغەمبەرێ خۆ ئیبراهیمی (سلاڤ ل سە بن) دبێژیت: (كَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٨١) الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ (٨٢)) [الأنعام]، (ئانكو، ئەز چاوا ژ وان تشتان ئەوێت هوین دكەنە هەڤپشك بترسم؟! و هوین بێ ترس و بێی هەوە بەلگە و نیشانەك هەبیت هەڤپشكان بۆ خودێ چێ كەن، ئەرێ كی ژ مە هێژاتری ئێمنییێیە ئەگەر هوین ئەو بن یێت دزانن؟!. ئەوێت باوەری ئینایین و ستەم و شرك تێكەلی باوەرییا خۆ نەكرین، ئەها ئێمنی (ژ ئیزایا خودێ) بۆ وانە و ئەون یێت هاتینە راستەرێكرن).

ڤان زانایان ب رێكا ڤەكۆلین و تاقیكرن و لێگەریانان گەهشتنە هندێ كو نەخۆشیێ دیندار، نەخۆشیێ ب خودێڤە گرێدایی، نەخۆشیێ ڤەست دكەتە بۆ پشتەڤانەكێ بلند و ب هێز، ئەڤ نەخۆشە زویتر چارەسەر دبیت، و پتر یێ ساخلەمە ژ وی كەسێ ژ خودێ

---

(١) بوخاری (٢٧٠١)، موسلم (٣٠).

هاتییه بڕین ب ئەگەرێ گونەهان، ئەڤ زانایێن بیانی ل ڕاستییێ دگەرن، و ل ڤێ دویماهییێ گەهشتنە ڕەخەکێ وێ.

# حیجامه" مفاییْن ویْ و چارەسەرییْن ویْ

زار ئیبن مەسعود دبیْژیت: ((حَدَّثَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِيَ بِهِ أَنَّهُ لَمْ يَمُرَّ عَلَى مَلأٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ إِلا أَمَرُوهُ: أَنْ مُرْأُمَّتَكَ بِالحِجَامَةِ))[1]، (ئانكو، پیْغەمبەریْ خودیْ ﷺ ل سەر شەڤا چۆیە ئیسرایێ دئاخڤت كو ئەو نەدبۆری ژ كۆمەكا ملیاكەتان ئەگەر وان فەرمانا وی نەكربا: كو فەرمانیْ ل ئوممەتا خۆ بكەت ب كرنا حیجامیْ).

و یا ژ بوخاری هاتییە ڤەگوهاستن ژ ئەنەسی رضي الله عنه كو پیْغەمبەریْ خودیْ ﷺ گۆت: ((إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الحِجَامَةُ))[2]، (ئانكو: باشترین تشتیْ هوین خۆ پیْ چارەسەر (دەرمان) دكەن حیجامەیە).

و زانایێن موسلمانان ل سەر حیجامیْ و چارەسەرییێن ویْ ئاخڤتینە، دبیْژن: (ئیْكەم چارەسەرییێن حیجامیْ بلندبوونا خوینیْیە)، بلندبوون زیْدەبوونە، و بلندبوونا خوینیْ زیْدەبوونا ویْیە، و مەرەم ب بلندبوون و زیْدەبوونا خوینیْ بلندبوونا فشاریْیە، یان وەكی د تیْگەهیْ زانستیدا دبیْژنیْ بلندبوونا توندبوونا خوینبەری.

و ژ نیشانیْن بلندبوونا فشاریْ، یان توندبوونا خوینبەری سەرئیْشە، و هەستكرن ب سەر گرانییێ، و گیْژبوون، و لەزاتییا تیْكئاریانان، و تیْكچۆنیْن دیتنیْ.

هندەك نوژدار فشارا خوینیْ ب فشارا خەم و دلتەنگبوونیْ ناڤ كرییە، دیْ خوین بلند بیت و تیْك ئاریْیت[3] و دیْ چەندییا ویْ زیْدە بیت، و نەخاسمە د وەرزیْ بهاریْدا، د گەل دەستپیْكرنا گەرمیْ، و د فەرموودیْدا: ((مَنْ أَرَادَ الحِجَامَةَ فَلْيَتَحَرَّ سَبْعَةَ عَشَرَ

---

(١) ترمزی یا ژ ئیبن مەسعود ڤەگوهاستی (٢٠٥٢)، ئیبن ماجه ژ ئەنەسی (٣٤٧٩).

(٢) بوخاری (٥٣٧١)، ئەحمەد (١٢٩٠٦).

(٣) مەناوی د (فیض القدیر)دا دبیْژیت: (دەمیْ گەرمی توند بوو پەنایێ ببەنە بەر حیجامیْ دا وەنەكەت خوین بئاریْیت و زیْدە بیت، ئانكو دا خوینا كەسیْ ژ هەوە نەئاریْیت و زیْدە ببیت ئەگەر دیْ هەوە كوژیت).

أوتِسعَةَ عَشَرَ أوْ إحدَى وَعِشرِينَ، وَلا يَتبَيَّغ بأحَدِكُمُ الدَّمُ فيَقتلَهُ))[1]، (ئانكو: ئەوێ بڤێت حیجامێ بکەت بلا ل رۆژا هەڤدێ و نۆزدێ و بیست و ئێکێ بکەت، و کەس ژ هەوە وێ خوینا د لەشێ خۆدا دفویریێت (بلندبوونا فشارا خوینێ و سەرئێشی) نەهێلیت ئەگەر دێ وی کوژیت و چارەسەرییەکا دی یا هەی: بۆ سەرئێشێ، و ئێشانێن سەری، ژ بەر کو سەرئێش نیشانا فشارا خوینێ یا د گەلدا، و سەرئێشەکا دی یا هەی ژ ئەگەرێ تەنگبوونا خوینەبەرێن مێشکییە.

ئەبو داوود ڤەگوهاستییە، زار پێغەمبەری ﷺ، دبێژیت: ((مَا كَانَ أحَدٌ يَشتكِي إلى رَسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم)، وجَعاً فِي رَأسِهِ إلا قَالَ: احتجِمْ))[2]، (ئانکو، نینە کەسەکێ پسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ کری ﷺ ل سەر ئێشانەکێ د سەرێ ویدا ئەگەر نەگۆتبیتێ: حیجامێ بکە).

چارەسەرییا سێیێ: نەخۆشییا شەقەسەرێ، یا د سەحیحا بوخاریدا هاتی زار ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ((أنَّ رَسُول اللهِ (صلى الله عليه وسلم) احتجَمَ وَهُوَ مُحرِمٌ فِي رَأسِهِ مِنْ شَقِيقَةٍ كَانَت بِهِ))[3]، (ئانکو: پێغەمبەری ﷺ حیجامە یا بۆ کری و ئەو د ئیحرامێدا بوو).

حیجامێ هندەك چارەسەرییێن دی یێن هەین، بەلێ تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە یێ نڤێژێ دکەت، و سەرێ خۆ دچەمینیت جارەکێ د رکوعێدا، و دو جاران د سوجدێدا، ب درێژاهییا رۆژ و حەفتییێ و هەیڤێ و سالێ، ئەڤ چەمیان و بلندبوونا سەری دبیتە ئەگەرێ نەرماتییا خوینبەران، چونکی دەمێ سەرێ خۆ دچەمینیت خوین د خوینبەرێن مێشکیدا کۆم دبیت، و دەمێ سەرێ خۆ بلند دکەت دێ فشار ژ

---

(١) ئیبن ماجە (٣٤٨٦) ژ ئەنەسی.

(٢) ئەبو داوود (٣٨٥٨)، و بەیهەقی د (سنن)ێدا (٩/٣٣٩) زار ئەبی رافع زار داپیرا خۆ.

(٣) بوخاری (٥٣٧٤).

نشکەکێڤە هێتە خوار، و ژ بلندبوونا فشارێ و نزمبوونا وێ نەرماتی د خوینبەراندا دورست دبیت، خوینبەران ژ رەقبوونێ، و پەڤینێ دپارێزیت.

و تشتێ ئەم گەلەك جاران گوهـ لێ دبین ماکا خوینێ (أم الدم)، پەڤینەکە د خوینبەرەکا مێشکیدا، بۆچی ئەڤ پەڤینە چێ دبیت؟ ئەو ژی ژ بەر بلندبوونا فشارا خوینێیە، بەلێ بۆچی پەڤین د گەل فشارا بلندە؟ چونکی خوینبەر یا رەق بووی، ژ بلی وی ییێ نڤێژا دکەت ئەگەر فشارا وی بلند بوو ژ بەر کو خوینبەرێن وی نەرماتییەکا تێدا هەی تێرا هەیە وی ژ رەقبوون و پەڤینا وان بپارێزیت.

تشتەکێ دی، تەراتییا باش یا مێشکی تشتەکێ سەرەکییە د ساخلەمییێدا، و سروشتێ سوجدێ د نڤێژێدا وەل خوینێ دکەت بلڤیت، و ب لڤینا وێ خوینبەر فرەهـ دبن، و بارا پترێ نەخۆشییێن تووشی سەری دبن ئەگەرێ وێ تەنگبوونا خوینبەرانە، و ئەوێ سوجدێ بۆ خودێ دبەت چێ دبیت نەزانیت ئەو یێ پاراستنا خوینبەرێن خۆ دکەت ژ رەقبوون و پەڤین و پویچبوونێ.

تشتەکێ دی؛ زانا دبێژن: (د لەشیدا کارگەهێن تەپکێن سۆرێن خوینێ یێن هەین، و ئەڤ کارگەهە یێن د مەژییێ هەستیاندا، چونکی د ناڤ هەر جۆرەکێ هەستییاندا بۆشاییەك یا هەی، ئەڤ بۆشاییە کارگەهێن تەپکێن سۆرێن خوینێنە، کو د هەر چرکەکێدا پترێ دو ملیۆن و نیڤ تەپکێن سۆر چێ دکەن، دیسا خودایێ مە کارگەهێن یەدەك یێن د لەشێ مەدا چێکرین).

مێلاك و خالخالك دو کارگەهێن یەدەکن بۆ تەپکێن سۆرێن خوینێ د کاودانێ راوەستانا کارگەهێن سەرەکی ژ بەرهەمهێنانێ.

ل دویماهییێ زانایان زانی کو کێمیا چەندییا خوینێ د خوینبەراندا هاندانا کاری دکەت، و یا سەخبێریکرنێ و زێدەکرنا بەرهەمێ خۆ، ل ڤێرە حیجامە دهێت، دەمێ چەندییا خوینێ ب کریارا حیجامێ کێم دبیت ل ڤی دەمی ئەڤ کێمییە ئاماژێ دێ دەتە کارگەهێن تەپکێن سۆرێن خوینێ، و سەخبێریکرنێ دکەن، و دێ چالاکیا خۆ زێدە

کەن ب ڤێ کێمبوونێ، ژ بەر ڤێ چەندێ زانا دبێژن: (کێمبوونا خوینێ ب رێك و پێکی هاریکاری کرنەکە د سەخبێریکرنا ڤان کارگەهاندا).

ئەڤ ئارێشە ل دەڤ ژنان یا چارەسەرکرییە ژ ئەگەرێ خوینا هەیڤانە (عادە)، چونکی هەیڤێ جارەکێ پشکەك ژ خوینا ژنێ دهێتە بەردان، و ئەڤە وێ دپارێزیت ژ ڤان نەخۆشییان، و نوژدار دزانن ژن کێمتر تووشی ڤان نەخۆشییان دبن ژ زەلامان، و پشتی خوین دیتن دراوەستیت تووشبوون د ناڤبەرا ژن و زەلاماندا وەکی ئێك لێ دهێت.

ئەڤە دیتنەکە خودێ نیشا پێغەمبەرێ خۆ دای ﷺ، ژ بەر ڤێ چەندێ پتر ژ هەڤدە فەرموودەیان ل سەر حیجامێ هاتینە، پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((مَنْ أرَادَ الحِجَامَةَ فَلْيَتحرَّ سَبْعَةَ عَشَرَ أوتِسْعَةَ عَشَرَ أوْ إحْدَى وَعِشرِينَ، وَلا يَتبَيَّغ بأحَدِكُمُ الدَّمُ فَيَقْتلَهُ))[1].

و دەمێ حیجامێ دەستپێکا هاتنا وەرزێ بهارێیە، د گەل بلندبوونا پلەیێن گەرمێ.

د لەشێ مرۆڤیدا کۆئەندامەکێ زێرەڤانییێ ل سەر خوینێ یێ گەلەك گرنك یێ هەی، ئەڤ کۆئەندامە زێرەڤانییا چەندییا خوینێ دکەت ب شێوەکێ بەردەوام، و دزانیت کا خوین زێدە دبیت یان کێم، و دەمێ کێمییەك کەڤتە د خوینێدا، ئەڤ کۆئەندامە دێ ئاماژەکێ دەتە کارگەهێن تەپکێن سۆرێن خوینێ د مەژییێ هەستیاندا دا بەرهەمهێنانا خوینێ زێدەکەن، دا خوین بزڤریتە کاودانێ خۆ یێ سروشتی، ل ڤێرە حیجامە دهێت و ئارمانجەکا مەزن یا ساخلەمییێ هەیە.

من ڤەکۆلینەکا نڤیسەرەکی خواند و ڤی نڤیسەری نەدزانی حیجامە یا د ئیسلامێدا هەی، کو کێمکرنا خوینێ جارەکێ یان دو جاران د سالێدا، ئەڤ نڤیسەرێ رۆژئاڤایی دبێژیت: (ژ دەستدان و کێمکرنا خوینێ ب شێوەکێ رێك و پێك چێ دبیت بکێشتە هندێ مرۆڤی ژ نەخۆشییێن دلی بپارێزیت).

و گۆتارەکا درێژ یا گرێدایی ب پێکهاتا ئاسنی د خوینێدا یا هەی، ئەگەر ماددێن ئەلکترۆلیتی یێن ئاسنی د ماسۆلکا دلیدا زێدە بوو دێ دلی لاوازکەت، و دێ بیتە ئەگەرێ هندەك نەخۆشییێن دلی.

---

(١) ئبن ماجه (٣٤٨٦) ژ ئەنەسی.

و پەرتۆکەك یا هەی ژ دو هزار بەرپەران پێك دهێت نافێ وێ: (نەخۆشیێن خوینێ)یە، ژ بەر کو خوین جیهانەکا ل سەر خۆیە، و پلازما، و تەپکێن سۆر، و تەپکێن سپی، و پەرکێن خوینێ، و هژمارا وان، و بوونا وان، و مرنا وان، و بزاڤا وان، و کارێن وان، تشتەکێ حێبەتییە، خودایێ مە دبێژیت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ [الذاريات: ٢١].

ئیبن قەییم د (زاد المعاد)دا دبێژیت: (مفاییێن حیجامێ ئەو سەرڤەیا جەستەی پاقژ دکەت پتر ژ برینا لۆلەیا خوینێ (فصد)[١]، و برینا لۆلەیا خوینێ بۆ کویراتییا جەستەی باشترە، و حیجامە خوینێ ژ لاییێن پیستی دەردئێخیت، من گۆت: ب جهئینانا حیجامێ و دەمار برینێ دو کارێن ژێك جودانە ب جودابوونا دەم و جهی و عەمری و کاودانێن لەشی، ژ بەر کو وەلاتێن گەرم و دەمێن گەرم، و گاڤێن گەرم یێن کو کەس تێدا مەزن بووی ل ڤێرە حیجامە گەلەك باشترە ژ لۆلە برینێ، دێ خوین زێدە بیت و زەرك دگریت، و دەردکەڤیتە ب سەر لەشیڤە و حیجامە دئینیتە دەر، ئەوا لۆلە برین نەشێت بینیتە دەر، و ژ بەر ڤێ چەندێ مفاترە بۆ زرکوڕان (صبيان) ژ لۆلە برینێ، و بۆ وان یێ ب برینا لۆلەی مفایی نەگەهینیتێ، و نوژداران ئاماژە ب وێ چەندێ دایە کو وەلات و دەڤەرێن گەرم حیجامە مفاتر و باشترە ژ لۆلە برینێ، و پێدڤییە د نیڤا هەیڤێ، یان پشتی نیڤێ ژ هەیڤێ بهێتە کرن، و ب کورتی د چارێکا سێیێ د هەر چوار چارێکێن هەیڤێ، چونکی خوین د دەستپێکا هەیڤێدا هێژ زێدە نەئاریایە، و ل دویماهییا هەیڤێ خۆجە دبیت، و د نیڤەکا هەیڤێدا و پیچەك پشتی نیڤێ د دویماهییا زێدەبوونێدایە).

خودانێ (القانون) دبێژیت: و فەرمان یا هاتییە کرن ب کارئینانا حیجامێ نە ل دەستپێکا هەیڤێ، چونکی تیراتییێن خوینێ هێژ نەلڤینە، و زێدەبووینە، و نە ل

---

(١) دەرئێخستنا خوینێیە ژ پشکەکا لەشی ب رێکا شەقکرنا خوینهێنەرەکا سەرەکی، و هەر ژ کەڤندا دهاتە ب کارئینان، د کاودانێن تایبەتدا دهێتە ب کارئینان وەکی زێدەبوونا تەپکێن سپی یێن خوینێ، و هاتنەخوارا توند یا دلی، بەلێ نوکە چارەسەرییا ڤان ب دەرمانان دهێتە کرن پێدڤی ب (الفصد) ناکەت، و بەخشینا خوینێ دهێتە هژمارتن جۆرەکێ (فصد)ێ، و نوکە دهێتە ب کارئینان ب رێکا دەرزیکەکێ ژ بۆ پشکنینا خوینا نەخۆشی. وەرگێر.

دویماهییا هەیڤێ ژی، چونکی چێ دبیت کێم ببیت، بەلکو د نیڤا هەیڤێدا دەمێ کو تیراتییێن خوینێ د ئارییایینە ژ بەر کو بەردەوام د زێدەبوونێدانە ژ بەر زێدەبوونا رۆناهییا هەیڤێ، و یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن: دبێژیت: ((خیرُ ما تداویتم به الحجامةُ والفصدُ))، و د فەرموودەکا دیدا: ((خیرُ الدواءِ الحجامةُ والفصدُ))[1].

(١) زاد المعاد (٤/٥٢)، و (الطب النبوي)، بپ ٤١. و فەرمووده یا هاتییە ڤەگوهاستن بێی گۆتنا وی (الفصد) بوخاری (٥٣٧١) ژ فەرموودا ئەنەسی ب گۆتنا ((إن أمثل ما تداویتم به الحجامة)) و موسلمی ڤەگوهاستییە (١٥٧٧) ب گۆتنا: ((إن افضل ما تداویتم به الحجامة)) یان ((هو من أمثل دوائكم)) و پەیڤا (الفصد) ئەم ل سەر نەراوەستاین د وان پەرتۆکێن فەرموودانداا ئەوێن ل بەر دەستێن مە: وەك ڤەکۆلین گۆت (زاد المعاد).

# نەخۆشییێن پیساتییێ

ژ ئامارێن مەترسی ئەوێن هاتینە کرن ل ئێك ژ دەزگەهێن زانستی یێن گرێدای ب کاروبارێن تەندروستی ل سەر ئاستێ جیهانێ هەمییێ نەخۆشییێن پیساتییێنە؛ ب رێکا پیسبوونا دەستان و ئاڤ و خوارنێ دهێنە ڤەگوهاستن، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ تووشی مەزنترین زیانان دبیت ئەو ژی وەکی ل خوارێ:

ل سەر ئاستێ جیهانێ هەمییێ سیە ملیۆن تووشبوویی ب تیفۆییێ هەنە، و شەش سەد ملیۆن ب کولبوونێن رویڤیکان، و دو سەد و پێنجی ملیۆن ب هناڤچۆنێ، و حەفت ملیۆن ب کۆلێرایێ، و پێنج ملیۆن ب کولبوونا مێلاکێ یا بەربەلاڤ، و سالانە سێ ملیۆن کەس دبنە قوربانی ڤان نەخۆشییان، مە های ژ ڤان نینە، مە های ژ دەنگ و باسێن شەرێن ناڤخۆیی دبیت، و دەنگ و باسێن بیڤەلەرزان، و کەڤتنا فرۆکان، بەلێ ڤان ژماران؛ سێ ملیۆن مرۆڤ سالانە دمرن ژ ئەگەرێ پیساتییا وان، و ژ ئەگەرێ بەروڤاژییا وان بۆ دویڤچۆنا سوننەتێ، و نیڤا وان زارۆکن، ژ ئەنجامێ نەگرنگی پێدانا وان ب پاقژییا دەستان، و شویشتنا وان بەری خوارنێ و ئەم گوهـ نادەینێ و گرنگییێ پێ نادەین، و یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن: ((بَرَكَةُ الطعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ، وَالْوُضُوءُ بَعْدَهُ))[1]، (ئانکو: بەرەکەتا خوارنێ یا د دەستنڤێژ شویشتنا بەری خوارنێ، و پشتی خوارنێدا).

و دەستنڤێژشویشتنا خوارنێ شویشتنا دەستایە بەری خوارنێ، و شویشتنا دەڤی، و شویشتنا دەستان ژ سوننەتێیە، و گرنگیدان ب تارەتگرتنێ، ئانکو ب پاقژییا تمام و دورست پشتی دەست رویڤەدانێ، ژ زار عەبدوللایێ کورێ ئەبی قەتادەی ژ زارێ بابێ

---

(١) ترمزی (١٨٤٦) یا ژ سەلمانی ڤەگوهاستی، ئەبو عیسا دبێژیت: ئەم ب تنێ ڤێ فەرموودێ دزانین ژ فەرموودا قەیسێ کورێ رەبیعی، و قەیسێ کورێ رەبیعی یێ زەعیفە د فەرموودێدا، و ئەبو داوود (٣٨٦١)، ئەبو داوود دبێژیت: ئەو یا زەعیفە.

خۆ دبێژیت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((إذا شَرِبَ أحَدُكُمْ فَلا يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ، وَإِذا أتَى الخَلاءَ فَلا يَمَسُّ ذَكَرَهُ بيَمِينِهِ، وَلا يَتَمَسَّحْ بيَمِينِهِ))[1]، (ئانكو: ئەگەر ئێکی ژ هەوە ڤەخوارنەك ڤەخوار بلا هەناسێ د ئامانیدا نەکەت، و دەمێ دچیتە دەست رویڤەدانێ بلا ب دەستێ راستێ دەستێ خۆ نەکەتە ئەندامێ خۆ یێ نێرینییێ، و ب دەستێ خۆ یێ راستێ پاقژ نەکەت).

هەناسەدان د ئامانیدا ئێکە ژ ئەگەرێن ڤەگرتنێ، ژ بەر ڤێ چەندێ: پێغەمبەری ﷺ نەهی یا ژ پفکرنێ (هەناسەدان) د ڤەخوارنێدا کری، زەلامەکی گۆت: ئەگەر مرۆڤی گلێش د ئامانیدا دیتن؟ گۆت: ((أهرِقْهَا)) ئانکو برێژە، گۆت: ئەز تێر نابم ب هەناسەدانەکێ، گۆت: ((فأبِنْ القَدَحَ - إذن - عَنْ فِيكَ))[2]، ئانکو: ئامانی ژ دەڤێ خۆ بدە پاش، و زار ئەبی سەعیدێ خودری گۆت: ((نَهَى رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم)عَنِ الشُّرْبِ مِنْ ثُلمَةِ القَدَحِ، وَأنْ يُنْفَخَ فِي الشَّرَابِ))[3]. (ئانکو: پێغەمبەرێ خودێ نەهی یا کری ژ تیکا پەرداغی ڤەخۆن، و پفکەیە د ڤەخوارنێدا). ئانکو پەرداغێ ب تیك، چونکی ڤێ تیکێ میکرۆب یێن تێدا، دیسا فەرمان یا ل مە کری نینۆکێن خۆ ببڕین، و فەرمان یا ل مە کری ب پەرخاندنا گەهێن تبلان، سەرێن تبلان، و دیسا ئەوێ فێقییەکی دخۆت بێی شویشتن هەر وەکی ئاخ خواری، و دەمێ ئێك ژ هەوە چۆ دەستئاڤەکێ بلا خۆ ب دەستێ راستێ پاقژ نەکەت، چونکی خوارنێ ب دەستێ راستێ دخۆت، و پێ دچیتە دەستێ خەلکی، و ئەگەر ب دەستێ راستێ خۆ پاقژ کر وی نەخۆشی ڤەگوهاستە هەمی خەلکی، ئەڤە ژ شیرەتێن پێغەمبەرینە ﷺ، و زار ئەبی هورەیرەی وی های ژ پێغەمبەری بوو ﷺ گۆت: ((لا يبولن أحدكم فِي المَاءِ الدَّائِمِ الَّذي

(١) بوخاری (١٥٢)، موسلم (٢٦٧)، ئەبو داوود (٣١)، نەسائی (٢٩)، ئیبن ماجە (٣١٠).

(٢) ترمزی (١٨٨٧)، ئەحمەد (١١٥٥٨)، مالك (١٦٥٠) زار ئەبی سەعیدێ خودری.

(٣) ئەبو داوود (٣٧٢٢)، ئەحمەد (١١٧٧٧).

لا يَجْرِي، ثمَّ يغتسِلُ فيه))[1]، (ئانكو: كەس ژ هەوە نەميزيتە د ئاڤا ڤەمايى يا كو نەچيت، پاشى د ڤێ ئاڤێدا خۆ بشۆت).

و زار ئيبن عەباس دبێژيت: من هاى ژ پێغەمبەرێ خودێ ﷺ بوو گۆت: ((اتقُوا المَلاعِنَ الثلاثَ)) قِيلَ: مَا المَلاعِنُ يا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: ((أنْ يَقْعُدَ أحَدُكُمْ فِي ظِلّ يُستظلُّ فِيهِ، أوْ فِي طَرِيقٍ، أوْ فِي نَقْعِ مَاءٍ))[2]، (ئانكو: خۆ ژ سێ نەفرەتان بدەنە پاش، گۆتێ: ئەو سێ نەفرەتە چنە؟ گۆت: ئێك ژ هەوە دەستاڤا خۆ ل بەر سيبەرەكێ خۆش بكت خەلك لێ روينيت، يان د رێكەكێدا، يان د گەرِا ئاڤێدا).

ئەڤە شيرەتێن پێغەمبەرينە ﷺ بەرى زانستەكێ ميكرۆبان هەبيت، و زانستێ نەخۆشييێن ڤەگر، و ئەڤە راپۆرتەكا رێكخراوەكێ بوو ب ساخلەمييێڤە ل سەر ئاستێ جيهانێ، و ب هەميڤە گرنگييێ نادەتە فەرمانا ئايينى، دبێژيت: سێ مليۆن مرۆڤ سالانە دمرن، و ئەم چو ژ وان نوزانين، دمرن ب ئەگەرێ نەپاقژييا دەستان، و نەشويشتنا وان بەرى خوارنێ، و نەگرنگيدانا ب تارەتگرتنێ، و ئەڤ ئايينە يێ هاتى دا رێكا راست بۆ خەلكى ديار كەت، ب راستى ئەڤ قورئانە بەرێ مرۆڤى ددەتە وێ رێكێ يا ژ هەمييان راستتر، و خودێ حەژ تۆبەدار و پاقژان دكەت.

---

(١) بوخارى (٢٣٦)، و موسلم (٢٨٢)، و ئەبو داوود (٦٩)، و نەسائى (٥٧)، و ژ بلى وان.

(٢) ئەحمەد (٢٧١٥).

# دودلی و تەقەلەقییا دەروونی ( العصاب )[1]

د پەرتۆکێن زانستێ دەروونیدا هاتییە، و نەخاسمە پەرتۆکێن نەخۆشییێن دەروونی کو ئەڤ نەخۆشییە تێکئاریانەکە ناهێتە زانین کو بنیاتەکێ تویکاری (تشریحی) هەبیت.

ئەڤە نەخۆشییەکا دەروونییە، یان نەخۆشییەکا فرمانییە، چو بنیاتەکێ ئەندامی نینە، د ڤێ نەخۆشییێدا نەرەحەتییەکا دەروونی یا هەی د گەل پاراستنا سلامەتییا هێزا عەقلی یا کەسی.

زانایێن دەروونی دبێژن: (ژ گرنگترین جۆرێن ڤێ نەخۆشییێ دودلییە، و ئەڤە بەربەلاڤترین جۆرە، چێ دبیت یا دەمی بیت، و چێ دبیت یا بەردەوام بیت، هندەکا پێناسە کرییە کو هەستەکێ نەرەحەتکەرێ دلئێشە، و زێرەڤانییا مەترسییێ دکەت، و ترس ژ مەترسییەکا چاڤەرێکری یا کو ژێدەرێ وێ بەرزە بیت).

ئێك ژ ئەدیبێن مەزن ب سەر خەلاتێن هەڤالەکێ خۆ هەلبوو کو ژ زەنگینان بوو، و خودان جهەکێ بلند بوو، ئەڤ زەنگینێ مەزن دبێژیت: (ئەز یێ د ترسەکا بەردەوامدا دژیم، ترس ژ خەلکی، و تشتان، و ترس ژ خۆ، نە سامان من ئارام دکەت، و نە جهێ من یێ بلند، و نە ساخلەمی، و نە زەلامینی، و نە ژن، و نە حەژێکرن، و نە ئاهەنگێن ب شەڤ، ئەز دلتەنگ بووم ژ هەمی تشتان پشتی کو من هەمی تشت تاقیکرین، ئەز نەفرەتا ل خۆ دکەم، و ئەز ژ خۆ دترسم، ئەرێ ما تو هەلامەتا ل دۆر من نابینی؟ ئەرێ هەست ب ترسێ ناکەی دەڤێ خۆ یێ ڤەکری دا من داعویریت؟ بۆچی ئەڤ ترسە هەیە؟ خەم بۆ من نەخەمن، چونکی هەمی تشت یێ ل بەر دەستێ من، پا بۆچی ئەز

---

(١) جۆرەکە ژ جۆرێن ترسێ دبیتە ئەگەرێ تێکچۆنا کەسایەتییێ و هەڤسەنگییا دەروونی، ژ نیشانێن ڤێ نەخۆشییا دەروونی: داماییبوون، و ترس، و نەمانا هەستا خۆشتڤیاتییێ و نەبوونا هەڤسەنگییا دەروونی، و دودلی و گۆمانێن چو بنیات بۆ نەی، یان دیاربوونا نیشانێن ناڤەکی وەکی هەستکرن ب ئێشانێ د ئەندامەکێ لەشیدا وەکی مەعیدەی بێی ئەگەرەکێ فەزیۆلۆجی. وەرگێر.

دترسم؟ چێ دبیت ئەز بترسم چونکی چو تشت نینە ئەز ژێ بترسم، ئەز ژ تشتەکێ نەدیار دترسم ئەز نانیاسم، ئەز یێ بەرزەمە د ژیانێدا، چونکی ئەز گەهشتمە گوپیتکا ژیانێ، و نوکە ژیان دژمنێ من یێ ئێکێیە، ئەز ژ ژیانێ بخۆ دترسم).

زانایێن دەروونی دبێژن: ل سەر پێدڤییێن مرۆڤان دئاخڤن: (مرۆڤی پێدڤی ب تەناهییێ هەیە، بەلێ ئەو تەناهی ل کیڤەیە؟ شیرێن نەخۆشییان یێن زال بوویی ل سەر خەلکی کو ناهێنە هژمارتن، ترس ژ وەرما پیس، ترس ژ نەخۆشییا دلی، ترس ژ پێ چێ نەبوونەکێ (عجزٍ)، ترس ژ ڤالنجێ، ترس ژ رزقی، مرۆڤ پێدڤی ب ئارامییێ هەیە، و پێدڤی ب سەرکەفتن و حەژێکرنێیە)، و زانایێن دەروونی ژ بیر کرییە مرۆڤی بەری ڤان هەمی پێدڤییان پێدڤی ب باوەرییێ هەیە، چونکی ئەگەر تو ئارام بووی، دێ حەژ هەمی ئافراندییان کەی، چونکی خودانکرییێن خودێنە، و دەمێ تە باوەری ئینا تو د ب جهئینانا نهێنییا هەبوونا خۆدا سەرکەفتی.

زانایان جودایییا د ناڤبەرا ترسا ئەرێنی و ترسا نەرێنیدا یا کری، و دەمێ تو ژ خودێ ترسیای و ل سەر فەرمانا وی راوەستای و ژ بەر کو دا تو ئارام بی، ل ڤێرە ترس ژ خودێ رێکا ئارامی و تەناهی و بەختەوەری و حەژێکرن و سەرکەفتنێیە، بەلێ ئەگەر تو ژ بلی وی ترسیای ئەو دێ بیتە رێکا تێکچۆن، و رێکا ڤێ تێکئاریانێ (عصاب)، و رێکا خوسارەتییێ، خودێ دبێژیت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ [الرعد:٢٨]؛ (ئانکو: ئەوێن ب بال خودێڤە زڤرین و هاتینە راستەرێکرن) ئەون ئەوێت باوەری ئینایین و دلێ وان ب بیرئینان و زکرێ خودێ ڤەدهەسیت و تەنا دبیت، (باش) بزانن دل ب بیرئینان و زکرێ خودێ ڤەدهەسن و تەنا دبن).

ئەگەر خودێ گۆتبا: (تطمئن القلوب بذكر الله)، ل دویڤ زمانی ب بیرئینانا خودێ تەنا دبن، و تەنا دبن ب بیرئینانا ژ بلی وی، بەلێ دەمێ بیرئینان بەری تەنایێ ئێخستییە چونکی دل تەنا نابن ب تنێ ب بیرئینانا خودێ نەبیت، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ د هندەك ئایەتێن دیدا دبێژیت: ﴿إِنَّ الْإِنْسَانَ خُلِقَ هَلُوعاً (١٩) إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزوعاً (٢٠) وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا (٢١) إِلَّا الْمُصَلِّينَ (٢٢) الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ (٢٣)

وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ (٢٤) لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ (٢٥) وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ (٢٦) وَالَّذِينَ هُمْ مِنْ عَذَابِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ (٢٧) إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ (٢٨) وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٢٩) إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٣٠)) [المعارج]، (ئانكو: مرۆڤ چاڤترسیایی و بێنتەنگ یێ هاتییە چێكرن. ئەگەر نەخۆشی گەهشتێ (چ نەساخی و چ هەژاری و هەر نەخۆشییەكا دی) یێ خەمگین و بێ هیڤی و ب ئاخ و ئۆفە. و ئەگەر خودێ قەنجی د گەل كر و دەستێ وی فرەهـ كر، و چو ژ دەستان دەرناكەڤیت. نڤێژكەر تێ نەبن. ئەوێت ل سەر كرنا نڤێژان بەردەوام. و ئەو تێ نەبن ئەوێت بارا خودێ دئێخنە د ناڤ مالێ خۆدا. بۆ فەقیر و ژار و خوازخوازۆكان. و ئەو تێ نەبن ئەوێت باوەرییێ ب رۆژا جزادانێ دئینن. و ئەو تێ نەبن ئەوێت دلێ وان یێ ب ترس ژ ئیزادانا خودێ. ب راستی عەزابا خودایێ وان نەیا هندێیە ژێ پشت راست ببن. و ئەو تێ نەبن ئەوێت داڤ و دەهمەن پاقژ و شەرمگەها خۆ دپارێزن ژ هەر كەسەكێ. ژ بلی ژن و جێرییێت خۆ، و ئەو بۆ ڤێ نە د لۆمەدارن، و گازندە ژ وان نائێتەكرن).

هزرا ڤی بابەتی ئەوە بهاترین هەست تە هەبیت د ژیانێدا ئەوە تو یێ تەنا و ئارام بی، ژ زارێ سەلەمەیێ كورێ عوبەیدوللایێ كورێ میحسەنێ خەتمی ژ زارێ بابێ خۆ و وی هەڤالینی هەبی دبێژیت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ، مُعَافًا فِي جَسَدِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا))[1]، (ئانكو: ئەوێ د مالا خۆدا یێ تەنا، و یێ ساخلەم بیت د لەشێ خۆدا، و تێرا خۆ خوارنا رۆژانە هەبیت هەر وەكی دنیا ب بەرڤە هاتی).

پاشایەكی ب ناڤ و دەنگ پسیار ژ وەزیرێ خۆ كر: كی پاشایە؟ گۆتێ: تو، پاشای، گۆت: نەخێر، پاشا كەسەكە ئەم نانیاسین و ئەو ژی مە نانیاسیت، وی خانییەك یێ هەی تێدا دحەویت، و هەڤژینەك وی رازی دكەت، و رزقەك تێرا وی بكەت، ئەگەر وی ئەم

(١) ترمزی (٢٣٤٦)، و گۆتن یا وییە، و ئیبن ماجە (٤١٤١).

نیاسین پێکۆل کر مە رازی بکەت، و ئەگەر مە ئەو نیاسی دێ پێکۆلێ کەین وی شکێنین.

ئەڤ پێدڤییێن سەرەکی یێن دەمێ دهێنە ژ دەستدان باراپتر نەخۆشی یێ د پشترا هەین، هەر چەندە نوژداری بەرەڤ پێش دچیت دیار دکەت کو توندییا دەروونی یا ل دۆر باراپترى نەخۆشییان، و تەنایی یا ل پشت ساخلەمییێ، ژ بەر ڤێ چەندێ چو تشت وەکی ئێکتاپەرێسییێ ئارامییێ نادەنە تە، و چو تشت وەکی هەڤپشکییێ دلی تژی ترس ناکەت، خودێ دبێژیت: (فَلا تَدْعُ مَعَ اللهِ إِلَهاً ءاَخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ) [الشعراء:٢١٣].

# نەخۆشییا کێمییا رویشالان ( ألياف )

لێزڤرینێن گرنگییێن هەین د دیرۆکا زانستێن خوارنێدا، لێزڤرینا ئێکێ: ئاشکەراکرنا میکرۆبان کو خوارن پێ دهێتە پیسکرن، دبیتە ئەگەرێ گەلەك نەخۆشییان، و لێزڤرینا دووێ: ئاشکەراکرنا هندەك مەترسییان، ئەگەر مرۆڤی دەستدرپاتی د خوارنا هندەك خوارناندا کر، ئەو لێزڤرینەکا دییە د دیرۆکا ساخلەمییێ و خوارنێدا، دیسا گەلەك نەخۆشییێن هەین ئەگەرێ وان کێمییا کەرستێن خوارنێیە.

بەلێ تشتێ نوکە هاتییە ئاشکەراکرن ئەوە نەخۆشییا سەردەمی ئەو ژی نەخۆشییا کێمییا رویشالانە، ژ بەر کو سروشتێ سەردەمێ نوی (نوکە) خوارنەکا زەلال پێشکێش دکەن، دێ بینین شەکر سپییەکێ هویرە، و ئار یێ سپییە چو زێدەیێن دی د ناڤدا نینە، و فێقی ب شێوێ شل (شەربەت) ڤەدخۆین، و هەمی تشتان رویشالێن وان نەهێلاینە یێن کو خودێ تێدا چێ کری.

کەسەك نەبوو وێ هزرێ بکەت کو ئەڤ رویشالە بنیاتێ فێقینە، یان ڤان تیڤکلێن ل دۆر دندکا گەنمی، یان ڤان رویشالان کو د هندەك کەرستێن شەکرێدا گەلەك مفا یێن هەین، ئەم ژی ژێڤە دکەین، و ئەم وەسا ددانین کو ژ تشتێن بێ شۆل و بێ مفانە، ئەم شەربەتەکا زەلال ڤەدخۆین، و نانەکێ سپی دخۆین، و شەکرا پاقژ ب کار دئینین، ئەڤ خوارنا زەلالکری، کو ئەو ژ دائێنەرێن سەردەمێ نوییە ل پشت گەلەك نەخۆشییانە.

زانایان هزر دکر ئەڤ رویشالە توخمەکێ زێدەیە ژ پێدڤیبوونێ، و رۆلێ وان د هەرسکرنێدا یێ نەرێنییە، ژ بەر ڤێ چەندێ وان ئەڤ چەندە دزانی ل دویڤ وێ زانینا ل دەڤ وان هەی، د گۆتن: (ئەو پشکەکە ژ خوارنێ کو د کەنالێن هەرسکرنێدا دچیت، بێی بهێتە هەرسکرن)، وان ددیت بارگرانییەکە ل سەر کۆئەندامێ هەرسکرنێ، ژ بەر ڤێ چەندێ وان ب مەبەستا خۆ خوارن ژ ڤان (رویشالان) پاقژ کر، و بۆ مە پێشکێش کر ب ناڤێ (خوارنا پاقژ).

ب راستی ئێکەم مەترسییێن ڤێ خوارنا پاقژ قەڤزییە، چونکی قەبارێ ڤان رویشالان ب تنێ ساناهیکرنا کارێ رویڤیکایە، و لڤینا رویڤیکان دەمێ لڤینێ دکەن دا خوارنێ هەرس بکەن پێدڤی ب کۆمەکا رویشالان هەیە، دیوارێن رویڤیکان پال ددەت، و ئەگەر ئەڤ رویشالە نەمینن، و خوارن هەمی ما شلە، و ب ێ ڤالا بیت ژ ڤان رویشالێن مفا، دێ قەڤزبوون ئێکەم مەترسییا ڤێ خوارنا پاقژ بیت.

تشتەکێ دی، زانا دبێژن: (ئەڤ کەرستێن سلیلۆزی ـ رویشالە ـ کار دکەن بۆ مێژتنا ئاڤێ، و پاراستنا وێ دکەن، دا هەرسکرن ب سناهی و نەرم بیت، هەر وەکی تشتێن رۆن و نەرم).

تشتێ سێیێ: ئەڤ رویشالێن سلیلۆزی کار دکەن بۆ مێژتنا کەرستێ کۆلیسترۆلێ ـ دوهن ـ و هەبوونا کۆلیسترۆلێ د ناڤ خوینێدا، یان ڤەمانا وان ب دیوارێن لۆلەیێن خوینێڤە، دبیتە ئەگەرێ مەترسیترین نەخۆشییێن سەردەم، ئەو ژی نەخۆشییا دلییە و مەترسیترین نەخۆشییا سەردەم تەنگبوونا خوینبەرانە، و هندەك زانا دبێژن: (ژییێ مرۆڤی یێ ب ژییێ خوینبەرێن ویڤە گرێدایە)، و دەمێ تەنگبوون لێ پەیدا بوو، و دەمێ کەرستێن دوهنی د ڤەمایی بن د ناڤدا، ل ڤی دەمی دێ دل وەستیت، و ئەڤ رویشالێن ئەم ژ خوارنێ دهاڤێژینە دەر، پەرداغێ شەربەتێ ئەم ڤەدخۆین، و رویشالان دهاڤێژین وەك ئالفەك بۆ گیانەوەران، ب راستی مرۆڤ گەلەکێ پێدڤی ب ڤان رویشالایە، چونکی کەرستێن ڤەلەوییێ (الدسمة) دمێژن، و رێژا دوهنان د ناڤ خوینێدا هەڤسەنگ دکەن.

تشتەکێ دی: ئەو ژی دەرهاڤێژتنا هندەك شلەیان، وەکی شلەیێ زەرکێ بۆ نموونە کو مێلاك دەردکەت، دەرهاڤێژتنەکا بەردەوام، بێی هەبوونا ڤان رویشالان دێ بیتە ئەگەرێ هندەك نەخۆشییێن پیس د قۆلۆنێدا، و هەبوونا ڤان رویشالان کەرستێن دوهنی دمێژیت، و هندەك دەرهاڤێژتنێن رژێنان، و لڤینا رویڤیکا ساناهی دئێخیت، هەتا هندەکان ژ وان گۆت: دورستبوونا بەرکا، و بلندبوونا کۆلیسترۆلی د خوینێدا، و ڤەمانا وێ ب دیوارێن خوینبەرانڤە، و شێرپەنجا قۆلۆنێ، و هندەك نەخۆشییێن دلی و لۆلەیان،

و قەڤزبوون، و هندەك نەخۆشییێن (دوالي)[1]، و هندەك نەخۆشییێن ناڤبەنجکێ (الحجاب الحاجز)، و کولبوونا رویڤیکا کۆرە، ئەگەرێ بارا پترى ڤان نەخۆشییان نەبوونا رویشالانە د خوارنێن مەدا.

ژ بەر ڤێ چەندێ، پێدڤییە ئەم بزڤرینە وی تشتێ خودێ چێ کرى، تشتى ب خۆ وەکى خودێ چێ کرى، بێى راستڤەکرنەکێ تێدا بکەین، ل دویڤ شێوازێن نوى نەچە بۆ خوارنێ، خوارنێ بخۆ وەکى خودێ دڤێت بهێتە خوارن.

زانا ڤێ ئاشکەراکرنێ دهژمێرن لێزڤرینا چوارێ یا گرنگ، د رێکا ساخلەمییێ و خوارنێدا، خوارنا خۆ بکە سەر شێوێ وێ یێ سروشتى بێى تو پاقژ بکەى، بێى تو ڤان رویشالان ژێ بکەیە دەر، کو بەرى دەم وەسا هزر دکر چو مفا نینە، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ وان هەرس ناکەت، ئەو نەبارگرانینە ل سەر.

پێدڤییە بۆ مە ئەم حیکمەتا خودێ د هەمى چێکرییاندا تێ بگەهین و بزانین، و چێ نابیت ئەم گوهۆرینێ د چێکرییێن خودێدا بکەین، و نابیت ئەم راستڤەکەین.

---

(١) بەرى نوکە یا هاتییە رۆنکرن.

# نەخۆشییا ئایدزێ

جیهانا میکرۆبان جیهانەکە ژ نوی یا هاتییە ئاشکەراکرن، بەلکو پەیڤا میکرۆب د زمانیدا ئانکو بنیاتێ تشتی، و ئەڤ زیندەوەرێ گەلەك هویر، ئەوێ ب چاڤی نەهێتە دیتن، و نەهێتە زانین ب هەستەوەرگران ناڤلێنایە میکرۆب، چونکی بنیاتێ نەخۆشییێیە، و د قورئانا پیرۆزدا ئاماژەکا جوان یا هەی بۆ ڤی بابەتی، خودێ دبێژیت: (فَلا أُقْسِمُ بِمَا تَبْصِرُونَ (٣٨) وَمَا لا تُبْصِرُونَ (٣٩)) [الحاقة]، (ئانکو: سویند ب یێ بەرچاڤ (یێ هوین دبینن). سویند ب یێ نەبەرچاڤ (یێ هوین نەبینن).

ئەڤا هوین نەبینن ئەو غەیبا رێژەییە، و غەیبا رەهایی ئەو تشتێ کو نە ل تخوبێ ژیانا مەدا بیت، بەروڤاژی غەیبا رێژەیی کو یا هەی، بەلێ هەستەوەرگرێن مە نەشێن ببینن، و بزانن، و هەستکرنێ پێ بکەن، و ل ڤێرە پسیارەکا گرنگ یا هەی، ئەڤ بوونەوەرێن هویر یێن د هەمی ژیانا مەدا هەین، د خوارن و ڤەخوارن و هەناسە و تێکهوسینا مە بۆ ئێك، و د لڤین و راوەستانێن مەدا، ئەرێ ما نا چێ بیت د وی شەریعەتێ ل دەڤ خودێ تشتەك تێدا بیت یێ گرێدایی بیت ب ڤان بوونەوەرانڤە؟

د خوینا هەر ئێك ژ مەدا سێ جۆرێن تەپکان یێن هەین، جۆرێ ئێکێ: تەپکێن سۆر، و ڤەکۆلینەکا درێژ یا هەی، و جۆرێ دووێ: تەپکێن سپی، و جۆرێ سێیێ: پەرکێن خوینێ.

و تەپکێن سپی لەشکەرەکە ب بەرەڤانییا لەشی رادبن هەمبەری هەر هێرشەکا میکرۆبان، و نوژدار دبێژنە تەپکێن سپی کۆئەندامێ بەرگرییێ، ئەو د ناڤ خوینێدا دچن، و کاودانێن تایبەت یێن هەین، و د شیانێن واندایە بەروڤاژی چۆنا خوینێ بچن، و دشێن ژ لۆلەیێن خوینێ بچنە شانێن ماسۆلکەیی، و دشێن ژ هەمی سیستەمێن نەلف دەربچن ئەوێن د لەشیدا هاتینە دانان.

ئەڤە چ تەپكێن سپینە؟ وان كەلهە یێن هەین ژێ دەردكەڤن، ئەڤە چ كەلهەنە؟ ئەڤە گرێكێن لیمفینە، ئەڤە وەكی كەلهانە هژمارەكا مەزنا تەپكێن سپی تێدا كۆمڤە دبن.

هندەك زانا دبێژن: (هندەك ژ ڤان تەپكان ب كارێ سەحلێكرنێ رادبن، و دەمێ میكرۆبەكێ غەریب چۆ د ناڤ لەشیدا دێ ئەڤ تەپكێن سپی خۆ نێزیك كەن دا وی بنیاسن، و دا پێكهاتێ ڤی میكرۆبی بنیاسیت، و جهێن لاوازییا وی، چییە میكرۆبێ غەریب ژ كاری دئێخیت؟ و كییە وی گرێ ددەت؟ و كییە كۆنترۆلێ ل سەر دكەت؟ و ئەڤ تەپكە دزڤرنەڤە، و هەر وەكی بوونەوەرێن عاقلن، د بلندترین پلەیا زیرەكییێدا، دێ زڤرنە جهێ ئەو ژێ هاتین، بۆ گرێكێن لیمفی دا دەنگ و باسی بگەهینیتێ ل سەر سروشتێ ڤی میكرۆبی، و جهێن لاوازییا وی، و رێكا دەست سەرداگرتنا وی، دێ د ڤان گرێكاندا كەرستەكی دژی میكرۆبان چێ كەن.

هندەك تەپكێن سپی یێن دی هەنە كارێ وان چێكرنا چەكینە، تەپكێن ئێكێ كارێ وان سەحلێكرنە، و یێن دووێ كارێ وان چێكرنا چەكییە، كو د ڤان گرێكاندا ئەو دەرمانە (مصل) چێدبن ئەڤێن دشێن كۆنترۆلێ ل سەر ڤی میكرۆبی بكەن.

هندەك تەپكێن دی خودان سروشتەكێ شەڕكرنێنە، ڤان هەڤدژان دهەلگرن و بەرەڤ دژمنێ میكرۆبی دچن، و دۆرپێچ دكەن هەتا ژ ناڤ دبەن، و دەمێ مرۆڤی نیشانەكا سپی دیت ل هندەك ئەندامێن خۆ؛ بلا بزانیت شەڕەكێ مەزن یێ د ناڤبەرا تەپكێن سپی و ڤی میكرۆبێ غەریبدا هاتییە كرن.

و د لەشێ مرۆڤیدا هێلێن بەرڤانیكرنێ هەنە، ئەڤ تەپكێن سپی یێن سەحكرنێ هێلا ئێكێ دورست دكەن، و گرێكێن لیمفی هێلا دووێ دورست دكەن، و دەمێ میكرۆب د ڤان گرێكێن لیمفیدا دەرباز دبیت، دێ هۆشدارییا گشتی راگەهینیت، ل ڤی دەمی دێ پلەیێن گەرمێ بلند بن، و دێ لەش لاواز بیت ژ كرنا كارێن خۆ یێن رۆژانە، و دێ نیشان دیار بن یێن كو ئاماژێ ددەنە هەبوونا نەخۆشییەكا میكرۆبی یا گشتی).

ئەڤ كۆئەندامە ب هەر سێ تۆخمێن خۆڤە؛ سەحكرنێ، و چێكرنێ، و شەڕكەرییێ، و سەركێشییا ناڤەندی، و نەخشێن وێ یێن زانایانە ژ بەرەڤانیكرنا لەشی، ئەڤ كۆئەندامێ

بەرگرییێ هندەك جاران تووشی ژ ناڤچۆنێ دبیت، هەر وەکی د نەخۆشییا ئایدزێدا، کو ئەڤرۆ جیهان ل سەر وێ دئاخڤیت.

هەر وەسا ل ڤێ دویماهییێ نەخۆشییا کولبوونا گولچیسکا یا کوژەکا تەڤایی دەرکەڤت (سارس)، و هەتا نوکە ژی سوننەتا خودێ یا رابردوویە د چێکرییێن ویدا.

و ئەوا سەرنجا من راکێشای ئەوە پێغەمبەری ﷺ د هندەك فەرموودەیاندا بەحسێ تشتەکێ ڤێ نەخۆشییێ کرییە، زار عەبدولایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ هاتە دەڤ مە، گۆت: ((يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ، لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا، وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِلا أُخِذُوا بِالسِّنِينَ، وَشِدَّةِ الْمَؤُونَةِ، وَجَوْرِ السُّلْطَانِ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ إِلا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْ لا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا، وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللهِ وَعَهْدَ رَسُولِهِ إِلا سَلَّطَ اللهُ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَخَذُوا بَعْضَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتَابِ اللهِ، وَيَتَخَيَّرُوا مِمَّا أَنْزَلَ اللهُ إِلا جَعَلَ اللهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ))[1]، (ئانکو: گەلی مشەختییان پێنج تشتن ئەگەر هوین پێ هاتنە تاقیکرن، و ئەز خۆ ب خودێ دپارێزم هوین نەگەهنێ، نینە مللەتەکی فاحیشە د ناڤدا ب ئاشکرایی بەلاڤ ببیت ئیللا دێ (طاعون) و ئێش و دەردێن د ناڤ مللەتێن بەری واندا نەی لێ دیار بن، و ئەو کێمییێ د کێشان و پیڤانێدا ناکەن ئیللا دێ خەلا و گرانی د ناڤدا پەیدا بیت و دەستهەلاتەکا زۆردار لێ زال بیت، و زەکاتا مالێ خۆ نەدەن ئیللا دێ ژ بارانێ بێ بار بن، و ئەگەر ژ بەر گیانەوەران نەبیت ناباریت، و ئەو سۆز و پەیمانان د گەل خودێ و پێغەمبەری نابڕن ئیللا دێ خودێ دژمنەکی ژ غەیری وان ل سەر زال کەت، و هندەك ژ وی تشتێ د دەستیدا ژێ ستینن، و هندی مەزنێن وان حوکمی ب پەرتۆکا خودێ نەکەن، و وێ ژێ بگرن یا خودێ ئینایە خوار ئیللا دێ خودێ وان ڤێکرا بەردەت.

---

(١) ئیبن ماجە (٤٠١٩).

ڤێ نەخۆشییا ڤەگر یا تەڤایی هەمی جیهان گرتییە، و ئەگەرێ وێ ڤایرۆسەکە بەری نوکە نەیێ بەرنیاس بوو، و ل دویڤ ئامارێن رێکخراوا ساخلەمییا جیهانی بەری چەند سالان سیە و چوار ملیۆن د جیهانێدا یێن تووشی ڤێ نەخۆشییێ بووین، بەلێ شارەزاییێن ساخلەمییێ دوپات دکەن کو هژمارا دورست چێ دبیت دوجاری ڤێ هژمارێ بیت، یان پتر. و تشتێ ژ ڤی کاودانی خرابتر ئەوە نەشیانا جیهانێ ب هەمی دامەزراو و دەستەکێن خۆ یێن زانستیڤە، و شیانێن خۆ یێن مالی ژ چێکرنا پیتێنێ هەڤدژ بۆ ڤێ نەخۆشییێ.

ئەڤ ڤایرۆسە بارا پتر د کاودانێن خۆدا بەلاڤ نابیت ب تنێ د ماوێ کریارا جنسی یا حەرامدا نەبیت، و سەربەردانا جنسی، و ئالۆدەبوون ب کەرستێن بێهۆشکەر، و د ماوێ بەلاڤبوونا گەشتیارییێدا پێخەمەت کرنا جنسی، ئەو - و ئەڤە ژ حیکمەتا ئافرێنەرییە - یا گرێدایە ب رەوشتێ کەسی ب پلە ئێك، و جوداهییەکا مەزن یا هەی ئەڤ نەخۆشییا تەڤایی یا تایبەتمەندە ب وێ، چونکی دێ بینین چارەسەرییا وێ دگەهیتە پلەیا مەحالێ، چونکی چارەنڤیسێ هەر تووشبوویەکی مرنە، و دێ بینین ل هەمان دەمدا پاراستن ژ وێ یا ب سناهییە کو هەر کەسێ تووش نەبوویە ڤێ نەخۆشییێ دێ وی پاراستنەکا تمام هەبیت د ماوێ پێگرییا وی ب رێبازا خودایی ژ لایێ دەهمەنپاکییێ و مانا ل سەر رێکا راست، و هەر دلچۆنەکا خودێ دایە مرۆڤی کەنالەکێ پاقژ یێ بۆ چێ کری کو لڤینێ تێدا بکەت، و فەرمانێن ئایینی گەرەنتینە بۆ ساخلەمییا مە، و نە زنجیرکرنن بۆ ئازادییا مە.

تشتێ حێبەتی ئەوە ئەڤ ڤایرۆسە دشێت شێوێ خۆ د هەر دەمەکیدا بگوهۆریت، ئەگەر تو هزارەها ملیۆنان د ڤەکۆلینێن زانستیدا بمەزێخی ژ بۆ دیتنا دەرمانەکی بۆ وێ دێ ئەڤ مالە و ئەو زەحمەتە ب بەر ئاڤێدا چن، و ڤی ڤایرۆسی گەلەك دویندەھ یێن هەین، ئەوێ ژ دویندەھەکا وان رزگار بوو دێ ئێکا دی هێتێ، هەر وەکی خودێ ژ وی مرۆڤێ سەرداچۆی دڤێت ئەوێ رزگار بیت ژ ڤێ نەخۆشییێ ب دەهمەنپاکییێ و مانا ل سەر رێکا راستە، نە دەرزیکدان و دەرمانایە، خودێ دبێژیت: (ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا

كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) [الروم:٤١]، (ئانكو: خرابی و نەخۆشی و تەنگافی ل گوند و باژێریێت سەر ئاڤێ و ل ییێت نە ل سەر ئاڤێ، ئاشکرابوو ژ بەر گونەهێت مرۆڤان، دا تاما جزایێ هندەك ژ وان گونەهان نیشا وان بدەت، بەلکی تۆبە بکەن و ل خۆ بزڤرن).

تشتەکێ دی زانا دبێژن: ئەو ژی ئەگەر ئەم تشتەکی د هزرا خۆدا ڤەهینین و بێژین - و ئەڤە نێزیکترە بۆ مەحالی - کو ماندیبوون و زەحمەتا زانایان د پێنج سالێن بهێندا گەهشتنە دەرزیکدانەکا هەڤدژ بۆ ڤی ڤایرۆسی؛ دێ مەزاختییێن چارەسەرییا هەر نەخۆشەکی دێ گەهنە پتر ژ دەه ملیۆنان.

د ڤەکۆلینەکا هویردا هاتبوو کرن د وەلاتەکێ ئەڤ نەخۆشییە گەلەك تێدا بەلاڤ ببوو ژ ئەگەرێ جنسێ حەرام و سەربەردانا جنسی؛ دیت کو د هەر دەه چرکاندا مرۆڤەك ب ڤێ نەخۆشییێ دمر، و ئەڤ ڤەکۆلینە د هندەك راگەهاندنێن جیهانیدا بەلاڤ کرن، ئەو ژی کو ئەڤ نەخۆشییە بەلاڤ دبیت ب رێزبەندەکا ئەندازەیی، وەدیارە کو رێزبەندا ئەندازەیی ژی دەربرینێ ژ ڤەبارێ بەلاڤبوونا وێ ناکەت، یا پێدڤییە ئەم بێژین: ئەڤ نەخۆشییە ب رێزبەندەکا وەك پەڤینەکا ب ترس بەلاڤە دبیت، و هندەك ڤەکۆلینێن دی یێن ئامارەیی هەنە تەخمین دکەن چێ دبیت هژمارا تووشبوویان د جیهانێدا ل سالا دو هزارێ بگەهنە سەد و بیست ملیۆنان تووشبوویان، ئەڤە هاتبوو بەلاڤ کرن د گۆڤارەکێدا ل دیمەشقێ، و هندەك د وێ باوەرێدانە کو کەسێ هەی تووشبوویێ ڤێ نەخۆشییێیە و هەلگرێ وێیە، بەلێ ئاشکەرا بوو کو هەلگرێ ڤایرۆسێ ڤێ نەخۆشییێ یێ تووشبوویە ب وێ، بەلێ هێژ یێ د خۆلا داییناییێدا (الحضانة)، و نیشانێن وێ یێن بترس پیچ پیچە دیار دبن، چێ دبیت ب سالان ڤەکێشیت، و چو رامان نینە بۆ جوداییکرنا د ناڤبەرا تووشبوویی و هەلگریدا، چونکی جوداهی د ناڤبەرا واندا ب تنێ دەمە، و نەجوداهییا جۆرییە.

و ژ جوداهییێن مەزن ئەوە دەولەتێن پێشکەڤتی - ب پیڤەرێ سەردەمی یێ ماددی - ب هەمی شیانێن خۆ یێن ماددی و زانستی نەشیاندارن و بێی چو ژ دەستان بهێت هەمبەر

لاوازترین ڤایرۆس هەتا نوکە، ب ملیۆنەها ئەوێن ژ رێکا راست دەرکەفتین ب رەوشتێن خۆ (ژ رێبازا راست و دورست) دکوژیت، و هەر وەکی ئەڤ ڤایرۆسە سەربازەکە ژ سەربازێن خودێ، (وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلا هُوَ) [المدثر: ٣١]، (ئانکو: کەس نوزانیت کا خودایێ تە چەند لەشکەر هەیە و کا چنە). خودێ کرییە سزایەکێ ب لەز بۆ ئەوێ ژ فیترەتا ساخلەم دەردکەڤیت، دێ سەردا چیت، و بەرزە بیت، و خراب و پویچ بیت، چونکی چو رێك نینە بۆ رزگاربوونێ ژ ڤێ نەخۆشییێ ب تنێ زڤرینە بۆ رێبازا دورست و رێکا راست، و تشتێ ڤێ چەندێ دوپات دکەت، و ئەڤی تشتی زانا حێبەتی کرن ئەوە دەمێ پێشی لمبیسا خۆ د لەشێ نەخۆشیرا دبەتە خوارێ، و خوینا وی یا پیس وەردگریت، پاشی ڤەدگوهێزیت بۆ مرۆڤەکێ ساخلەم ژ ڤی ڤایرۆسی، و لمبیسا خۆ دبەتە خوار د خوینا وی یا پاقژدا، و خوینا ساخلەمی تێکەلی خوینا نەخۆشی دبیت، ئەڤ نەخۆشییە ناهێتە ڤەگوهاستن، ئەرێ ما ئەڤە نە نیشانەکا دیارە دسەلمینیت کو خودێ ئەڤ نەخۆشییا کوژەك سزایەك بیت بۆ رەوشتێ کرنا جنسێ حەرام نە چو دی، و تووشبوون نەکرییە هەرەمەکی (عشوائي)؟

ئەگەر خەلکێ دڤەرەکێ ئاڤەکا پیس ڤەخۆن، و پاشی نەخۆشی و نەخۆشییێن تەڤایی د ناڤ خەلکێ وێدا پەیدا بن، ئەرێ یا بەرعاقلە ئەم بهێلین ئەڤ ئاڤا پیس خەلکێ ڤێ دڤەرێ بکوژیت، پاشی ئەم ل دەرمانەکی هەڤدژ، و دەرزیکدانا چارەسەرییێ بگەرین، و نوژداران پێشکێش بکەین، و هاندانا چارەسەرییێ بکەین، و ئامویران بینین، یان عەقل و حیکمەت د هندێدایە کو ئەم ئاڤا پیس راوەستینین، یان ڤێ ئاڤێ ژ پیساتییێ خلاس بکەین، و ل ڤی دەمی دێ ئەم ئارێشێ دۆرپێچ کەین، و دێ تخویبەکی بۆ بەلاڤبوونا وێ دانین، و پاشی بزڤرینە چارەسەرکرنا تووشبوویان؟

مخابن ئەڤە ناهێتە کرن ل هەمی جیهانێ، دێ بینین ئەو ل بەرسینگگرتنا ئەگەران ناراوەستن، بەلکو هەولدانا دکەن نیشان و ئەنجامێن وێ نەهێلن، ب راستی دەرهەمەکێ پاراستنێ چێترە ژ مەزاختنا گەلەك مالی بۆ چارەسەرییێ، (أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَنْ يَهْدِيهِ مِنْ بَعْدِ اللَّهِ

أَفَلَا تَذَكَّرُونَ) [الجاثية:٢٣]، (ئانكو: ئەرێ تە ئەو دیت ئەوێ خۆشی و دلخوازییا خۆ کرییە پەرستی بۆ خۆ، و خودێ ژ بەر هندێ گومڕا و ڕێبەرزە کری، هەرچەندە هەقی ژی دزانی (بەلێ ڕێکا هەقییێ نەدگرت، ژ بەر هندێ هێژایی گومڕایی و بەرزەبوونێ بوو، نە هێژایی راستەڕێکرنێ بوو)، و خودێ دل و گوهێت وی مۆرکرن، و پەردە ئێخستنە بەر چاڤێت وی، ئەرێ (ئەگەر خودێ وی راستەڕێ نەکەت) کی هەیە پشتی خودێ وی راستەڕێ بکەت؟ ڤێجا ما هوین چامەیەکێ بۆ خۆ ناگرن).

ئەو گەنجێ ل کارەکی دگەریت، پاشی ل هەڤژینەکێ دگەریت، ئەو ب ئاشکەرایی یێ ل بێ منەتییا خۆ دگەریت، و پێدڤییا خۆ دابین دکەت، و ئەو د راستیدا یێ کار دکەت بۆ ئاڤاکرنا ئوممەتا خۆ، چونکی خێزانا پاقژ یا پێکڤە گرێدایی خانا ئێکێیە د لەشێ جڤاکێ هەڤسەنگێ پێشکەڤتیدا، و ئەو گەنجێ کارێ خۆ پاشگوه دهاڤێت، و دەم بۆراندنا خۆ ب رێکێن نەشرعی دبۆرینیت، و د گەل ژنێن بێ رەوشت، ئەڤە کار دکەت ج وی بڤێت یان نەڤێت، ج بزانیت یان نەزانیت بۆ پویچکرن و ژ ناڤبرنا خۆ، و خێزانا خۆ، و جڤاکێ خۆ، ئوممەت ب تنێ ب گەنجێن خۆ یێن ساخلەم و ب هێز و راستەڕێ، و کچێن وێیە؟!

و یێ ئەڤا ل خوارێ گۆتی، گەلەك باش گۆتییە:

يا بنات الجيلِ هيَّا حصِّنوا هذا البناء

احفظوا جيلَ الشباب أرشدوهم للصواب

فهم النبع الغزير ولكم عذب الشراب

حصِّنوا كلّ الشباب لينيروا كالبدور

يسِّروا أمر الزواج لا تغالوا بالمهور

واحذروا داء التباهي بالأثاث والقصور

انما نبع السعادة كامن ضمن الصدور

احذروا الفيروس فهو الآن جمر يختفي تحت الرماد
إن تجاهلنا الحقيقة فاجأتنا النار يوماً واكتوى كل العباد
بدّدوا الجهل بعلم أيقظوا أهل الرقاد
توّجوا العلم بطهر صادق فهو العماد
ها هو الفروس يغتال الضحايا قاصداً كل البلاد
وهو أعمى عن شباب طاهر يأبى الفساد

* * *

إنما العفة ماء بارد عذب زلال
يطفىء الجمر ويروي كل من طلب الحلال

زانا دبێژن: (ئەگەرێ ئێكێ يێ ڤێ نەخۆشييێ بەربەلاڤبوونا جنسێ حەرامە، نەخاسمە نێربازی (لواط) يان ڤارێبوون (شذوذ) جنسی، د ناڤ تاكێن جڤاكيدا)، لەوا پێغەمبەر ﷺ دبێژيت: ((لَمْ تَظهَرِ الفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قطُّ حَتى يُعْلِنوا بهَا...))، ئانكو هەتا كو ئاشكەرا و ديار دبيت، و هەتا د گۆڤار و رۆژناماندا بەلاڤ دبيت، و د دەزگەهێن راگەهاندنێدا، و د رۆژئاڤايدا، و د وەلاتێن رەوشت د ناڤدا نەمايی رەزيلييێ ديار دكەن د دامودەزگەهێن راگەهاندنێدا، و جهێن دەهمەن پيسييێ، و جهێن د سەررێداچۆنێ، د هەمی جهاندا، ((حتى يُعْلِنوا بهَا إلا فشا فِيهِمُ الطاعُونُ وَالأوْجَاعُ الّتي لَمْ تكُنْ مَضَتْ في أسلافِهِمْ...))[1].

ئەڤ كۆئەندامێ حێبەتی د لەشێ مرۆڤيدا كۆئەندامێ بەرگرييێ د نەخۆشييا ئايدزێدا نامينيت، ڤايرۆسەك كۆنترۆلێ ل سەر دكەت هەتا نوكە سالۆخەتێن وی نەهاتينە ئاشكەراكرن، و راستييا وی نەهاتييە دەستنيشانكرن، ل هاڤينا سالا (١٩٨١ز) ل ئەمريكا پێنج نەخۆشێن ئايدزێ ئاشكەراكرن، پاشی بلندبوون بۆ سيه و پێنجان، و بوونە سەد نەخۆش د هەر حەفتييەكێدا، هەتا سال (١٩٨٤ز) هژمارا تووشبوويان بووينە دوازدە هزار نەخۆش، نيڤا وان مرن، و نوژدار تەخمين دكەن ل ئەمريكا مليۆن تووشبوويی

(١) سبق تخريجه ص ٣٩٣.

هەنە، و ئەڤ نەخۆشییە هاتە ڤەگوهاستن بۆ ئەوروپا ژ فرەنسا دەست پێ کر، و بەردەوام هاتە ڤەگوهاستن ژ بەر رێ دەرکەڤتنێن رەوشتی، ب هەمی جۆرێن خۆڤە، و د کاودانێ ئالودەبوونا ب کەرستێن بێهۆشکەر، و کاودانێن ڤەگوهاستنا خوینێ، و تشتێ سەیر ئەوە هەتا نوکە ئێك تووشبوویی نەشیاینە چارەسەر بکەن، بەلکو هەمی زەحمەتێن زانایان بەرەڤ هندێ دچن کو ڤێ نەخۆشییێ ل تخویبێ وێ راوەستینن، و دەمێ مرۆڤ تووشی ڤێ نەخۆشییێ دبیت مانا وی د ژیانێدا د ناڤبەرا هەژدە بۆ سەد و بیست و پێنج حەفتییان ڤەدکێشیت، ئانکو ژ چوار هەیڤا بۆ دو سال و نیڤا، و هندەك تووشبوویی پشتی هاتنا نەخۆشییێ دمرن.

و ژ نیشانێن ڤێ نەخۆشییێ کێشا نەخۆشی کێم دبیت، و پلا گەرمییا وی بلند دبیت، د گەل زکچۆنەکا بەردەوام، و خوهدانەکا گەلەك، و لاوازییەکا گشتی، و نەشێت هزرکرنا دورست بکەت، و کێم خوینی (فقر الدم)، و کێمبوونا خانان، هەتا حەل دبن و نەمینن، خودێ دبێژیت: ﴿وَلَا تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾ [الإسراء:٣٢]، (ئانکو، نێزیکی زنایێ و دەهمەن پیسییێ نەبن، ب ڕاستی ئەو کارەکێ زێدە کرێتە و ڕێکا وێ پیسە ڕێکە).

ئەو رۆژئاڤایا دهاڤێتە ئایینی ب ئاشکرایی، و دبێژیت: ئەڤە رەوشتەکێ غەیبییە، و رەوشتێ مللەتێن دەستپێکێیە، و عەقل هەمی تشتە، و ژیان هەمی تشتە، و خۆشی هەمی تشتە، وێ دکەن یا دلێ وان دخوازیت، تووشی وان دبن یێن دهێنە سەرێ وان، ژ بەر ڤێ چەندێ مانا ل سەر رێکا راست ساخلەمییە، ب وێ ژیانا مرۆڤی یا تەنا و رحەت گەرەنتی دبیت، و دەمێ سەرپێچی کر، و سەردا چۆ، تاگیرێ یاسایی (سزایێ یاسایی) یێ ل چاڤەرێ وی، و ئەڤە سزایەکێ ب لەزە د دنیایێدا بەری سزایێ ئاخرەتێ.

و تشتێ سەیر ئەوە زانایان هزرا خۆ ئێخستییە سەر پەیڤا (ڤارێبوونا رەوشتی)، مەرەما وان ڤەدەریا (شذوذ) رەوشتییە ب هەمی جۆرێن خۆڤە، و ئالودەبوونا کەرستێن بێهۆشکەر، و ڤەخوارنا مەیێ، و چێ دبیت ئەڤ نەخۆشییە بهێتە ڤەگوهاستن ب رێکا کرینا خوینێ، و بهێتە ڤەگوهاستن ژ وەلاتەکی بۆ وەلاتەکێ دی.

ئەڤ نەخۆشیا ئایدزێ یا مەترسی ئەوا جیهان نەرەحەتکری، و ئەوا ترس ئێخستییە د دلاندا وەل مرۆڤی کرییە کو ژ هەمی تشتان بترسیت، ژ ترسا ڤێ نەخۆشییێ، دەمێ ژ تخویبێن خودێ دەرباز بوون، و گوه نەدا شەریعەتێ وی، و گرنگی نەدا پاقژیا پەیوەندییێن جڤاکی، ل ڤی دەمی ئەڤ نەخۆشییە هات دا وان نەرەحەت بکەت، و دا ژیانا وان بکەتە دۆژەھ، ((يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتَلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ، لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ وَالأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا....))[1].

---

(١) سبق تخريجه ص ٣٩٣.

# بخۆرێن گۆشتێ مرۆڤی

د هەیڤا ئەیارێدا سالا (١٩٩٤ز) نەخۆشییەکا مەترسی ل بریتانیا دیار بوو، ئەڤ نەخۆشییە ئەگەرێ وێ میکرۆبێن (مجهري)نە یێن ئێك خانە، ناڤێ وێ بخۆرێن گۆشتێ مرۆڤان، و ئەڤە نەفرەتا خودێیە پشتی نەخۆشییا ئایدزێ ل سەر وان کەسێن ژ رێ دەرکەڤتین، کو نوکە مرۆڤایەتی تەڤساند، ژ ئەگەرێ رێ دەرکەڤتنا وان، د ڤێ هەیڤێدا ڤێ سالێ (١٩٩٤ز) شەش کەس ل بریتانیا ب ڤێ نەخۆشییێ مرن، و پشتی چەند رۆژان ژنەك د ژییێ چل و شەش سالییێدا ب ڤێ نەخۆشییێ مر.

ئەڤە چ نەخۆشییە؟ میکرۆب گۆشتێ نەخۆشی دخۆن، هندی بووسەکێ د دەمژمێرەکێدا، گۆشتی دخۆت، و ماسۆلکان، و پیستی، هەمییا دخۆت، و نیشانەکێ ل لەشێ نەخۆشی دکەت وەکی شوینا سۆتنێیە ژ پلە پێنج، پاشی نەخۆش هەر زوی دمریت، و ماوێ مرنێ، ئانکو دەمێ د ناڤبەرا تووشبوونێ و مرنێدا دمینیتە ل دویڤ دەستپێکرنا جهێ خوارنێ، دەمێ ل جهێن دەماری بن، ژیانا نەخۆشی پتر ژ دەمژمێرەکێ هەتا دو دەمژمێران ناڤەکێشیت، و ئەگەر نەخۆشییا ئایدزێ دەرفەتێ ددەتە نەخۆشی سالەکێ یان دو سالا، بەلێ ئەڤ نەخۆشییە دەمژمێرەکێ یان دو دەمژمێران ب تنێ ددەتە نەخۆشی، بەلێ ئەگەر ئەڤ نەخۆشییە دەستپێکرن د دەست و پێیاندا چێ دبیت دێ ژیانا وی ب تنێ دو رۆژا ڤەکێشیت، ئانکو ژ دەمژمێرەکێ بۆ دو دەمژمێران، و ژ رۆژەکێ بۆ دو رۆژان، دێ نەخۆش گیانێ خۆ ژ دەست دەت، و ئەگەرێن ڤێ نەخۆشییێ هەر هەمان ئەگەرێن نەخۆشییا ئایدزێنە، مەی ڤەخوارن، و کەرستێن بێهۆشکەر، و جنسێ حەرام، و ڤارێبوون، ئەڤ نەخۆشییە ل بریتانا دەرکەڤت، و ل ئەمریکا و کەنەدا و یابان ژی دیار بوو، و ئەڤ میکرۆبێن دبێژنێ بخۆرێن گۆشتێ مرۆڤی هەوایی و نەهەوایینە، و رامانا هەوایی و نەهەوایی ئەوە دشێن خۆ ڤەگوهێزن،

و ڤەگرتنێ دورست کەن د هەر کاودانەکیدا، و د هەر ژینگەهەکێدا، و شێوێ چاوانییا کارکرنا وان هەتا نوکە ژی یا شێلییە.

و گۆتنا پێغەمبەری ﷺ د فەرموودا سەحیحدا: ((لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ حَتَى يُعْلِنُوا بِهَا إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونَ وَالأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلافِهِمْ الَّذِينَ مَضَوْا))[1]. ئەڤ نەخۆشییێن تەڤایی یێن کوژەك کو د ناڤ باب و پایرێن واندا نەبووینە، و ژ بۆ حیکمەتەکا خودێ ڤیایی کو سزا ژ توخمێ کاری بیت، و ئەڤ نەخۆشییێن مەزن و گران رەددەکە ل سەر ژ رێدەرکەڤتنا مرۆڤی، بەلکی کەسانێن دی پاشڤە ببەت، و ئەڤە ژ دلۆڤانییا خودێیە بۆ مرۆڤی، و د شیاندا بوویە حسێبا مرۆڤی ل سەر کارێ وی بکەت ب تنێ ل ئاخرەتێ، بەلێ سزایێ ب ئێش کو دهێتە د ناڤ گۆرەپانا گونەهکاراندا د دنیایێدا ئەڤە پاشڤەبرنەکە بۆ گونەهکاران، و خەلاتێ مرۆڤێن چاك د دنیایێدا دگەهیتێ، ئەڤە هاندانەکە بۆ چاککەرێن دی، و ئەڤە ژ دلۆڤانییا خودێیە بۆ مە، و د شیاندا بوو نەخۆشییێ د ژیانێدا نەهێلیت، و خودێ خودان شیانە ل سەر هەمی تشتان، و د شیاندا بوویە حسێبێ بهەمیڤە ببەتە رۆژا قیامەتێ، بەلێ حیکمەتا خودێ وەسا حەز کر لەزێ د ئیزادانا ژ رێ دەرکەڤتیاندا بکەت د دنیایێدا، دا ئەڤ ئیزادانە ببیتە پاشڤەبرنەك بۆ گونەهکارێن دی، و لەزێ د خەلاتکرنا هندەك بەندەیێن خۆ یێن چاکدا بکەت د دنیایێدا، دا ئەڤ خەلاتە ببیتە هاندانەك بۆ چاککەرێن دی.

نینە ئارێشەك بگەهیتە مرۆڤان، چ بگەهیتە کەسی یان جڤاکان ئەگەرێ وێ ب تنێ دەرکەڤتنە ژ رێبازا خودێ، و هەر دەرکەڤتنەك ژ رێبازا خودێ ئەگەرێ وێ ب تنێ نەزانینە کو مرۆڤی ل بەر خۆ کری.

---

(١) ئیبن ماجە (٤٠١٩).

# كولكا تەختی (قرحة السرير)[1]

یا بەرنیاسە ل دەڤ نوژداران کو ژ نەخۆشییێن مەترسییە، نەخۆش د نەخۆشخانانڤە پێ دنالن کولکا تەختی (قرحة السرير)، ژ بەر کو ئەو نەخۆشێن ژ بەر نەخۆشییێن خۆ نەچار دبن ماوەکێ درێژ بمینن ل سەر تەختی؛ وەکی شەکستنا حەوزێ، و شکەستنا برِبرِا پشتێ، و فالنج، و کاودانێن خەوێن درێژ، ئەڤ کاودانێن نەخۆشییێ نەخۆشی نەچار و پێدڤی دکەن ب رۆژ و هەیڤان ل سەر پشتا خۆ بیت.

ژ خرابییێن ڤێ رازاندنێ نەخۆشییەکا مەترسی پەیدا دبیت دبێژنێ کولکا تەختی (قرحة السرير)، چونکی گۆشت و پیست و شانە دهێنە فشاردان ل بن پیستی ژ هەستی بۆ ناڤدا، و روییێ رەق ژ دەرڤە، ئەڤ فشارە وەناکەت تەرِاتی د ڤان شاناندا بمینت پاشی دێ مرن، و کولبوونێن گەلەك نەخۆش ل دۆر وان پەیدا دبن.

ژ بەر ڤێ چەندێ نوژدار شیرەت دکەن هەر کەسێ دمینیتە سەر تەختی بۆ ماوەکێ درێژ هەر دو دەمژمێران جارەکێ خۆ وەرگێریت، و دەمێ دمینیتە سەر رەخەکی، و ب ئێك جار، پترى دوازدە دەمژمێران دێ کولبوونێن پیستی دەست پێ کەن، و دێ مرنا شانێ ل بن پیستی دەست پێ کەت، و چو پاراستن ژ ڤێ نەخۆشییێ نینە ژ بلی وەرگێرانا نەخۆشی بۆ هەمی لایێن وی.

و تشتێ سەیر ئەوە خودێ هەڤالێن شکەفتێ سێ سەد و نەه سالان هێلانە د شکەفتێڤە، بێی تووشی ڤان کولبوونان ببن! خودێ دبێژیت: ﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ﴾ [الكهف:١٨]، (مە ئەو ل سەر تەنشتا راستێ و چەپێ دقولپاندن و دزڤرِاندن).

(١) برینەکا ڤەکری یا پیستییە، ژ ئەنجامێ رازاندنەکا درێژ دورست دبیت، پشتی فشار ل سەر پیستی هاتییە کرن، ئەڤە ژی دبیتە نەگەرێ راوەستانا خوینێ د لولەیێن خوینێدا ل ژێر پیستی. وەرگێر.

ئەگەر ئەڤ قولپاندنە نەبا دا پیستێن وان پویچ بن، و دا شانێن وان مرن، و پاشی دا مرن، بەلێ ئەڤە ئاماژەکا قورئانێیە بۆ لەشی نابیت ل سەر رەخەکی بمینیت، و زانا و نوژدار دبێژن: (پتریا پشکێن لەشی یێن تووشی ڤێ نەخۆشییا مەترسی دبن کۆرتیخ (العجز)[1] و هەردو کماخ و هەردو لایێن ملی و هەردو گۆزەك، ڤان جهان هەستی یێن تێدا، چونکی هەستی فشارێ دکەتە سەر جهێ رەق د جهێ رازاندنێدا (تەخت)، دێ گۆشت هێتە گڤاشتن (تێك ڤوتان)، و تەراتی نامینیت، و دێ شانە مریت، و دێ رەش بیت، و پیست دێ بریندار بیت).

و گۆمان تێدا نینە ئەوێن ماوەکێ درێژ دمیننە د جهێن خۆدا بەری بمرن، تێبینی دهێتە کرن کو گۆشتێ وان دکەڤیت و دهێتە خوار، ژ بەر ڤێ چەندێ: (وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ).

ئەڤە ئاخڤتنا خودایێ گشت جیهانایە، چاوا ئەڤ مرۆڤە سێ سەد و نەه سالان مان، و چو ل پیستێ وان نەهات، یان شانەیێن وان برین نەکەڤتنێ و نەمرن؟ ژ ڤێ وەرگێرانێ، ئەڤە ئاماژەکە، و حیکمەتەکا مەزنە، و زانایان زێرەڤانییا نڤستییەکی کر، وان دیت د ئێك شەڤدا پتر ژ سیه و شەش جاران یێ خۆ وەردگێریت، بێی هەست پێ بکەت، دا شانێن وی نەهێنە گڤاشتن ل ژێر فشارا هەستی، و فشارا جهێ نڤستنێ، ئەڤە د کاودانێن ئاساییدا، بەلێ د کاودانێن نەخۆشییێدا، هەر وەکی هەمی پشتا وی یا گێچ کری، و حەوزێ ژی وەسا، و نەخۆش نەشێت خۆ بگوهۆریت (خۆ وەرگێریت)، پێدڤییە بهێتە وەرگێران دا تووشی ڤێ نەخۆشییێ نەبیت.

---

(١) هەستییەکێ مەزنێ سێ گۆشەیە، دکەڤیتە ژێریا بربرا پشتێ د پشکا بلندا پشتێ ژ کماخێ. وەرگێر.

# جگارەكێشان مەترسیترین نەخۆشییا تەڤایی یا جیهانییە

پەرتۆكەك یا هەی ژ نوی یا هاتییە بەلاڤكرن ل ژێر ناڤ و نیشانێ: (جگارەكێشان مەترسیترین نەخۆشییا جیهانییە).

چێ دبیت ئێك بێژیت: د ناڤ و نیشانێن ڤێ پەرتۆكێدا زێدە پێڤەچۆن (مبالغة) هەبیت، بەلێ ئەگەر هوین ببینن كا چ راستی تێدانە ل ڤی دەمی هوین نابینن د ڤی ناڤ و نیشانیدا ب هەمیڤە زێدە پێڤەچۆن هەبیت، گۆڤارەك یا هەی ل سویسرا دەردكەڤیت پشتی كو ئامارەكا هویر هاتییە كرن ل سالا (١٩٧٨) دبێژیت: كۆمپانییێن تویتنێ ئەو جگارێن چێ دكەن هەر مرۆڤەكێ ل سەر روییێ عەردی رۆژانە دو جگارە دگەهنێ، و هژمارا مرۆڤێن عەردی شەش ملیارە (وكە ژ حەفت ملیاران ژی بۆرییە)، و كۆمپانییێن تویتنێ د ئێك رۆژدا دوازدە هزار ملیۆن جگارا بەرهەم دئینن، ئەڤ چەندییا كو ئەڤ كۆمپانییە بەرهەم دئینن كەرستێن ژەهراوی یێن تێدا، ئەگەر ب ئێك جاری و ئێكسەر بهێتە وەرگرتن د ناڤ خوینێدا دا شێت نڤشێ مرۆڤی برینیت، بەلكو كاریگەری و شوینوارێن وێ دژوارترن ژ شوینوارێ بۆمبەكا گەردیلەیی (زەرری).

و ئەڤ راپۆرتە د ڤێ گۆڤارێدا دبێژیت: (ئەگەر ئەڤ كەرستێن ژەهراوی بهێنە وەرگرتن یێن د ڤان جگاراندا ب ئێك جار پشتی خلاسبوونا وان، و ئێكسەر بكەنە د خوینهێنەریدا بەسی هندێیە مرۆڤەكێ ساخلەمییا وی یا گەلەك باش بكوژیت).

و رێكخراوا ساخلەمییا جیهانی سالا (١٩٧٥) راپۆرتەكا درێژ بەلاڤ كر، تێدا گۆت: (هژمارا وان كەسێن ژیانا خۆ ژ دەست ددەن، یان ئەوێن ژیانەكا خراب دژین ژ ئەگەرێ جگارەكێشانێ پترن ژ ئەوێن ژیانا خۆ ژ دەست ددەن ژ ئەنجامێ تاعوونێ، و كۆلێرا، و خوریكییێ، و ئێشا زراڤ (سل)، و پنیبوونا پیستی، و تیفۆیێ، و تیفۆسێ هەمیا پێكڤە، و ئەوێن ژ ئەنجامێ جگارەكێشانێ دمرن گەلەك پترن ژ هەمی وان یێن ژ نەخۆشییێن

تەڤايى دمرن)، ئەڤە چەند رێژەك بوون ژ ڕاپۆرتا ڕێكخراوا ساخلەمييا جيهانى بەلاڤ كرى.

تشتەكێ دى، سەرجەمێ وى داهاتێ دەولەتێن مەزن ب دەست خوڤە دئينن ژ وان باجێن گران ل سەر بەرهەممئينانا جگاران گەلەك كێمترە ژ وى پارێ دهێتە مەزاختن بۆ چارەسەرييا نەخۆشييێن ژ جگارەكێشانێ چێ دبن، و هەرچەند قەبارێ باجا يێ مەزن بيت ئەوێ دەولەتێن مەزن ب دەست خۆ دئێخن ژ جگارەكێشانێ ئەو گەلەك كێمترن ژ وان يێن د مەزێخن بۆ نەخۆشييێن ژ جگارەكێشانێ چێ دبن.

ديسا گۆڤارەكا نوژدارى يا بريتانى سالا (١٩٧٨) ئەڤ راستييە بەلاڤ كر: (د ناڤ هەر سێ جگاركێشاندا ئێك ژ وان گيانێ خۆ ژ دەست ددەت ب ئەگەرێ جگارەكێشانێ).

و دەولەتێن مەزن ب دلتەنگييەكا دژوار تووشى نەخۆشييێن تەڤايى دبن، ئەگەر كۆليرا بەلاڤ بوو ل وەلاتەكى دێ پەرپسيارێن ساخلەمييێ ترسن بۆ بەرسينگگرتنا ڤێ نەخۆشييێ و دێ داخوازا هاريكارييێ كەن، بەلێ بۆچى بەرسينگگرتنا مەترسييێن جگارەكێشانێ ناكەن ب ڤێ دلتەنگييا دژوار؟

بەرسڤ: شوينوارێن وێرانكەر يێن جگارەكێشانێ ب شێوەكێ ديار ئاشكەرا نابن، ب تنێ پشتى چارێكا سەدى (٢٥ سالان) نەبيت، و ل ڤێرە مەترسييە، ژ بەر كو شوينوارێن وێرانكەر پشتى بيست و پێنج سالان ديار دبن، گەنج جگارێ دكێشيت، و نوزانيت كا چ دكەت، بەلێ پشتى بۆرينا بيست سالان يان پتر شوينوارێن مەزن يێن جگاركێشانێ ديار دبن، زێدەبارى كو مرۆڤ فێر يا گرتى ل سەر ديتنا مەترسييێن ئێكسەر، و بێ بها ديتنا (نەگرنگى پێدانا) مەترسييێن پاشەرۆژێ.

د هندەك نڤێسينێن راپۆرتێدا هاتبوو كو كێشانا جگارەكێ ل دويڤ ژييێ خوينبەران و رەقييا وان ژييێ مرۆڤى كێم دكەت هندى وى ماوێ ئەو جگارەكێ دكێشيت، ئەگەر مرۆڤى د رۆژەكێدا بيست جگارە كێشان دێ ژييێ وى كۆرت بيت ـ نە ل دويڤ وەكى ئەم موسلمان هزر دكەين ـ بەلكو ل دويڤ نەرمييا خوينبەران، و رەقييا وان ـ دێ ژييێ وى پێنج سال كێم بن.

زاروکێن ب شیر ئەوێن د ژۆرێن تژی کادییا جگارانڤە دژین ئەو پتر تووشی کولبوونێن بۆرییێن هەوایی دبن، و پەرسیڤێن بەربەلاڤ، بەراورد د گەل وان زارۆکێن د ژۆرێن پاقژڤە دژین، و ئەو دایبابێن جگارا دکێشن دبنە هاریکار بۆ زیان گەهاندا زارۆکێن خۆ یێن بچویك، و ئەڤە راستییەکا نوژداری یا جێهگرە.

حکومەتان سەر کارگەهێن کۆمپانییێن جگاران سەپاند کو ل سەر (عەلبا) جگارا بنڤێسن: (جگارەکێشان زیانێ دگەهینیتە ساخلەمییا تە)، بەلێ رێکخراوا ساخلەمییا جیهانی هەمی کۆمپانی پێگیرکرن کو ل سەر عەلبێ بنڤیسن: (جگارەکێشان دبیتە ئەگەرێ پەنجەشێرا گولچیسکێ، و کولبوونا دۆمدرێژا بۆرییێن هەوای، و جەلتێن دلی).

زانا دبێژن: (د بەلگێن تویتنێدا وەکی کەرستێن ڤەلەوێن ژەهراوی تێدانە، و ل دەستپێکا هەمیا نیکۆتین، و ئێك ژ دەه گراما ژ نیکۆتینێ تێرا هندێ هەیە سەیەکێ قەبارە ناڤنجی هەر وێ گاڤێ بکوژیت، و د ماوەکێ کێمدا، و چپکەکا نیکۆتینێ بکەنە چاڤێ مشکی هەر وێ گاڤێ دێ کوژیت، و هەشت چپکان بکەنە د بن پیستێ هەسپیدا دێ د ماوێ چوار خۆلەکاندا کوژیت)، ڤان راستییان بەلگە پێ نەڤێت، و نە د سەیرن، ئەڤە ڤەکۆلینێن گەلەك کەڤنن، و ئەو پەرتۆکا من ئەڤ زانیارییە ژێ وەرگرتین بەری دەه سالان هاتبوو چاپکرن.

ژەهرەکا دی ژی یا د جگارێدا هەی دو سەد جارکی هندی وێیە یا رێکخراوێن ساخلەمییێ رێکی ددەنێ، و دەستەکێن ساخلەمییێ د پیشەسازییا خوارنێدا.

و ژەهرەکا دی یا هەی کارێ تەپکێن سۆرێن خوینێ لاواز دکەن، ئەو ژی ئێکەم ئۆکسیدێ کاربۆنییە (CO)، ئەڤ گازە هەڤگرتنێ د گەل تەپکێن سۆرێن خوینێ دکەت، و ئەڤە جگارکێشی دوەستینیت.

و دو گازێن ژەهراوی یێن د جگارێدا هەین، و ئەڤ دو گازە یێن پەنجەشێرێنە، و دیسا کاربۆنێن پەنجەشێری تێدانە، ئەڤ ڤەکۆلینا زانستی یا هاتییە وەرگرتن ژ ژێدەرێن گەلەك باوەر پێکری.

و ئامارەکا فەرمی ل ئەمریکا هاتە کرن، هزار کەس د ئێك رۆژدا ب ئەگەرێ جگارەکێشانێ دمرن، و ئەڤ هژمارە حەفت جارکی پترە ژ هژمارا وان کەسێن د رویدانێن ترافیکێدا دمرن، د گەل هندێ کو بلندترین رێژا خەلك تێدا دمرن رویدانێن هاتن و چۆنێنە، لەوا رێکخراوا ساخلەمییا جیهانی گۆت: (جگارەکێشان دهێتە هژمارتن ئەگەرەکێ ڤەبڕ بۆ نەخۆشییێن کوژەك).

و ل ڤێرە دێ کۆئەندامێن لەشی بەرچاڤ کەین، و پەیوەندییا وان ب جگارەکێشانێڤە، ئێك ئێکە ژ گۆتارەکا پڕ بها یا دکتۆر نەزار الدقر د گۆڤارا (نهج الإسلام)[1]دا هاتبوو بەلاڤکرن:

مێشك و دەمار: مێشکێ مرۆڤی گرنگترین ئەندامە د لەشێ مرۆڤیدا، و سەد و چل ملیار خانێن هاریکار یێن تێدا، هێز کارێ وان نەهاتییە زانین، و چوار ملیار خانێن تیڤکلی تێدانە، کو رویبەرێ چالاکییا هزرییە د مرۆڤیدا، ئەڤ ئەندامێ هەرە گرنگ کو ئەو ب خۆ نەشێت د خۆ بگەهیت، و ئەو ئالۆزترین تشتە د مرۆڤیدا، بەلکو ئەو ئالۆزترین ئامویرە د گەردوونیدا، و مرۆڤ ب وی (مێشك) رێز یا لێ هاتییە گرتن.

جگارەکێشان چ ل مێشکی دکەت؟ ژەهراوییێن جگارێ یێن دخوینێدا حەلکری دەمێ دگەهنە مێشکی ب لەز و ب سناهی دهێنە گرتن، و ب کشاندنەکا مەزن، دەمێ ئەڤ ژەهرە بۆ مێشکی دهێت مرۆڤ هەست ب تشتەکێ بێهۆشکەرییێ دکەت، و د گەل خاڤی و سستییەکێ، ئەڤ نیکۆتینا د خوینێدا حەلکری، و دگەهیتە مێشکی جارەکێ هەستەکێ بێهۆشییێ ددەتە مرۆڤی، و جارەکا دی هەستکرنەکێ ب چالاکییێ، ژ بەر کو جگارەکێشان تەناکەرە، و چالاکییەکە د هەمان دەمدا، و ئەڤە نهێنییا ئالوودەبوونێیە (إدمان).

ئەڤ ژەهرە د مێشکیدا خوارنا دەماران لاواز دکەت، دێ دەمار تووشی کولبوونێ بن، و ژ شوینوارێن ڤێ ژەهرێ د دەماراندا لەرزین د دەست و پێیاندا، ئەڤ لەرزینە ژ ئەگەرێ کولبوونا دەمارێن مێشکینە، و کولبوونا وان ژ ئەگەرێ لاوازییا تەڕبوونا وانە ب خوینێ،

---

(١) گۆڤارا (نهج الاسلام)، ژمارە (٦٨٦٧)، سالا ١٩٩٧.

دیسا تووشی سەرئێشانێ دبیت، و ئێشانێن دەماری د دەست و پێیاندا، و جگارەکێشان بیردانکێ لاواز دکەت، دێ جگارکێشی گەلەك ژ بیرڤەکرن هەبیت، و ژ نیشانێن جگارکێشانا دەماری سستییا چالاکییا عەقلییە، کەسێ نەجگارکێش زیرەکترە ژ جگارکێشی، و ب لەزترە بۆ بەرسڤدانێ، دیسا هەستەوەرگرێ تامێ گەلەك لاواز دبیت ل دەڤ جگارکێشی.

ل دویڤ ڤەکۆلینەکا زانستی ل سەر شەش هزار و هەشت سەد کەسان هاتبوو کرن، ژ گرنگترین ئەنجامێن وێ ئەو بوو پەیوەندییەکا گەلەك دیار یا د ناڤبەرا جگارکێشانێ و لاوازییا بیردانکێ هەی.

کۆئەندامێ هەناسێ: زانا دبێژن: (زیانێن جگارەکێشانێ کۆئەندامێ هەناسێ دگرن، کو پترینێ کۆئەندامایە کارتێکرن لێ دبیت ب جگارەکێشانێ، چونکی کۆئەندامێ هەناسێ وەکی ئویشییێ تریپە، هەر دندکەك وەکی سکلدانۆکەکا هەوایە، و سکلدانۆك بۆشاییە، د ڤێ بۆشاییێدا گازا دوان ئۆکسیدێ کاربۆنی دهێتە گوهۆرین ب ئۆکسجینی، ئەڤ گوهۆرینە یا زیندییە، و گەلەکا سەرەکییە، جگارەکێشان چ دکەت د ڤان سکلدانۆکاندا؟ ئەو شانێن دیوارێ تەنکێ سیها پویچ دکەت.

و کریارێن هەناسەدانێ لاواز دکەت، و دبیتە ئەگەرێ کولبوونا دفنێ، و گەورییێ یێن دۆم درێژ، و کۆلبوونا بۆرییا هەوای، و رێژا پەنجەشێرێ ل دەڤ جگارکێشان هەشت جارکی پترە ژ نەجگارکێشان، و جگارکێشان رێکێن بەرەڤانیکرنێ زەحمەت دئێخیت ژ رێکێن هەناسەدانێ، و بۆرییا هەوای، ئەڤ بۆرییا هەوای خودێ ب هندەك کریارێن خۆرستی چێکرییە، بەردەوام بۆ بەرەڤ سەری دلڤیت، هەر تشتەکێ دچیتە د بۆرییا هەوایدا دڤێت تێدا نەمینیت، بەلکو پال ددەت بۆ سەری، و ل ژێرییا بۆرییا هەوای کۆم دبیت، و تشتێ سەیر ئەوە د جگارێدا ژەهرا نیکۆتینێ یا هەی کارێ کولکان خاڤ (سست) دکەت، ژ بەر ڤێ چەندێ هەمی پاشمایی د بۆرییا هەوایدا کۆم دبن، و دکەنە جهێ خۆ، چونکی ئامویرێ دەرکرنا بەرەڤ سەری یێ ژ کار کەفتییە، سیهە و بۆرییا هەوای دێ د بەرهەڤ بن کو تووشی نەخۆشییێن کویفکیبوونا (گەنیبوون) خوینێ بن).

مرۆڤێ جگارکێش پتر ژ کەسێن دی تووشی نەخۆشییا بۆرییان دبیت ئەوێن ب هەواییڤە د گرێدایی، و ب یێن سیهێڤە، و نەخۆشییا پفبوونا سیهێ، و پەیوەندییەکا گەلەك مەزن یا هەی د ناڤبەرا جگارگێشانێ و تووشبوون ب شێرپەنجا سیهێ.
ئامارێن زانستی یێن هویر دوپاتکرییە کو هەر هزار جگارکێشان شێست ژ وان تووشی پەنجەشێرا سیهێ دبن، و د ناڤ هزار مرۆڤێن نەجگارکێشدا ب تنێ کەسەك تووشی پەنجەشێرا سیهێ دبیت.
هندەك زانا دبێژن: (ژەهراوییێن جگارێ دبنە ئەگەرێ گوهۆرینا تووشی زانیارییێن جینی دبن د خانێدا، و ئەڤ گوهۆرینە د خانێدا دبیتە ئەگەرێ ریچاندنێ، کو ئێکە ژ ئەگەرێن پەنجەشێرا شانەیان).
دل و لۆلەیێن خوینێ: باراپتری نەخۆشییێن دلی، و یێن لۆلەیێن کوژەکن بۆ جگارکێشانێ، و نوژدارێن نیشتەرکاری یێن دلی دوپات دکەن باراپتری وان نیشتەرگەرییێن بۆ دلی دهێنە کرن ژ ئەگەرێ وان نەخۆشیانە یێن پلە ئێك دزڤرن بۆ جگارکێشانێ.
نوژدارەکێ دی چارەسەرییا دفنێ و گوهی و قرگێ (حنجرة) دکر، دەمێ مرۆڤەکێ نەخۆش ب پەنجەشێرا قرگێ دهاتە دەڤ، دا دەستێ وی ژ نیشکەکێڤە دانیتە سەر سینگێ وی کو پاکیتەکا جگاران ژی د دەستیدا بوو، دگۆت: ئەڤ پەنجەشێرە ژ ڤێ پاکیتێیە.
ئەگەرێ ئێکێ یێ ڤان نەخۆشییێن دژوار ئەوە دوان ئۆکسیدێ کاربۆنی د گەل خەنەیا خوینێ هەڤ دگرن، رێگرییێ ل گرنگترین کارێ زیندەیی دکەت، ئەو ژی لێکگوهۆرینا ئۆکسجینییە ب دوان ئۆکسیدێ کاربۆنی.
راستییەکا گەلەکا گرنگ یا هەی، ئەو ژی خودایێ مە ـ وەك رێزگرتنەك بۆ ڤی مرۆڤی، و بۆ دابینکرنا ساخلەمییا وی، و پاراستنەك بۆ وی ژ مرنێ ـ ئەو یێ ئامادەکری ب کۆئەندامێن گەلەك هویربین دا وی ژ مەترسییان بپارێزیت.

ئەگەر ئێکی ژ مە تشتەکێ ب ترس دیت ـ وەکی ماری ـ دێ چ روی دەت؟ دێ وێنێ ماری ل سەر تۆرا چاڤێ مە کۆپی بیت، و دێ هەست پێ کەت، و تۆرا چاڤی د ماوێ دەمارا دیتنێدا دێ بۆ مێشکی ڤەگوهێزیت، دا رامانا ڤی وێنەی بزانیت، ل دویف تێگەهێن وەرگر، و مێشك شاهێ کۆئەندامێ دەمارییە، هۆشدارییێ ددەتە شاها کۆئەندامێ هۆرموونی (رژێنا ژێر مەژی) ب رێکا هۆیەکێ پەیوەندیکرنێ، ئەو ژی لەشێ ل ژێر لاندکە، ئەڤ رژێنا ژێر مەژی دێ فەرمانەکێ ژ مێشکی وەرگریت کاری بۆ ساخلەمییێ بکەت، و رژێنا ژێر مەژی توخمێن هۆرموونی یێن کاریگەر یێن هەین، ئەڤ رژێنا ژێر مەژی دێ فەرمانەکێ هنێریت بۆ رژێنا ئەدرینالی کو پێنج هۆرموونان دەردکەت، یێ ئێکێ: دلی ب لەز بێخیت، و یێ دووێ: تێکچۆنا هەردو سیها زێدە بکەت، و یێ سێیێ: لۆلەیێن رەخا تەنگ بکەت دا خوین بۆ ماسۆلکان بچیت، نەچیتە پیستی، و یێ چوارێ: شەکرا خوینێ زێدە ببیت، و یێ پێنجێ: هۆرموونێ مەهینێ زێدە ببیت، ئەڤە هەمی ب کریارا وی هۆرموونییە ئەوێ رژێنا ئەدرینال دەردکەت، هەڤ هەمییا بەری نوکە روی ددەت ب ئەگەرێ هۆشداریکرنا پشکا سیمپاساوی ژ کۆئەندامێ دەماری یێ خۆیەتییە.

ئەوێ دترسیت لێدانێن دلێ وی زێدە دبن، و دێ تێکچۆنا هەردو سیها زێدە بیت و دێ ڤەکێت، و دێ لۆلەیێن رەخا تەنگ بن، و رەنگێ وان زەر بیت، و ئەگەر تو خوینا وی پشکنین بکەی دێ بینی رێژا شەکرێ یا بلندە، و دیسا رێژا هۆکارێ مەهینێ ژی ئەوا مێلاك دەردکەت، ژەهرا نیکۆتینێ هەمان کار دکەت ئەوا ئەدرینال دکەت، چونکی لێدانێن دلێ جگارکێشی بەردەوام ب لەزن، و تێکچۆنا هەردو سیهێن وی د زێدەیێدانە، و لۆلەیێن رەخا د تەنگن، ژ بەر ڤێ چەندێ رەنگێ وی زەر دیار دکەت، و هۆرموونێ مەهینێ د خوینا ویدا یێ زێدەیە، و رێژا شەکرێ یا بلندە د خوینا ویدا، ل ڤێرە جگارکێش هەشت جارکی پتر یێ بەرهەڤە ژ کەسێن نەجگارکێش بۆ جەلتێن د خوینێدا، ئەڤە راستییەکا باوەرپێکرییە.

ئێك ژ ئەگەرێن نەخۆشییا (غرغرین)(١)، جگارەیە، چونکی جگارە رێژا چڕبوونێ د خوینێدا بلند دکەت، و دەمێ رێژا چڕبوونێ بلند بوو دێ یا ب زەحمەت بیت خوین بگەهیتە هویرترین لۆلەیان، ل ڤی دەمی دێ دەست و پێیێن وی تووشی (غرغرین)ێ بن ژ بەر لاوازییا تەربوونێ.

و جگارە دبیتە ئەگەرێ نەخۆشییەکا کێم وێنە دبێژنێ (کولبوونا لۆلەیێن گرتنێ)، چونکی دەمێ لۆلەیێن خوینێ کول دبن و نەرماتییا وان دچیت، و گرتنا وان ئانکو لاوازییا تەربوونێیە، و ئەڤە ژی دیسا دبیتە ئەگەرێ نەخۆشییا (غرغرین)ێ.

و نەخۆشییەکا دی یا هەی تووشی جگارکێشان دبیت، ژ نیشانێن وێ شینبوونا پیستی، و سۆربوونا دەستان.

کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ: کەرستەك ژ جگارێ دهێت لێدانێن دلی ب لەز دکەت، و خوینبەران تەنگ دکەت، و دقولپینیت، و جگارە دبیتە ئەگەرێ نەخۆشییا تەنگییا سینگی (هەناسێ)، و رەقبوونا شاخوینبەران، و هەر پاکێتەکا جگارا بنێ وێ بخوینن: (جگارە یا ب زیانە بۆ کۆئەندامێن هەناسێ، و لۆلەیێن خوینێ، و دلی)، ئەڤە ئاخڤتنەکا زانستییە، یا هاتییە وەرگرتن ژ هزارەها کاودانان، و لژنەك ژ مەزنترین نوژدارێن د جیهانا رۆژئاڤایدا راپۆرتەك پێشکێش کر ژ سێ سەد و حەفتێ بەرپەرێن مەزن پێکهاتبوو ناڤ و نیشانێ وێ: جگارە و ساخلەمی، ڤێ راپۆرتێ دوپات کر هندەك مەترسی یێن کوژەك ژ جگارکێشانێ دورست دبن، و خودێ خوارنێن پاقژ یێن حەلال کرین، و یێن پیس حەرام کرینە، و یا هاتییە سەلماندن ب بەلگەیێن ڤەبر کو جگارکێشان زیانێ دگەهینیتە ساخلەمییا مە، و زیانێ دگەهینیتە دلی، و زیانێ دەگەهینیتە شاخوینبەران، و دبیتە ئەگەرێ رەقبوونا خوینبەران، و ب لەزکەڤتنا دلی، و کولبوونا سیهێ، و بەرگرییێ د بۆرییێن هەواییدا لاواز دکەت، و دبیتە ئەگەرێ فالنجبوونا کولکان د بۆرییێن هەوایدا، ئەڤ هەمی مەترسییە چێ دبن، و پشتی ڤان

---

(١) مرنا شانێن لەشییە و کویفکیبوونا وان، ژ ئەنجامێ نەگەهشتنا خوینێ بۆ ئەندامان یان ژی زڤرۆکا خوینێ د ئەندامانـدا دراوەستیت. وەرگێر.

هەمی مەترسییان ئەم جگارا بکێشین؟! ئەرێ ما ژییێ مرۆڤی ب سەر هەمی تشتێن مرۆڤی هەین ناکەڤیت هەی مرۆڤ؟ و جگارکێشان ئانکو تو بمینییە د ناڤ نڤینێدا، ساخلەمی تانجەکە ل سەر سەرێن مرۆڤێن ساخلەم، کەس نابینیت ب تنێ نەخۆش نەبیت (ئانکو بتنێ مرۆڤێ نەخۆش بهایێ ساخلەمییێ دزانیت).

چاڤ: جگارکێشان دبیتە ئەگەرێ کولبوونا کورنییێ (سپیلکێ)، و پشتا چاڤا هشك دکەت، و کولبوونەکە بۆ دەمارا دیتنێ، و دبیتە ئەگەرێ کێمبوونا ڤیتامین ١٢.

کۆئەندامێ هەرسکرنێ: نۆت ژ سەدێ پەنجەشێرا لێڤا جگارکێش تووش دبنێ، و پەنجەشێرا ئەزمانی و سورنجکێ یا مشەیە ل دەڤ جگارکێشان، و برینێن پتییێ، و ئەزمانی، و کولبوونا رژێنێن تفێ، و ئەڤ رژێنە مەزن دبن، و پیس دبن، و هندەك جاران داعویران زەحمەت دکەڤیت، بەلکو جگارە خانا مێلاکێ ژەهراوی دکەت، و کێماسییێن مێلاکێ، یان پویچبوونا وێ، پاشی دبیتە پەنجەشێرا مێلاکێ.

کۆئەندامێ زاوزێ: جگارە ئێکە ژ مەزنترین ئەگەرێن زەلام تووشی لاوازییا جنسی ببیت، و ئاڤا زەلامی دهێتە شێواندن، و دکێشیتە عەیالنەبوونێ (خرشاتییێ) ل دەڤ ژن و زەلامان، و پەیوەندییا د ناڤبەرا ژن و مێراندا لاواز دکەت، و پترین کاودانێن ژ بەرچۆنا زارۆکینە و بوونا زارۆکی ب مری، ژ ئەگەرێ جگارکێشانێ، و جگارە ئەگەرە بۆ ژ دایکبوونەکا بەری دەمێ خۆ، و کێمییا کێشێ، و مرنا زارۆکێ ب شیر ب ئەگەرێ دایکا جگارکێشە، و شێواندنێن نەسروشتی ل دەڤ زارۆکی، و مرن د لاندکێدا، و تەنگە نەفەسییا زارۆکان، و کەربوون؛ ئەڤە هەمی بۆ دایکا جگارکێش دزڤرن.

و تشتێ نەهێتە باوەرکرن؛ ئەوە ئەڤ ژەهرا کوژەك یا جگارێ زارۆکێ ژ نوی ژ دایك بوویی ڤەدخۆت د گەل شیرێ دایکا خۆ، چونکی شیرێ دایکا جگارکێش ئەڤ ژەهرا کوژەك یا تێدا، ژ بەر ڤێ چەندێ عێلنجییێن دوبارە، و فرکان، و لەزگەفتنا دلێ زارۆکێ ژ نوی بوویی ژ شوینوارێن ژەهراوییێن جگارکێشانێنە، کو دچنە لەشێ زارۆکێ ب شیر ب رێکا شیرێ دایکا وی یا جگارکێش.

دیسا چرپیا ژەهراوییا جگاری د سینگێ ژنێدا دکێشیتە پەنجەشێرا سینگێ ژنا جگارکێش.

و مەترسیترین تشت د ڤێ چەندێدا ئەوە ئەگەر سەد مرۆڤ مەیێ ڤەخۆن دێ تووشبوونا وان ب ئالودەبوونێ پازدە ژ سەدێ بیت، بەلێ ئەگەر سەد مرۆڤ جگارا بکێشن دێ تووشبوونا وان ب ئالودەبوونێ هەشتێ و پێنج ژ سەدێ بیت کو دبێژنە ڤێ نەخۆشییێ: (ئالودەبوون ل سەر جگارکێشانێ).

هندەك مرۆڤ هزر دکەن کادییا جگارێ یا زەلال و نەزەلال یا هەی، کو کادییا زەلال دهێتە زەلالکرن ب رێکا فلتەری (فورمك)، و راستییا زانستی یا دیار کو فلتەر ناهێلیت قەتران بچیت بۆ هەردو سیهان نەزێدەتر، بەلێ ژەهراوییێن د جگارێدا دهێنە ڤەگوهاستن د ماوێ فلتەریڕا، ئەڤ هزرا ـ کو کادییەك یا دهێتە زەلالکرن، چو بنەمایێ ساخلەمییێ نینە.

و ژ مەترسیترین زیان د جگارێدا زیانێن وێ ناگەهنە جگارکێشی ب تنێ، بەلکو دهێنە ڤەگوهاستن بۆ دەوروبەران ژ هەڤژین و زارۆك و هەڤالێن کاری، ئەگەر تو بۆ ماوێ چوار دەمژمێران د ژۆرەکێڤە یێ روینشتی بی، و جگارکێشەك ژی تێڤە بیت هەر وەکی تە دەه جگارە کێشاین، و تو د زاراڤێ نوژدارییێدا جگارکێشەکێ نەرێنی، تو ناکێشی، بەلێ تو د گەل جگارکێشەکی روینشتی، چونکی ئەڤێ جگارا دکێشیت، و خۆشییێ ب تاما جگارێ دبەت ـ ئەگەر هەبیت ـ زیانێ دگەهینیتە کەسێن دی، و ئەو نوزانیت.

ئامارەکا هویر ل ئەمریکا هاتە کرن، ئەو ژی قوربانییێن جگارکێشانێ د ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکیدا، ب تنێ سێ سەد و پێنجی هزار کەس سالانە دمرن، ئانکو هەر رۆژەکێ هزار جگارکێش دمرن، و پێنجی هزار ژ جگارکێشێن نەرێنی ئەوێن جگارا نەکێشن، بەلێ بابێن وان یان دایکێن وان یان هەڤالێن وان دکێشن، و سەرجەمێ وان کەسێن ب ئەگەرێ جگارکێشانێ د ئێك دەولەتدا دمرن ل رۆژئاڤای چوار سەد هزار کەسن، کو دبنە هزار کەس د ئێك رۆژدا یان پتر.

ئەو جگارێن ژ ئەمریکا دهێن یان ب قاچاخی جگارەکا گەلەکا بێخێرە، چونکی رێژا ژەهراوییان تێدا گەلەکا بلندە، دگەهیتە دەه جارکی، هەر ئەو پاکیتەیە، و ئەو نیشانا بازرگانییە، و هەر ئەو بهایە، و ئەو جگارا دهێتە هنارتن بۆ رۆژهەلاتا ناڤین جگارەکا پلە دەهە.

ڤەکۆلینەك ل بریتانیا هاتە کرن ل سەر هەشتێ و سێ جگارکێشان، دویات کر هەر سێ کەس ژ دەه کەسان دێ گیانێ خۆ ژ دەست دەن ب ئەگەرێ وان نەخۆشییێن ژ جگارکێشانێ چێ دبن، و ئەوێن مایی دێ تووشی هندەك نەخۆشییێن دۆمدرێژ بن کو پەیوەندی ب جگارکێشانێڤە هەبیت.

و ژ لایێ وان زیانێن ژ سۆتنان پەیدا دبن، ب ئەگەرێ بەرمایکێن جگارا پترە ژ هەمی قازانجێ کۆمپانییان، و ئەو باجێن ب دەست خۆ دئێخن ژ ڤێ پیشەسازییێ.

و د وەلاتێ مە یێ جواندا، و ب دارستانێن باش و ژێ گرتی، کەسەکێ سەیرانچی پاشماوێ جگارا خۆ دهاڤێژیت دو سەد و پێنجی هکتار ژ دارستانێن کەسك سۆتن، ئەڤ هەمی خوسارەتییە ژ ئەگەرێ قورمکەکێ جگارێ بوو.

و هزرەك یا ل دەڤ هندەك جگارکێشان هەی، دبێژیت: ئەز زیانێ و خرابییێ ژ خۆ نابینم، ئەز دهێم و دچم و غار ددەم، و من ساخلەمییەکا باش یا هەی، و ئەز جگارا ژی دکێشم، ڤی راستییەکا مەترسی ژ بیرکر، ئەو ژی مەترسییێن جگارێ دکەڤنە سەرێك د لەشیدا بێی شوینوارێن وێ ئاشکەرا بن ب تنێ پشتی کرنا پشکنینێن هویر، مرۆڤ وەسا هزر دکەت یێ بێ نەخۆشییە، بەلێ شوینوارێن جگارکێشانێ دکەڤنە سەرێك، ل ڤێرە هێلەکا سۆر یا هەی، دەمێ ئەڤ کەڤتنە سەرێکە ژ هێلا سۆر بۆری ژ نیشکەکێڤە ئەڤ نیشانە ئاشکەرا دبن، و دبێژنە ڤێ چەندێ شکەستنا هێلا بەرگرییێ، هەر وەکی تو پێنج کیلۆیا دانییە د لایەکێ ترازییێدا، و د لایێ دیدا کیلۆیەکێ، و بکەیە دو کیلۆ، و بکەیە سێ و چار، و ئەڤ لایە دێ هەر یێ بلند بیت، بەلێ ژ نشکەکێڤە دەمێ ئەڤ لایێ بەرامبەر دبیتە پێنج کیلۆ دێ ئەڤ تایێ ترازییێ لڤیت، چ تشتی ئەو لڤاند؟

ئەڤ دانانا دویماهییێ، دویماهی گرام؟ نەخێر ئەوا لڤاندی کەڤتنا سەرێکا پەرێ بوو، زێدەباری ئەڤ گرانییا دویماهییێ، ئەوا پشتا حێشترێ شکاندی.

ئێك ژ زانایێن بیانی دبێژیت: (کۆمپانییێن تویتنێ کۆمپانییێن کوشتنێنە، یان کۆمپانینە بازرگارنییێ ب مرنێ دکەن).

ب راستی زانایێن موسلمانان یێن بەرێ ژ بەر لاوازیا زانیارییێن وان ل سەر زیانێن جگارکێشانێ کەڤتینە د فەتوایێن هەڤدژدا، وەکی زانا ئیبن عابدین خودانێ (الحاشية في الفقه الحنفيّ)، ئەڤە بەرفرەهترین لێڤەگەرە د فیقهێ حەنەفیدا، دەربارەی جگارکێشانێ دبێژیت: (هندەك ژ وان حەرام دکەن، و هندەك ژی نەباش (مکروه) دکەن، و هندەك ژی دورست (حەلال) دکەن)، چونکی زیانێن وێ د ئاشکەرا نەبوون، و تشت د بنیاتدا دورستن، و ئەگەر زانایەکێ کەڤن جگارکێشان دورست کربیت، ژ ئەگەرێ گەلەك کێم زانیارییێن وینە ل سەر زیانێن وێ، و ئەگەر راستییەکا ڤەبرِ زانیبا دا ئەو ژ مە ب لەزتر بیت بۆ حەرامکرنا وێ.

و پشتی مە ئەڤ چەندییا مەزن ژ مەترسییێن جگارکێشانێ نیشان دای، چ دەلیڤە ب هەمیڤە نینە ل سەر دورستکرنا کێشانا جگارێ، چونکی پێغەمبەر ﷺ خودێ یێ هنارتی دلۆڤانییەك بۆ گشت جیهانان، دا تشتێن پاقژ بۆ وان حەلال بکەت، و یێن پیس ل سەر وان حەرام بکەت.

ئەرێ کەسەکێ ب عاقل هەیە دەمێ جگارێ دکێشیت، و بەری بکێشیت بێژیت: (بسم الله الرحمن الرحيم)، و پشتی کێشانی بێژیت: (الحمد لله)، یا خودێ تو ڤێ ڤەنجییێ د ناڤ مەدا زێدەکەی؟! ئەڤە مەحالە، ل ڤێرە ئەڤە بەلگەیەکێ (فطري)یە ل سەر هندێ کو جگارە یا پیسە، خودێ دبێژیت: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [الأعراف:١٥٧]، (ئانکو: ئەوێت ل دویڤ هنارتی و پێغەمبەرێ نەخواندەوار دچن، ئەوێ سالۆخەت و نیشانێت

وی ل دەڤ خۆ د تەورات و ئنجیلێدا دبینن، فەرمانا وان ب قەنجییێ دکەت، و وان ژ خرابییێ ددەتە پاش، و تشتێ پاقژ بۆ وان دورست دکەت، و تشتێ پیس ل سەر وان حەرام دکەت، و بارێ وان یێ گران ل سەر وان ڕادکەت، و قەیدێت وان خۆ پێ گرێدایی ل سەر وان ڕادکەت (ئانکو: وی بارێ وان، ژ وان ئەحکامێت وان خۆ پێ گرێدایی ژ نەدورستکرنا هندەك خوارنان و ژێڤەکرنا جهێ پیس ژ جلکێ وان و سۆتنا دەستکەڤتییان (الغنائم)... هتد، سڤك کر)، ڤێجا ئەوێت باوەری پێ ئینایین، و ڕێز لێ گرتین، و هاریکارییا وی ل سەر نەیاران کری، و ب دویڤ وێ ڕۆناهییێ کەڤتین ئەوا د گەل وی هاتی (کو قورئانە)، ئەڤە ئەون یێت سەرفەراز).

خودایێ مە دبێژیت: (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) [البقرة:١٩٥]، (ئانکو: د ڕێکا خودێدا (د جیهادێدا) مالێ خۆ بمەزێخن، و خۆ ب دەستێت خۆ نەهاڤێژنە د مالوێرانییێدا (خۆ د هیلاك نەبەن)، و قەنجییێ بکەن، ب ڕاستی خودێ حەژ قەنجیکاران دکەت).

و خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا) [النساء:٢٩]، (ئانکو: گەلی خودان باوەران مالێ خۆ (ئێکدو) د ناڤبەرا خۆدا ب نەهەقی نەخۆن (وەکی سەلەفێ و قومارێ و زەبتکرنێ (احتکار) و دزییێ... هتد)، بازرگانییەکا هوین ل سەر قایل نەبن تێ نەبیت (ئانکو ب کڕین و فرۆتنان هەردو ئالییێت قایل بخۆن و ب ڕێکێت دورست) و خۆ (ژ بێ هیڤیبوونێ) نەکوژن یان ئێکدو نەکوژن ب ڕاستی خودێ د گەل هەوە یێ دلۆڤانە).

و ئیسلامێ خۆکوشتن حەرامکرییە، خۆکشتنا هەی یا ب لەزە، وەکی دەمێ کەسەك ب کێرکێ خۆ ل جهەکی کوژەك دکوژیت، ئەڤە خۆکوشتنەکا ب لەزە، و خۆکوشتنا هێدی دەمێ جگارا بکێشیت.

و ژار ئەبی هورەیرە ﷺ ژار پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((مَنْ تردّى مِنْ جبَلٍ فقَتَلَ نَفْسَهُ، فهُوَ فِي نَارِ جهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِداً فِيهَا أبَداً، وَمَنْ تحَسَّى سُمّاً فقَتَلَ نَفْسَهُ، فسُمُّهُ

فِي يَدِهِ يَتحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ، فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً))[1]، (ئانكو: يێ خۆ د كەڤرەكيدا باڤێژيت و خۆ بكوژيت، ئەو هەتا هەتا يێ د ئاگرێ دۆژەهێدا و بەردەوام خۆ د وى كەڤريدا دهاڤێت، و يێ ژەهرێ ڤەخۆت و خۆ بكوژيت، د دۆژەهێدا ژەهرا وى دێ د دەستيدا بيت و هەر ڤەخۆت و ئەو هەتا هەتا دێ د دۆژەهێدا بيت، و يێ خۆ ب ئاسنەكى بكوژيت، د دۆژەهێدا ئاسنێ وى دێ د دەستيدا بيت هەر كەتە د زكێ خۆڕا و هەروهەر د دۆژەهێدا بيت).

پێغەمبەرى ﷺ دانەپاشا (نەهيا) ژ هەمى تشتێن سەرخۆشكەر و بێهۆشكەر يا كرى، زار ئوم سەلەمە دبێژت: ((نَهَى رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ كُلِّ مُسْكِرٍ وَمُفْتِرٍ))[2]، (ئانكو: پێغەمبەرى ﷺ نەهى يا ژ هەمى تشتێن سەرخۆشكەر و بێهۆشكەر كرى).

ئەگەر مرۆڤێ هەژار جگارەكێشان ئەو يێ ساويلكەيە (گێل)، و ئەگەر مرۆڤێ زەنگين كێشان يێ دەست دڕيايە، خودێ دبێژيت: ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُوراً﴾ [الإسراء:٢٧]، (ئانكو: ب راستى يێت دەستدڕيايى برايێت شەيتانينە، و شەيتان د نيعمەتێت خودايێ خۆدا يێ چاڤنق بوو (و براينييا وان د ڤێرێدايە شەيتانى شوكور و سوپاسييا نيعمەتا خودێ نەكر، ئەڤە ژى وەختێ مالێ خۆ د گوهدارييا خودێدا نەمەزێخن، ئەڤە وان سوپاسييا خودێ نەكر، و ئەو و شەيتان بوونە برايێت ئێك)).

ئەگەر ئەو عەردێن بەرفرەهـ يێن ب كار دئينن بۆ چاندنا تويتنێ هاتبوونە ب كارئينان بۆ چاندنا فێقى و زەرزەواتى دا خێر و بەرفرەهى پەيدا بيت، و دا داهات زێدە بيت، و دا ساخلەمييا خەلكى ساخلەم بيت، و دا ئەم د كاودانەكيدا بين نەوەكى كاودانێ نوكە.

(١) بوخارى (٥٤٤٢)، و موسلم (١٠٩)، و ترمزى (٢٠٤٣)، و ژ بلى وان ژى.

(٢) ئيمام ئەحمەد (٢٦٦٧٦)، و ئەبو داوود (٣٦٨٦).

مەزنە زانایێن دەولەتا عوسمانی فەتوایەك دەرئێخست بۆ حەرامكرنا جگاركێشانێ، ئەو ژی ئیبراهیم ئەللەقانی، و شێخ سالم سنبووری، و مفتییێ شاهنشینا عەرەبییا سعوودی، شێخ بەدرەدین حوسنی، شێخ شام، و شێخ عەلی دەقر، و شێخ موحەممەد حامد.

و شێخێ ئەزهەرێ، شێخ جاد الحق ـ دلۆڤانییا خودێ لێ بیت ـ فەتوایەك دەرئێخست ئەڤە دەقێ وێیە: (تشتەکێ رۆهن و ئاشکەرایە کو کێشانا جگارێ، ب جۆرێن خۆ یێن جودا جوداڤە، و رێکێن ب کارئینانا وێ، گەلەك زیانێ دگەهینیتە مرۆڤی، چ زوی بگەهینیتێ یان درەنگ، ژ مرۆڤی ب خۆ، و مالێ وی، و گەلەك نەخۆشییان دگەهینیتێ، و جۆرە و جۆر، و د دویڤدا کارئینانا وێ حەرامە، ل دویڤ وان دەقێن بەری نوکە هاتین، و پاشی ژ ڤێ چەندێ نەیا دورستە کارئینانا وێ بۆ موسلمانی ب چ شێوەکی ژ شێوەیان، وەك پاراستنەك ل سەر نەفسان، و مالی، و هشیارییەکا زۆر ل سەر خۆدانەپاشا زیانان، کو نوژدارییێ دورستبوونا وان زیانان دیار کرینە).

ئەڤ راستییێن زانستی یێن هاتینە بەحسکرن هەمی یێن هاتینە وەرگرتن ژ رێکخراوێن ساخلەمییا جیهانی، یان ژ زانکۆیێن گەلەك پێشکەڤتی، یان ژ ڤەکۆلینێن پێشکەڤتی، و ئەڤەیە راستی.

دیاردەکا نوی یا هەی، ئەو ژی نەخۆشییێن دلی و لۆلەیێن خوینێ، و نەخۆشییێن خوینێ، ل دەستپێکا ژییێ شێت سالییێ و سەردا دیار دبن، ئەڤ ژییە هاتە خوار و ل کێمییێ دا، نوکە گەلەك کاودانێن هەین د ژییێ سیه سالییێدا، و بیست و پێنجێ، و بیست و دووێ، مرنەکە ژ ئەگەرێ جگارکێشانێ، ئەڤە دیاردەکا نوییە بەری نوکە نەبوو.

سەرەکییێن ژیانێ سێنە، ئێکەم هیدایەتە، و یا دووێ ساخلەمییە، و یا سێیێ (کفایە)، (کفایە) چو رامان نینە بێی ساخلەمی، و ساخلەمییێ چو رامان نینە بێی هیدایەت، ژ بەر کو ساخلەمی لایەکێ سەرەکییە د ژیانا باوەرداریدا، چونکی ب وێ (ساخلەمی)یێ جێنشینا وی د عەردیدا ب جه دئێت، و ب وێ ئەو ئارمانجا ئەو ژ بەر وێ هاتییە چێ کرن جێبەجێ دبیت، و ب وێ ئەو ب هیدایەتێ بەختەوەر دبیت، و خۆشییێ ب مالی

**دبەت، و ئەگەر ل دەڤ وی هاتە سەلماندن كو جگارکێشان دێ ساخلەمییا وی پویچ کەت نەیا بەرعاقلە ئەو جگارەکا ب تنێ ژی بکێشیت.**

**خودێ دبێژیت: (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ) [الأعراف:١٥٧].**

**خودێ تشتێن پاقژ بۆ مە یێن حەلال کرین، و یێن پیس و خراب ل سەر مە حەرام کرینە، و پێدڤییە ل سەر باوەردارێ راستەقینە بزانیت کا چ تشت مفایی دگەهینیتێ، و چ تشت زیانێ، و ژییێ خۆ یێ ب بها بزانیت، و چاوا پێدڤییە ببۆرینیت، و پێغەمبەری ﷺ نەهیا مە یا کری ژ هەر تشتەکێ زیانێ دگەهینیتە مە، وەکی خودێ باوەری ل بەر دلێ مە شرین کر، و د دلێن مەدا خەملاندی، و گاوری و ڤارێبوون (ب رێکا کرنا گونەهێن مەزن) و گونەهـ ل بەر مە رەش کری، و دەمێ مرۆڤ بێ فەرمانییا خودایێ خۆ دکەت دکەڤیتە د گاودانێن مەترسیدا زیانێ دگەهینیتە ژیانا وی، و زیانێ دگەهینیتە ئاخرەتا وی.**

# زیانێن جگارەکێشانێ ل سەر دلی و خوینبەران

ب راستی خودایێ مە (جل جلاله) وەك رێزگرتنەك بۆ ڤی مرۆڤی کۆمەکا کۆئەندامان کرینە د لەشێ ویدا، دا هاریکارییا وی بکەن ل سەر بەرسینگگرتنا مەترسییان، ئەگەر مرۆڤەك د جهەکیڕا بچیت، و مارەك دیت، دێ چ روی دەت؟ ئەڤا ل خوارێ دێ روی دەت:

دیمەنێ ماری دێ وێنەبیت ل سەر تۆرا چاڤێ وی، و ئەڤە هەستپێکرنە، هەسپێکرنا دیتنێ، و ئەو دیمەنێ ماری یێ ل سەر تۆرا چاڤی دێ هێتە ڤەگوهاستن بۆ ناڤەندا پێزانینێ د مێشکیدا، و مێشکی تێگەهێن تێدا هەین ئەڤە ژی یێن هاتین د ماوێ تاقیکرنێ و فێربوونێ دزانیت کو ئەڤ مارە یێ مەترسییە ل سەر ژیانا وی، ل ڤێرە ئەو یێ هەمبەری مەترسییەکێ، هۆشدارییێ ددەتە مێشکی ـ ئەو سەرێ کۆئەندامێ دەمارییە ـ ب شێوازێن ئالۆز پشکا سیماپاساوی ژ کۆئەندامێ دەماری یێ خۆیەتی، و ناڤکا ئەدرینالی دێ ئێکسەر فەرمانێ لێ کەت.

فەرمانا ئێکێ: دێ فەرمانەکێ هنێریت بۆ هەمی لۆلەیێن خوینێ دا تەنگ ببن، بۆ پاراستن ل سەر خوینێ، کو پێدڤییە ڤی کاری د ماسۆلکاندا بکەت نە د پیستیدا، چونکی ئەڤ کارە یێ مەترسییە، ژ بەر ڤێ چەندێ هەمی لۆلەیێن خوینێ تەنگ دبن، و رەنگێ زەرێ وی ئاماژەکە بۆ ڤێ تەنگبوونا لۆلەیێن خوینێ د لەشیدا.

و دێ فەرمانەکا دی هێت بۆ دلی دێ لێدانێن وی زێدە کەت، و لێدانێن دلی د کاودانێن ئاساییدا هەشتێ لێدانن، بەلێ دەمێ کاودانەکێ ب ترس دورست دبیت لێدان دگەهنە سەد و هەشتێیان دا بەرسینگگرتنا مەترسییێ بکەت، و دێ ب لەز خوین هێتە هنارتن بۆ ماسۆلکان.

و فەرمانەکا دی یا سێیێ دێ هێت بۆ هەردو سیهان کو تێکچۆنا زێدە بکەت، و ل ڤێرە دێ بینی ئەڤ کەسێ ترسیای دێ حلکەحلکێ کەت (یلهث).

و فەرمانەكا دی یا چوارێ بۆ مێلاكێ دێ چیت كو چەندییەكا شەكرێ باڤێژیتە د ناڤ خوینێدا كو بەرسینگگرتنا مەترسیێ بكەت.
و فەرمانەكا دی بۆ پەركێن خوینێیە، كو خودێ چێ كرینە دا هەر ڤالاتییەك و لاوازییەكێ تژی بكەن، یان هەر سەرپێچییەكا د خوینبەراندا هەی ئەگەر مرۆڤ تووشی بریندارببوونەكێ بوو، دێ هژمارا وان (پەركێن خوینێ) د خوینێدا زێدە بن.
ئەڤە كارەكێ سروشتییە، دەمێ مرۆڤ تووشی مەترسییەكێ دبیت لێدانێن دلێ وی ب لەزتر دكەڤن، و هەردو سیهێن وی ب لەزتر خۆ دقوتن، و دێ رەنگێ وی زەر بیت ژ بەر تەنگبوونا لۆلەییێن رەخا، و دێ رێژا شەكرێ د ناڤ خوینێدا زێدە بیت، و دێ پەركێن خوینێ یێن ئامادەكری زێدە بن دا هەر ڤەكرنەكا تەنگاڤی بگرن.
جگارە چ ل مرۆڤی دكەت؟ د جگارێدا كەرستەكێ ژەهراوی یێ هەی، دبێژنێ نیكۆتین، ئەڤ كەرستە دەرهاڤێژتنا ئەدرینالین زێدە دكەت، و ئەدرینالییە لێدانێن دلی زێدە دكەت، و خوینبەران تەنگ دكەت، ژ بەر ڤێ چەندێ رەنگێ جگاركێشان زەر دیار دكەت.
مەترسی ل كیرێیە؟ مەترسی ئەوە ئەڤ تەنگییا بەردەوام د خوینبەراندا چێ دبیت ببیتە ئەگەرێ گرتنا خوینبەرێن دلی، دێ نەخۆشییا دلی چێ بیت، یان جەلتە، ئان دێ بیتە ئەگەرێ گرتنەكێ د خوینبەرێن مێشكیدا، دێ بیتە جەلتا مێشكی، یان دێ بیتە ئەگەرێ گرتنەكێ د خوینبەرێن هەردو لنگاندا، دێ (غرغرین) دورست بیت، و ل ڤی دەمی پێدڤی دكەت كو لنگ بهێتە بڕین.
ئەڤ مەترسییە ـ مەترسییا جگاركێشانێ ـ یا ڤەشارتییە د هندێدا كو لۆلەییێن خوینێ بمینن د كاودانەكێ نەرەحەتی و تەنگبوونێدا، تەنگبوونا خوینهێنەر و خوینبەران چ دكەن؟ فشارێ بلند دكەن، ئەڤ تشتە یێن بووینە تشتێن ڤەبڕ (بێ گۆمان)، ژ بەر ڤێ چەندێ هەمی ئەو كۆمپانییێن جگاران چێ دكەن ل سەرانسەری هەمی جیهانێ د پێگیرن ڤێ هشیاركرنێ ل سەر پاكیتا جگاران بنڤێسن: (جگارە دبیتە ئەگەرێ زیانێن مەزن بۆ دلی، و لۆلەییێن خوینێ).

تەپكێن سۆرێن خوينێ خەنايا خوينێ يا د ناڤدا، كو ئۆكسجينى هەلدگريت ژ هەردو سيهان، و دەردكەتە د ناڤ خانەياندا، دا كەرستێن شەكرێ بسۆژيت، دێ بيتە وزە بۆ مرۆڤى.

خەنايا خوينا جگاركێشى د گەل يەكى ئۆكسيدێ كاربۆنى هەڤ دگريت ئەوا ژ جگاركێشانێ چێ بووى، دێ خەنايا تەپكان ژ كار كەڤيت بۆ ڤەگوهاستنا ئۆكسجينى، و دەمێ رێژا جگاركێشانێ بلند بوو، دێ بيتە سێكا تەپكێن سۆر، يان خەنايا خوينێ سێكا وێ دێ يا ژ كاركەڤتى بيت ژ ڤەگوهاستنا ئۆكسجينى ژ هەردو سيهان بۆ خانەيان، ئەڤەيە شوينوارێ دووێ ژ شوينوارێن جگاركێشانێ د دلى و خوينبەر و خوينهێنەراندا.

ل سالێن پێنجياندا يا كێم بوو مرۆڤ تووشى نەخۆشييەكێ ببيت د لۆلەيێن وى يێن خوينێدا، بەرى ژيێ پێنجى سالييێدا، و نوكە گەلەك مرۆڤ د ژيێ چل سالييێدا تووش دبنێ، و نويترين راپۆرتا گرێدايى ب ڤى بابەتيڤە، گەلەك حالەتێن هەين مرۆڤ تووشى نەخۆشييێن دلى و لۆلەيان دبيت د ژيێ بيست و پێنج سالييێدا ژ ئەگەرێ جگاركێشانێ.

پەيڤەكا دى د ڤێ راپۆرتێدا، ئەڤ ڤەكۆلينە دبێژيت: هەشتێ ژ سەدێ نەخۆشێن دلى ژ جگاركێشانە.

كارگەهێن جگاران تويتنێ (جگاران) ددانىە جهێن باش گرتيدا (پاكيتە) پاشى تاما شەربەتا ترى، يان يا سێڤا دهاڤێژنێ، يان هەر تشتەكێ ژ تامێن شەكرێ، پاشى دێ ترشاتييان كەنە سەر، پاشى دێ گرن، و دێ سێ سالان باش گرن، حەتا كەڤن دبن، و حەتا تويتن ب ترشاتييێ و كحولێ تێر دبيت (باش تێكەلى ئێك بن)، و ئەڤە رووەكێ تويتنێ دكەتە رويشالێن نەرم كو يا هاتييە نماندن د كحوليدا، دێ خەلك ئەوا د نماندنا مەيێدا دورست بووى كێشيت، و ئەو نوزانن، و ئەڤەيە وەل جگارێ دكەت كو حەتا دويماهييێ بمينيتە هەل؛ چونكى كحول يا تێكەلى بەلگێن تويتنێ بوويى، و ئەڤەيە ئەوا ئاماژێ ب رستەكێ پێ ددەن: (وەرە ئەوا تام هەى)، د پێشانگەها ريكلاما جگارێدا.

ئەڤ راستییە د پەرتۆکەکێدا یا هەی پشتی نڤێسەرێ وێ سەرەدانەك بۆ کارگەهێن تویتنێ ل ئەمریکا کری.
تشتەکێ دی: ماکلاریم کەسایەتییەکێ گەلەکێ سەرنج راکێشە، کۆمپانییێن جگاران ب کار دئینن بۆ ریکلامکرنا جگاران، باراپتر ئەڤ کەسە جلکێن گاڤانێن چێلا ل بەر خۆ دکەت، و وان ئاخفتنا دبێژیت کو هاندانا خەلکی بکەت بۆ جگارکێشانێ، ڤی کەسی ژیانا خۆ ژ دەست دا هێژ ئەو د بهارا ژییێ خۆدا، تووشی پەنجەشێرەکێ دبیت د هەردو سیهاندا ژ ئەگەرێ جگارکێشانێ، و دویماهی پەیڤێن وی ئەو بوون: باوەر ژ من نەکەن، جگارکێشانێ ئەز کوشتم، و ئەز بەلگەمە ل سەر ڤێ چەندێ، و من درەو ل هەوە دکرن.
ژ نیشانێن باوەرداری ئەوە بها و قەدرێ خۆ دزانیت، و بهایێ ژیانێ دزانیت، و بهایێ ساخلەمییێ دزانیت، ئەڤ ساخلەمییە رێکا وییە بۆ ئاخرەتێ، ئەڤ ساخلەمییە و هەر تشتێ تێدا پرەکە بۆ بەحەشتێ، ژ بەر ڤێ چەندێ پێدڤییە مرۆڤ بزاڤەکا رژدا ب لەز بکەت بۆ پاراستنا ساخلەمییا خۆ، چونکی ساخلەمی سەرێ مالێ مرۆڤییە، و خودێ دبێژیت: ﴿وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ [البقرة:١٩٥]، (ئانکو: خۆ ب دەستێت خۆ نەهاڤێژنە د مالوێرانییێدا (خۆ د هیلاك نەبەن)).
یەکی ئۆکسیدێ کاربۆنی ئەوا ژ ئەنجامێ جگارکێشانێ چێ دبیت هاریکارە بۆ ڤەمانا کۆلیسترۆلی ب دیوارێن خوینبەر وخوینهێنەرانڤە، و ڤەمانا کۆلیسترۆلی ب دیوارێن خوینبەر و خوینهێنەرانڤە ئەڤانە تەنگ دکەت، و فشارێ بلند دکەت، و دلی تووشی وەستانێ دکەت.
تشتەکێ دی: تووشبوونا جگارکێشان ب نەخۆشییێن دلی و خوینبەران، پازدە جارکی پترە ژ نەجگارکێشان، چێ دبیت ئێك بێژیت: ئەرێ نەجگارکێش تووش نابنێ؟ بەلێ تووش دبنێ، بەلێ تووشبوون ل دەڤ جگارکێشان پازدە جارکی پترە ژ نەجگارکێشان.
مە ئەڤ راستییە ئینان دا دانینە بەر دەستێن برایێن خواندەڤان ئەوێن جگارا دکێشن، چونکی ئایین شیرەتکرنە.

# جگارکێشانا نەرێنی

جگارکێشانا نەرینێ ئەوە دەمێ مرۆڤ تووشی جگارێن کەسانێن دی دبیت د جهێن گرتی و فەرەبالغدا، و کاریگەریا کادیا جگاران بۆ نەجگارکێشان پترە بۆ جگارکێشان ب خۆ، و ڤەکۆلینەکا زانستی دیار کرییە کو ژ لایێ کۆمەکا زانایانڤە هات بوو کرن کو جگارکێشان رێژا کۆلیسترۆلی د ناڤ خوینا نەجگارکێشیدا زێدە دکەت، و ئەڤە دبیتە ئەگەرێ تووشبوونا وی ب نەخۆشییێن دلی، و پەنجەشێرا پیستی، و گەورییێ، و ژ بلی وان نەخۆشییێن گرێدایی ب جگارکێشانێڤە، و ل سە ئاستێ ژنێن دوگیان جگارکێشان گەلەك زیانێ دگەهیننە وان، حەتا نەجگارکێش ژی بن، و دەمێ زەلام هەمبەر هەڤژینا خۆ یا ب دوگیان جگارا دکێشیت پێدڤییە مەترسییا وێ بزانیت.

ئەڤ ڤەکۆلینە دبێژیت: و ل سەر ئاستێ ژنێن دوگیان جگارکێشان گەلەك زیانێ دگەهیننە وان، حەتا ژ جگارکێشان ژی نەبن، چونکی کەرستێ نیکۆتینی بۆ کۆرپەلەی دچیت د رەحمێ دایکێدا، و ئەگەر ژنەکا نەجگارکێش تووشی کادیا جگارێ بوو بۆ ماوێ سێ دەمژمێران رۆژانە (إحتمال)ا تووشبوونا کۆرپەلەیێ وێ د کێماسییێن ئاخفتنێ یان بیرییێ زێدە دبن.

و ئەگەر ژنا دوگیان یا جگارکێش بیت ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەرێ بوونا زارۆکەکێ کێم کێشە، یان بوونا بەری ژڤانێ وی یێ سروشتی، زێدەباری ئارێشێن د گەشەبوونا عەقلیدا، و جگارکێشان نە ب تنێ کارتێکرنێ د کۆرپەلەیێ ژنا جگارکێشدا دکەت، یان تووشی کادیا جگارێن کەسانێن دی ببیت، بەلکو ئەڤ کارتێکرنە بۆ نەڤییێن وێ ژی دێ چیت، چونکی دەمێ ژنەکێ زارۆکەك دبیت ئەڤ زارۆکە دێ مەترسییێن جگارکێشانێ ڤەگوهێزیت بۆ نفشێ دویڤدا، زێدەباری کارتێکرنا جۆتینییا (خصوبة) نەڤییان.

ئاخفتنا ئەڤرۆ ل سەر نەجگارکێشان، ژن و زەلام و زارۆکان، بەلێ تووشی کادیا جگارکێشان دبن، ئەڤ ئەنجامێن خراب هندەك ڤەکۆلینێن زانستی ئاشکەرا کرینە.

خودێ دبێژیت: (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ) [الأعراف: ١٥٧].

ئەگەر هاتە سەلماندن ب بەلگەیێ دورستێ زانستی، و ڤەکۆلینا بابەتی کو جگارکێشان ژ تشتێن پیسە ئەو ب بەر ڤێ ئایەتێ دکەڤیت.

# ليستا ژێدەر و لێڤەگەڕان


١- القرآن الكريم (**تەفسيرا ژيان**).

٢- تفسيرالطبري، دار الفكر، بيروت، ١٤٠٥هـ.

٣- تفسير ابن كثير، دار الفكر، بيروت، ١٤٠١ هـ.

٤- تفسير القرطبي، دار الشعب، القاهرة، ط٢، تحقيق أحمد عبدالحليم البردوني.

٥- تفسير الجلالين، جلال الدين السيوطي، جلال الدين المحلي، دار الحديث، القاهرة، ط.١

٦- صحيح البخاري، دار ابن كثير، اليمامة، بيروت، ١٤٠٧هـ، ١٩٨٧م، ط٣، تحقيق د. مصطفى ديب البغا.

٧- صحيح مسلم، دار إحياء التراث العربي، تحقيق فؤاد عبد الباقي.

٨- سنن الترمذي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق أحمد محمد شاكر، وآخرين.

٩- سنن أبي داود، دار الفكر، بيروت، تحقيق محمد محيى الدين عبد الحميد.

١٠- سنن ابن ماجه، دار الفكر، بيروت، تحقيق فؤاد عبدالباقي.

١١- سنن النسائي الكبرى، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١هـ / ١٩٩١م، تحقيق عبد الغفار سليمان البنداري، سيد كسروي حسن.

١٢- مسند الإمام أحمد، مؤسسة قرطبة، مصر.

١٣- موطأ الإمام مالك، دار إحياء التراث العربي، تحقيق محمد فؤاد عبد الباقي.

١٤- سنن الدارمي، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٧هـ، تحقيق فواز أحمد زمرلي، خالد السبع العلمي.

١٥- مصنف عبد الرزاق، الكتب الإسلامي، بيروت، ١٤٠٣هـ، ط٢، خبيب الرحمن الأعظمي.

١٦- مصنف ابن أبي شيبة، مكتبة الرشد، الرياض، ١٤٠٩هـ ط١، كمال يوسف الحوت.

١٧- صحيح ابن حبان، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٢، ١٤١٤هـ/١٩٩٣م، تحقيق شعيب الأرناؤوط.

١٨- صحيح ابن خزيمة، المكتب الإسلامي، بيروت، ١٣٩٠هـ، ١٩٧٠م، تحقيق: محمد مصطفى الأعظمي.

١٩- المعجم الكبير، الطبراني، مكتبة العلوم والحكم، الموصل ١٤٠٤هـ/١٩٨٣م، ط٢، تحقيق: حمدي السّلفي.

٢٠- المستدرك على الصحيحين، الحاكم، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١هـ، ١٩٩٠م، تحقيق عبد القادر عطا.

٢١- شعب الإيمان، البيهقي، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٠هـ، ط١، تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول.

٢٢- مسند الشهاب، القضاعي، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٧هـ/١٩٨٦م، ط٢، تحقيق: حمدي السّلفي.

٢٣- الجامع الصغير، السيوطي، دار طائر العلم، جدة، تحقيق: عبد الرؤوف المناوي.

٢٤- كشف الخفاء، العجلوني، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٥هـ، ط٤، تحقيق: أحمد القلاش.

٢٥- الزهد عبد الله بن المبارك، دار الكتب العلمية، بيروت، تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي.

٢٦- أسنى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب، محمد السيد درويش الحوت، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٣هـ، تحقيق: خليل الميس.

٢٧- الفردوس بمأثور الخطاب، الديلمي الهمذاني، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٦، ط١، تحقيق السعيد بن بسيوني زغلول.

٢٨- علل الدارقطني، دار طيبة، الرياض، ١٤٠٥هـ/١٩٨٥م، ط١، تحقيق محفوظ الرحمن زين الله.

٢٩- تلخيص الحبير، ابن حجر، المدينة المنورة، ١٣٨٤هـ/١٩٦٤م، تحقيق: السيد عبد الله هاشم اليماني المدني.

٣٠- فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ابن حجر، دار المعرفة، بيروت، تحقيق فؤاد عبد الباقي، محب الدين الخطيب، ١٣٧٩هـ.

٣١- شرح صحيح مسلم، النووي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ١٣٩٢هـ.

٣٢- شرح معاني الآثار، الطحاوي، دار الكتب العلمية، بيروت ١٣٩٩هـ، ط١، تحقيق محمد زهري النجار.

٣٣- السيرة النبوية، ابن هشام، دار الجيل، بيروت، ١٤١١هـ، ط١، تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول.

٣٤- الطب النبوي، ابن القيم، دار الفكر، بيروت، تحقيق: عبد الغني عبد الخالق.

٣٥- زاد المعاد، ابن القيم، مؤسسة الراسالة - مكتبة المنار الإسلامية، بيروت - الكويت، ١٤٠٧هـ/١٩٨٦م، ط١٤، تحقيق: شعيب الأرناؤوط - عبد القادر الأرناؤوط.

٣٦- لسان العرب، ابن منظور، دار صادر، بيروت - لبنان، ط١، ١٩٩٧م.

٣٧- مجمع الزوائد، أبو بكر الهيثمي، دار الريان للتراث، دار الكتاب العربي، القاهرة، بيروت١٤٠٧هـ.

٣٨- شرح العمدة، ابن تيمية، مكتبة العبيكان، الرياض، ١٤١٣هـ، تحقيق: د. سعود صالح العطيشان.

٣٩- بدائع الفوائد، ابن قيم الجوزية، مكتبة نزار مصطفى الباز، مكة المكرمة، ١٤١٦هـ/١٩٩٦م، تحقيق: عبد العزيز عطا، عادل عبد الحميد العدوي.

٤٠- المستطرف في كل فن مستظرف، أبو الفتح الأبشيهي، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٦م، ط ٢، تحقيق: د. مفيد محمد قميحة.

٤١- القاموس المحيط، الفيروزآبادي.

٤٢ - مختار الصحاح، الرازي، دار العلوم، تحقيق: د. مصطفى البغا.

٤٣- موسوعة النباتات المفيدة، فريد بابا عيسى، دار عكرمة، دمشق، ٢٠٠٢م.

٤٤- روائع الطب الإسلامي، القسم العلاجي، الجزء الأول ، دار المعاجم، ط١، ١٤١٥هـ/١٩٩٤م.

٤٥- الأنوار في شمائل النبي المختار، الحسين بن مسعود البغوي، تحقيق: إبراهيم اليعقوبي، دار المكتبي، الطبعة الثانية، ١٩٩٩م.

٤٦- الطب الوقائي بين العلم والدين، د. نضال عيسى، دار المكتبي، الطبعة الأولى، ١٩٩٧م.

٤٧- أساسيات علم المفاصل، أنس القطيفاني – دانة الفقير، جامعة دمشق، ١٩٩٩م.

٤٨- إعجاز القرآن في العلوم الجغرافية، محمد مختار عرفات، دار إقرأ، ط١، ٢٠٠٣م.

٤٩- اعرف جسدك، سلسلة الثقافة العامة، ترجمة العقيد ماجد العظمة، سلسلة الثقافة العامة.

٥٠- اعرف نفسك، د. فاخر عاقل، دار العلم للملايين، ط٣، ١٩٧٤م.

٥١- الأسودان التمر والماء، د. حسان شمسي باشا، دار المنارة (السعودية) ط١، ١٩٩٢م.

٥٢- الأمراض الشائعة، د. محيي الدين طالو العلبي، دار ابن كثير، ط١، ١٩٨٩م.

٥٣- الأمراض النفسية وعوامل الشد إلى الخلف، د. مأمون حموش، دار المأمون، ط١، ٢٠٠٣م.

٥٤- الإنسان بين العلم والدين، شوقي أبو خليل، دار الفكر، ط٥، ١٩٨٩م.

٥٥- الأنسان ومعجزة الحياة، د. خلوق نور باقي، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٩٩٨م، ترجمة أورخان محمد علي.

٥٦- الإيدز والأمراض الجنسية، د. محيي الدين طالو العلبي، دار ابن كثير، ط١، ١٩٨٨م.

٥٧- الإيدز وباء العصر، د. محمد علي البار – د. محمد أيمن صافي، دار المنارة، ط١، ١٩٨٧م.

٥٨- الأسرار الطبية الحديثة في السمك والحوت، د. حسان شمسي باشا، دار المنارة (السعودية)، ط١، ١٩٩١م.

٥٩- الانفجار الكبير أو مولد الكون، أميد شمشك، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٩٩٨م، ترجمة أورخان محمد علي.

٦٠- البدانة والسمنة، د. حلمي رياض جيد، دار المعارف، ١٩٦٩م.

٦١- التغذية والنمو، د. محمد غسان سلوم، جامعة دمشق، ط٤، ١٩٩٤م.

٦٢- الجديد في أمراض التدخين، د. نضال عيسى، دار المكتبي، ط١، ١٩٩٤م.

٦٣- الجنين المشوه والأمراض الوراثية، د. محمد علي البار، دار القلم – دار المنارة، ط١، ١٩٩١م.

٦٤- الحبة السوداء بين الدين والطب، د. عبد الرحمن النجار، دار العلوم القرآن، ط١، ١٩٩٢م.

٦٥- الختان بين الطب والشريعة، د. عبد الرحمن القادري، دار ابن النفيس، ط١، ١٩٩٦م.

٦٦- الخنزير بين ميزان الشرع ومنظار العلم، د. أحمد جواد، دار السلام (القاهرة)، ط١، ١٩٨٧م.

٦٧- الدخان أحكامه وأضراره، عبدالكريم محمد نصر، ١٩٩٦م.

٦٨- الدليل الطبي والفقهي للمريض في شهر الصيام، د. حسان شمسي باشا، دار السوادي (جدة).

٦٩- الدماغ بنيته ووظائفه، عمران المقداد، جامعة دمشق، ١٩٨٦م.

٧٠- الدين في مواجهة العلم، وحيد الدين خان، دار النفائس، ط٤، ١٩٨٧م، ترجمة ظفر الإسلام خان.

٧١- السجائر حلال أم حرام، د. عبد الصبور شاهين، الدار الذهبية.

٧٢- السواك في ميزان الصيدلة، علي الرغبان – فراس رزوق – مجاهد كرمان، دار فصلت، ط١، ١٩٩٧م.

٧٣- الشفاء بالحبة السوداء، فرح عبد الحميد القداحي، دار الإسراء (القاهرة)، ١٩٩٨م.

٧٤- الشمس والقمر بحسبان،.. أحمد عبد الجواد، دار هاشم الكتبي.

٧٥- الطب الإسلامي، محيي الدين طالو العلبي، ابن كثير، ط١، ١٩٩٢م.

٧٦- الطب المجرب، خالد سيد علي، مكتبة دار التراث (الكويت)، ط٥، ١٩٩٣م.

٧٧- الطب النبوي في ضوء العلم الحديث، د. غياث حسن الأحمد، دار المعجم، ط١، ١٩٩٥م.

٧٨- الطب النبوي والعلم الحديث، د. محمد ناظم النسيمي، الشركة المتحدة، ط١، ١٩٨٤م.

٧٩- الطب محراب الإيمان، د. خالص كنجو جلبي، مؤسسة الرسالة، ١٩٧١م.

٨٠- الطقس، أ. ج فور سدايك، معهد الإنماء العربي (بيروت)، ١٩٨١م، ترجمة نبيلة (هيلين) منسي.

٨١- العلاج بالنبات، وديع جبر، دار الجيل، ط١، ١٩٨٨م.

٨٢- العلم في حياة الإنسان، د. عبد الحليم منتصر، كتاب عربي، ١٩٨٤.

٨٣- العلم في منظوره الجديد، روبرت م. أغروس، سلسلة عالم المعرفة، عدد ١٣٤، ترجمة د. كمال خلايلي.

٨٤- العلم والدين مناهج ومفاهيم، د. أحمد عروة، دار الفكر، ط١، ١٩٨٧م.

٨٥- العلم يدعو إلى الإيمان، أكريسي موريسون، مكتبة النهضة المصرية، ط٣، ١٩٥٨م، ترجمة محمود صالح الفلكي.

٨٦- العلوم في القرآن، د. محمد جميل الحبال - د. مقداد مرعي الجواري، دار النفائس، ط١، ١٩٩٨م.

٨٧- الغذاء لا الدواء، د. صبري القباني، دار العلم للملايين، ط٣، ١٩٦٦م.

٨٨- الفيزياء المسلية، ياكوف بيريلمان، دار مير (موسكو)، ط٥، ١٩٧٧م، ترجمة د. سليمان المنير.

٨٩- القرآن وعلم النفس، د. عبد العلي الجسماني، العربية للعلوم، ط١، ١٩٩٩م.

٩٠- القرآن المكين، د. مأمون شقفة، دار حسان، ط٢، ١٩٨٧م.

٩١- الكوكب الوطن، كيفن دبليوكيلي، دار مير (موسكو).

٩٢- الكون وأحجار الفضاء، محمد فتحي عوض، دار الوثبة.

٩٣- الكون والأرض والإنسان في القرآن العظيم، رجا عبد الحميد عرابي، دار الخير، ط١، ١٩٩٤م.

٩٤- الله والعلم الحديث، عبد الرزاق نوفل، دار مصر للطباعة، ط.٢

٩٥- الله يتجلى في عصر العلم، نخبة من العلماء الأمريكيين، دار إحياء الكتب العربية، ترجمة د. الدمرداش عبد المجيد سرحان.

٩٦- الميلاتونين هل هو الدواء السحري، د. حسان شمسي باشا، دار المنارة (السعودية) ط١، ١٩٩٦م.

٩٧- النحلة تسبح الله، محمد حسن الحمصي، ط١، ١٩٧١م.

٩٨- النفس بين العلم والدين، محيي الدين مقري، مطبعة عكرمة، ط١، ١٩٩٦م.

٩٩- الوافي في تخطيط القلب الكهربائي، د. ضياء الدين الجماس - د. عبدالملك الكزبري، مكتبة الرازي ط١، ١٩٨٧م.

١٠٠- الوجيز في أمراض الكبد، ليلى محمد أديب المؤيد العظم - نهى أحمد كامل، جامعة دمشق، ١٩٩٨م.

١٠١- بدائع السماء، جيرالد هوكز، ترجمة: د. عبد الرحيم بدر، المكتبة العصرية (صيدا)، ١٩٦٧م.

١٠٢- تشريح وفيزيولوجيا الإنسان، فاسيلي تاتارينوف، دار مير (موسكو)، ١٩٨٣م.

١٠٣- جهاز التنفس، مجموعة من الأطباء، جامعة دمشق، ١٩٨٠م.

١٠٤- حرب النجوم، عاطف معتوق.

١٠٥- حركة الأرض ودورانها، محمد علي الصابوني، دار القلم، ط١، ١٩٩١م.

١٠٦- خلق الإنسان بين الطب والقرآن، محمد علي البار، الدار السعودية للنشر، ط٤، ١٩٨٣م.

١٠٧- دراسات حول الطب الوقائي، مجموعة من الأطباء، مجلة الكتاب العربي (١٧)، ١٩٨٧م.

١٠٨- دليل الأنفس بين القرآن الكريم والعلم الحديث، توفيق محمد عزالدين، دار السلام (القاهرة) ط١، ١٩٨٦م.

١٠٩- دليل العائلة الطبي، جان غوميز، دار الحوار، ط٢، ١٩٨٨م.

١١٠- دور الجراثيم في حياتك، ليو شنيدر، منشورات وزارة الثقافة، ١٩٨١م، ترجمة غسان مصري زادة.

١١١- رحلة الإيمان في جسم الإنسان، حامد أحمد حامد، دار القلم، ط١، ١٩٩١م.

١١٢- روائع الطب الإسلامي، د. محمد نزار الدقر، دار المعاجم، ط١، ١٩٩٥م.

١١٣- سبعون برهاناً علمياً، ابن خليفة، دار الإيمان، ط٣، ١٩٨٨م.

١١٤- شفاء التباريح والأدواء في حكم التشريح ونقل الأعضاء، الشيخ إبراهيم اليعقوبي، مطبعة خالد بن الوليد، ط١، ١٩٨٦م.

١١٥- طبيبك معك، د. صبري القباني، دار العلم للملايين، ط.٧

١١٦- طعامك سليماً وسقيماً، د. ضياء الدين الجماس، مركز نو الشام للكتاب، ١٩٩٩م.

١١٧- عظمة الرحمن في خلق الإنسان، علي الشيخ علي، جامعة دمشق، ١٩٧٧م.

١١٨- علم النفس الإسلامي، محمد رمضان القذافي، منشورات صحيفة الدعوة الإسلامية، ط١، ١٩٩٠م.

١١٩- غرائب مخلوقات الله، لطفي وحيد، المكتب الجامعي الحديث، ١٩٩٠م.

١٢٠- غريزة أم تقدير إلهي، شوقي أبو خليل، دار الفكر، ط٦، ١٩٨٧م.

١٢١- فيه شفاء للناس العسل، د. محمد نزار الدقر، دار الكتب العربية.

١٢٢- قصة العناصر، ألبير دوكروك، منشورات وزارة الثقافة، ١٩٨١م ، ترجمة وجيه السمان.

١٢٣- قصص وطرائف عن الفلزات، س. فينيتسكي، دار مير (موسكو)، ١٩٨٤م، ترجمة: عيسى مسوح.

١٢٤- كتاب المعرفة الحيوان، د. عبد النعم عبيد، شركة ترادكسيم.

١٢٥- كتاب المعرفة جسم الإنسان، د. عبد النعم عبيد، شركة ترادكسيم.

١٢٦- كتاب المعرفة النبات، د. عبد النعم عبيد، شركة ترادكسيم.

١٢٧- ما هي نظرية النسبية، لانداو ورومر، دار مير (موسكو) ط٤، ١٩٧٨م.

١٢٨- ماذا في العلم والطب من جديد، مجموعة من الأطباء، كتاب العربي (٢١).

١٢٩- مبادىء البيولوجيا، إرينا كروزينا، دار مير (موسكو)، ط٢، ١٩٨٢م.

١٣٠- مبادىء التشخيص في الطب الباطني، مجموعة من الأطباء، جامعة دمشق، ١٩٩٩م.

١٣١- مع الطب في القرآن الكريم، د. عبد الحميد دياب - د. أحمد قرقوز، مؤسسة علوم القرآن، ط١، ١٩٨٠م.

١٣٢- مع الله في السماء، د. أحمد زكي، دار الهلال (القاهرة).

١٣٣- معالجة التدخين بين الأطباء والمشرعين، د. ضياء الدين الجماس، دار ابن حيان.

١٣٤- معجزات الشفاء في الحبة السوداء والعسل والثوم والبصل، أبو الفداء محمد عزت محمد عرف، دار تهامة.

١٣٥- معجزات في الطب للنبي العربي (صلى الله عليه وسلم)، د. محمد سعيد السيوطي، مؤسسة الرسالة، ط٢، ١٩٨٦م.

١٣٦- مقدمة في علم الخلية والجنين، هاني رزق، جامعة دمشق، ١٩٨٦م.

١٣٧- من أسرار وإعجاز القرآن الكريم، محمد أديب النابلسي، مكتبة دار الصفا، ط١، ١٩٩٩م.

١٣٨- من علم الطب القرآني، عدنان الشريف، دار العلم للملايين، ط١، ١٩٩٠م.

١٣٩- من علم الفلك القرآني، عدنان الشريف، دار العلم للملايين، ط١، ١٩٩١م.

١٤٠- من علم النفس القرآني، عدنان شريف، دار العلم للملايين، ط١، ١٩٨٧م.

١٤١- موسوعة الشباب، مجموعة من المؤلفين، شركة ميدليفانت.

١٤٢- موسوعة بهجة المعرفة، الشركة العامة للنشر والتوزيع و الإعلان.

١٤٣- موسوعة لايف الأرض، آرثر بيزر، مؤسسة تايم، ترجمة: محمد جمال الدين الفندي.

١٤٤- موسوعة لايف البحر، ليونارد إنجيل، مؤسسة تايم، ترجمة: د. عزت خيري.

١٤٥- موسوعة لايف الكون، دافيد برجاميني، مؤسسة تايم، ١٩٧١م، ترجمة: نزيه الحكيم.

١٤٦- موسوعة لايف جسم الإنسان، آلان أ. نورس، مؤسسة تايم، ١٩٦٨م.

١٤٧- مولد طفل، روبرت لافون، شركة ترادكسيم، ١٩٧٧م، ترجمة: محمد نصر.

١٤٨- نحل العسل في القرآن والطب، د. محمد علي البني، مركز الأكرام، ط٢، ١٩٨٧م.

١٤٩- وفي الصلاة صحة ووقاية، د. فارس علوان، دار السلام (القاهرة)، ط١، ١٩٨٩.

١٥٠- معجزة القرآن، محمد متولي الشعراوي، المختار الإسلامي، مصر.

١٥١- التوحيد، عبد المجيد الزنداني، التراث الإسلامي، مصر.

١٥٢- الإعجاز الطبي في القرآن، السيد الجميلي، دار ومكتبة الهلال، مصر.

١٥٣- الإسلام ملاذ كل المجتمعات الإنسانية، محمد سعيد رمضان البوطي، دار الفكر، دمشق.

١٥٤- التمر دواء ليس فيه داء، محمد عبد الرحيم، دار أسامة بيروت.

١٥٥- تنبيه العقول الإسلامية لما في آيات القرآن من العلوم الكونية، ترجمة: عبد الرحمن عيسى، محمد نجيب المطيعي.

١٥٦- الإسلام والحقائق العلمية، محمود القاسم، دار الهجرة، مصر.

١٥٧- القرآن وعلوم العصر الحديثة، إبراهيم فواز عراجي، دار النهضة العربية، مصر.

١٥٨- الإسلام يتحدى، وحيد الدين خان، دار الجيل المسلم، مصر.

١٥٩- الطب محراب الإيمان، خالص جلبي، دار النفائس، بيروت.

“

بەرێخۆدانێن کویرن، و خرکریێن هویربینن؛ بۆ وان تشتێن د لەشێ مرۆڤیدا هەین ژ بەلگەیێن تمام ل سەر هندێ کو خودێ چێکەرێ ئێکانەیە،و هەبوویێ خودان شیانە، ئەڤە دکێشیتە باوەریبوونێ ب خودێ، و خواندەڤانی پال د دەت بۆ هزرکرنەکا کویر و نمۆنەیی. و دیسا ئەڤ پەرتۆکە دیارکرنە بۆ موعجیزەیێن خودایی د لەشێ مرۆڤیدا و پەیکەرێ وی، و ماسۆلکەیێن وی، و کۆئەندامێن وی یێن جورە و جور، و ئەڤ هەمییە دبنە نەخشەیەك بۆ زانستێن گەردوونی ژ لایێ دیتنا دورست یا ئایینی، راستییان دیار دکەت، و ب چاڤکێ دانەرێ پەرتۆکێ یێ شەهرەزا د سەلمینیت، و ڤەکۆلینا وی یا زانستی یا کویر، چونکی پەرتۆك وەسا دیار دکەت کو بەلگە و رۆهنکرنەکە بۆ بابەتێ موعجیزەیێن ئافرێنەرێ مەزن د ڤی بونەوەرێ ب رێزدا (مرۆڤ). و هێژای گۆتنێ یە کو دانەرێ پەرتۆکێ دویڤچۆنەکا باش د ڤەکۆلینا خۆدا کرییە، و هەمە ڕەنگی د ژێدەرێن خۆدا و بەرفرەهی د وەرگرتنا د لێڤەگەرێن خۆدا، و نڤیسایە - هەروەکی مە هەر جار ژێ دیتی - ب گیانێ ڤەکۆلەرەکێ کویر چۆیی و نڤیسەرەکێ دلسۆز، و زانایەکێ هویربین. و ئەو هەمییە ب شێوازەکێ سەرنجڕاکێش، کو پێزانینان نێزیکی خواندەڤانی دکەت، و بۆ وی ب سانەاهی دئێخیت؛ ب زمانەکێ زانستی یێ رەوان، کو شیانەکا زمانی یا مەزن دسەلمینیت.

”

Design: **Muhammed** Hussein